**باس و توێژینەوە بڵاوکـــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کـــوردی دەربـــڕی بیـــر و بۆچوونـــی توێژەرانـــن نەک دەستەی نووســـەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەسازی: عیسام موحسین.
- پیتچنین: بەشی کۆمپیوتەر
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
- چاپ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.
- تیراژ: ٥٠٠ دانە.

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی كوردی



### بەشی عەرەبی - القسم العربي



### بەشی ئینگلیزی

# ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوە
# لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

١- گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی، گۆڤارێكی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی كورد و كوردستان، بڵاودەكاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێكی دیكە بڵاو نەكرابێتەوە یان بۆ بڵاوكردنەوە وەرنەگیرابێت.
٢- زمانی كوردی زمانی سەرەكی بڵاوكردنەوەیە لە گۆڤارەكە، بەڵام لێكۆڵینەوەی زانستی بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاودەكاتەوە.
٣- هەر بابەتێك كە بۆ گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی دەنێردرێت، دەبێت ناوونیشانی باسەكە، ناوی نووسەر، شوێنی كارەكەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەكەی لە سەر لاپەڕەی یەكەمی لێكۆڵینەوەكە نووسرابێت.
٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەكەی بە هەردوو زمانەكەی دیكە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەكە لە كۆتایی توێژینەوەكە بنووسێت، كە نابێت لە یەك پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەكییەكانی توێژینەوەكە بخرێنەڕوو.
٥- لە دوای پەسەندكردنی باسەكە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوكردنەوەی بە توێژەر دەدات.
٦- بۆ ئەوەی بابەتەكە لەگەڵ ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوەی گۆڤارەكەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێك بیرۆكەی سەرەكی توێژینەوەكە نەگۆڕێت.
٧- ئەگەر باسەكە لە بارەی ساخكردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەكە بە پێی بنەما زانستییەكان بێت و چەند لاپەڕەی كۆپیكراوی دەستنووسەكە و شوێنی وەرگرتنی، كۆد و جۆری دەستنووسەكە (دەستنووس، چاپ، مایكرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.
٨- ئەگەر ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باسەكە،

توێژینـەوەی بابـەت، شـێوازی بەکارهێنانـی سـەرچاوە و ڕێکخسـتنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێتن، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێتن فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێت باسـەکە دانەیەکی لەسـەر (CD) لەگەڵ (٣) دانەی چاپکراوی سـەر کاغەز (A4) بە فۆنتی یۆنیکورد بێت، ناوونیشـانی سـەرەکی بە قەبارە (١٥) و ناوی توێژەر و ناوونیشانی لاوەکی بە قەبارە (١٤) و ناوەڕۆک بە (١٣) و پەراوێزیش بە (١٢) بێت، بە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانی بە لیستی پەراوێز و سەرچاوەکانیشـەوە لە (٢٥) لاپەڕە زیاتر نەبێت و لە حاڵەتی ناچاریشـدا تـا (٣٠) لاپـەڕە وەردەگیرێت، بە مەرجێ بۆ هـەر لاپەڕەیەکی زیادە خاوەن بابەت بڕی (٥٠٠٠) پێنج هەزار دینار بدات و پەراوێزەکانیشـی لە ناوەڕۆک و لـە پەراوێـزدا لـە ناو دووکەوانـەی( ) بچوک دابێت و لە کۆتایی باسـەکە دابندرێت.

١٠- ئەگـەر بابەتەکـە وەرگێـڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرابێت.

١١- گۆڤـاری ئەکادیمیای کوردی ناسـاندن و هەڵسـەنگاندنی ئـەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بە هیچ شێوەیەک نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# فۆبیای ڕێنووس

**پ. د. وریا عومەر ئەمین**
ئەکادیمیای کوردی

**پێڕەوی دۆزینەوە**Discovery Procedure ڕێباز و تەکنیکێکی شیکردنەوەیی زمانەوانیی ڕێبازی بنیاتنەرییە Structuralism. زمانەوانی ئەمەریکی فرانسس بۆب (١٨٥٨ — ١٩٤٢) ئەم ڕێبازەی داهێنا بۆ پاراستن و نووسینی ڕێزمانی زمانە ڕەسەنەکانی کیشوەری ئەمەریکا کە بە (ئەمەریندیان) ناوبراون، پێش بنبڕبوون و لە دەسچوونیان.

بە هۆی ئەم ڕێباز و پێڕەوە، بە پشت بەستن بە یاسا و بنەما ماتماتیکییەکان و پەیوەندییە لۆژیکییەکانی نێوان پێکهێنەرەکانی، سیستەمی زمان دەستنیشان دەکرێت. ئەم پێڕەوە لەهەموو ئاستەکاندا کار دەکات بە تایبەتی لە ئاستی فۆنۆلۆجیدا. بە هۆی ئەم پێڕەوەوە دەشێ یاساکانی ڕێزمانی هەر زمانێک دەستنیشان بکرێت (تەنانەت) بێ زانینی زمانەکەش.

لەم وتارەدا زۆر بە کورتی ئەوە دەردەخەین کە چۆن کێشەیێکی ڕێنووسی کوردیی پەیوەندیدار بە ئاستی فۆنۆلۆجییەوە بە هۆیەوە چارەسەر دەکرێت.

بە دەیان وتار و باس و لێکۆڵینەوە لەبارەی گیروگرفت و کێشەکانی ڕێنووسی کوردی بڵاوبوونەتەوە.[1] هەر یەکە بەپێی بۆچوونی خۆی گیروگرفتەکان دەستنیشان دەکات و چارەسەریان دەکات. یەکێ لەو کێشانە مەسەلەی بزوێنی (و) ی درێژ و کورتە.. هەندێ زمانەوان لەسەر ئەو ڕایەدان کە لەبەر ئەوەی جیاوازیی نێوانیان (گوایە) فۆنیمی نییە، بۆیە (وو) نەخرێتە ناو سیستەمی فۆنۆلۆجی و نووسینی زمانی کوردییەوە و بە ئەلەفۆنێکی (و) بژمێردرێ و یەک پیت هەردووکیان بنوێنێ.

زمان دیاردەیێکی زیندووە، لە ڕادە بەدەر ئاڵۆز و تێکچڕژاوە، هەمیشە لە جووڵە و گۆڕینـدایە. سروشتێکی سرکی جیوەیی هەیە. نووسین وشک و مەیيو و وەستاوە. بۆیە نووسین هەرگیز ناتوانێ پڕبەپیستی وتنی زمانەکە بێت.

ئەلفـوبێی هەر زمـانێ لەسـەر بنـاغەی سیسـتەمی فـۆنیمیکی زمـانەکە دادەمەزرێت بۆیە لەکاتی دانانی ئەلفوبێکە تاڕادەیێک نزیکی لەنێـوان نووسـین و وتن بەدی دەکرێ بەڵام هەرگیـز یەک بە یەک و دەقـاودەق نـابن. هـیچ زمانێـک نیـیە و نەبـووە لە هەمـوو جیهانـدا کە ئەلفـوبێکەی بە تەواوی (فـۆنیمیکی) یـا (فۆنەتیکی) بێت و هەرگیز ناکرێ.

نووسـین گەلـێ جـۆری هەیە. (فـۆنەتیکی و فۆنۆلـۆجی و ئیـدیۆگرامی و سـیلابیکی و تـێکەڵ و.. ).. هەنـدێ لە زمانەوانانمـان دەرکـی جیـاوازیی نێـوان ئەمانە نـاکەن ، بە تـایبەتی هـی نێـوان (فـۆنەتیکی و فۆنۆڵـۆجی)[٢]. هەیە لە ڕوانگەی نووسینی فۆنەتیکییەوە بیـر لە ڕێنـووس دەکـاتەوە، هەیە لە ڕوانـگەی فۆنۆڵـۆجییەوە و هەشـە لە ڕوانـگەی هەردوو ئاسـتەوە بە تێکەڵـی بـێ ئەوەی شـارەزای بـوار و تەکنیکیـان بـێ.. بـۆیە زۆر لەو لایەنـانەی کە بە گیروگرفتـی لەقەڵەم دەدەن ، بە پێوانەی بناماکانی ڕێنووس نابنە گیروگرفت.

هـیچ زمانێـك بـێ گیروگرفتـی ڕێنـووس نییـە. هـەر هەوڵـدانێکیش بـۆ چارەسـەرکردنی ڕێنـووس گیروگرفتـی تـری زمانـەوانی و غـەیری زمانـەوانی سـەر هەڵـدەدەن. کـام زمـان بەقـەد چـینی و ئینگلیـزی و عـەرەبی و ...گیروگـرفتی ڕێنووسیان هەیە کەچی سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵدان و وتار و باسانەی لەبارەی ئەو گرفتانەوە بڵاوکراونەتەوە نەتوانرا چارەسەر بکرێت. دەرکەوت بە دەسـکاری کردنیان گیرو گرفتی تری ئاڵۆزتر و دژوارتر سەر هەڵدەدەن. هیچ زمـانێکیش نییـە ڕێنووسێکی یەکگرتووی هەبێ.[٣]

دەمـێکە زمانەوانـان ڕێنووسـیان لە گیروگرفتەکـانی زمانەوانیـدا جیـا کـردۆتەوە و ڕێنووسـیان لە زمـانەوانی دەرهێنـاوە.. ڕێنـووس بـۆتە شـتێکی کۆمەڵایەتی و پێکهاتنی عەفەوی لەسەریا..دەمێکە زمانەوانانی جیهـانی توخـون ڕێنووس ناکەون و هیچ ڕێبازێکی زمانەوانی نییە باسی ڕێنووس بکات. ڕێنـووس هەر لای ئێمە بۆتە دێوەزمەی زمـانەوانی و کـراوەتە کێشـەیێکی ئـاڵۆز و بـۆتە گرفت و داوای شتی تەعجیزیی بۆ دەکەین.

بـۆ دانـانی ڕێنـووس بـۆ هەر زمانێـک فۆنیمەکـانی زمـانەکە دەستنیشـان دەکرێت و بە جۆرەی فۆنیمەکانی پیتەکان دادەنرێن. مەرجـیش نیـیە و هەرگیـز ناکرێ ژمارەی پیتەکان بەقەد دەنگ و فۆنیمەکانی زمانەکەبێـت ، هەرگیـز هـیچ زمـانێکیش نیـیە و نەبـووە ژمـارەی پیتەکـانی بەقەد فۆنیمەکـانی بـێ . لە

نووسینی زۆر لە زمانان پیت هەیە لە نووسینا بەکار دەهێنرێ کەچی لە ئەلفوبێکەیدا نییە. هەشە بە پێچەوانەوە ، زمان هەیە دەنگی وای تێدایە کەچی پیتی بۆ نییە [٤] و هەیە هەمان دەنگ بە چەن جۆرێ دەنووسرێت و یا هەمان پیت چەن دەنگێ دەنوێنێ یا هەمان دەنگ چەن پیتێکی هەیە..یا زۆر وشە هەیە بەجۆرێ دەنووسرێ و بە جۆرێکی تر دەوترێ.[٥]

هەر دەنگێکی زمانی لە شوێنێکی تایبەتیی ئەندامانی ئاخاوتندا دروست دەکرێ و چەند سیمایێک دەگرێتە خۆ. دەنگە جیاوازە (هاوشوێن) ـەکان بە سیما فۆنەتییەکان لێک جیا دەکرێنەوە. وەک ( ت ــ د ) ( س ــ ز) ) ( ش ــ ژ) (ک ـ گ) (ف ــ ڤ ) هتد کە هەر جووتێکیان هاوشوێنن و بە سیمای (ژێدار / بێژێ) یی لێک جیا دەکرێنەوە. لە دەنگە یەکەمەکاندا لە کاتی گۆ کردنیان (ژێ)یەکان دەلەرێنەوە و لە دووەمەکاندا نالەرێنەوە. ژمارەی سیماکان زۆرە (ژێدار ــ زاری ــ لووتی ــ خشۆک ــ تەقیو ــ درێژی ..هتد) [٦] ..یەکێ لە سیماکانی بزوێنەکان (درێژی) بەرانبەر بە (کورتی) یە duration کە دەنگی هاوشوێنی کورت لە درێژ جیا دەکاتەوە ، وەک لە (و ــ وو) ، (ـە — ا ) و (i ــ ی).

لە ڕێنووسی زمانی کوردی (و) و (وو) کە بە سیمای (درێژی) لێک جیا کراونەتەوە. هەندێ زمانەوان و نووسەر وای بۆ دەچن کە ئەم (وو) ە لە نووسیندا لابرێ چونکە (بەلایانەوە) جیاوازیی (و) و (وو) لە زمانی کوردیدا فۆنیمیکی نییە.

لە ڕووی زمانەوانی و سروشتی بنەماکانی ڕێنووسەوە ئەم ڕایە مایەی گفتوگۆیە چونکە:

١- گەر بەپێی شیکردنەوەی Discovery procedure ی ماتماتیکی سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی کوردی ساغ بکرێتەوە (و) و (وو) دوو فۆنیمی جیاوازن لەم زمانەدا.

٢- گەر فۆنیمیکیش نەبن ، جیاوازیی نێوانیان زۆر زەقە و هیچ ڕێنووسێ ناکرێ و نییە بە تەواوی فۆنیمیکی بێت.

٣- بە ڕەچاوکردنی بنەماکانی ڕێنووس و بەراوردکردن ئەمە بە گیروگرفت ناژمێررێ.[٧]

دوو پێڕەو هەن بۆ دەسنیشانکردنی فۆنیمەکانی زمان:

١ ـ لە ڕێی جووتۆکە و سێتیلەکانەوە.[٨]

٢ ـ بە پێڕەوی ماتماتیکی کە لە بواری Mathematical Linguistics دا بە پێڕەوی Discovery Procedure ناو دەبرێ. بە دەستنیشانکردنی پەیوەندیی لۆژیکییان لە چوارچیوەی سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانەکەدا ساغ دەبێتەوە کە جیاوازیی نێوان (وو) و (و) لە زمانی کوردیدا فۆنیمیکییە.

ئەوانەی لە سەر ئەو ڕایەدان کە جووتە ڤاوڵی (و ـ وو) دوو فۆنیم نین لە زمانی کوردیدا لەوانەیە ڕاست بن بەپێی شیکردنەوەی جووتۆکەیی. چونکە لەوانەیە جووتۆکەیان نەبێ (لەوانەشە هەیبێ و بۆی هەیە بۆی پەیا بێ).. بەڵام گەر بە پێوانەی لۆژیکی پەیوەندیی ماتماتیکی شی بکرێتەوە ئەم دوو دەنگە لە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی کوردیدا دوو فۆنیم دەنوێنن بەپێی یاسای یەکسانیی ئاڵوگۆڕ Commutativity بەم هاوکێشە:

ئەگەر ( X و N) دوو نرخی جیابن و (X و L) دوو نرخی جیابن واتا (N) و (L)

دوو نرخی جیان:

ئیستا لەژێر تیشکی ئەم لۆژیکە ئەمانە لێکبدەرەوە:

1) ـ لە:

گوڕ ـ گۆڕ

قوڕ ـ قۆڕ

(و ـ ۆ) دوو فۆنیمی جیان و لە:

بوو ـ بۆ

توو ـ تۆ

(وو ـ ۆ) دوو فۆنیمی جیان..

کە ( و ـ ۆ ) و ( وو ـ ۆ) هەر یەکە دوو فۆنیمی جیابن ..بەپێی یاسای سەروبەر Commutativity دەبێ ( و ـ وو) دوو فۆنیمی جیابن.

2) ـ لە:

کەڕ ـ کوڕ

گەڕ ـ گوڕ

(ـە ـ و) دوو فۆنیمی جیان و لە:

سەر ــ سوور

دەر ــ دوور

(ـە ــ وو) دوو فۆنیمی جیان .

کە ( ـە ـــ و ) و ( ـە ـــ وو) هەر یەکە دوو فۆنیمی جیابن ..بەپێی یاسای سەروبەر ( و ــ وو) دوو فۆنیمی جیابن.

3) ــ لە:

پەڕ ــ پڕ

گەڕ ــ گڕ

(ـە ــ i) دوو فۆنیمی جیان و لە:

سەر ــ سوور

دەر ــ دوور

(ـە ــ وو) دوو فۆنیمی جیان

کە ( ـە ـــ i ) و ( ـە ـــ وو) هەر یەکە دوو فۆنیمی جیابن ..بەپێی یاسای سەروبەر دەبێ ( و ــ وو) دوو فۆنیمی جیابن.

4) ــ لە:

زار ــ زوور

پار ــ پوور

(ا ــ وو) دوو فۆنیمی جیان و لە:

کان ــ کون

(ا ــ و) دوو فۆنیمی جیان .

کە ( ا ــ وو ) و ( ا ــ و) هەر یەکە دوو فۆنیمی جیابن ..بەپێی یاسای سەروبەر دەبێ ( و‾ــ وو) دوو فۆنیمی جیابن.

ئەنجامی ئەم سەروبەر کردنانە دەبێ (و) و (وو) دوو فۆنیم بن ..با گریمان دوو فۆنیمیش نەبن باشترە لە نووسینا جیا بکرێنەوە چونکە بە سەدان وشە لە زمانی کوردیدا هەیە ئەم دوو دەنگە جیاوازانەیان تێدایە ..و لە هەمان وشەدا هەردوو دەنگ هەن...ئەگینا چۆن وشەی وەک (کولتوور ـــ ئوردوو .. ) بۆ نموونە دەنووسرێن؟

گەر ئەم ڕێنووسەی ئێستامان بەراورد بکەین لەگەڵ هی میللەتە پێشکەوتووەکان، دەردەکەوێ هی ئێمە لە هەمووان ڕێکوپێکترە و بێ گیروگرفتترە.. چاکتر وایە وازی لێ بێنین شتی بچووک نەزلێنین.

**پەراوێزەکان:**

١ – لەو باسانەی لە گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی دەکۆڵنەوە:


**ئەکادیمیای کوردی** (٢٠٠٩) ڕاسپاردەکانی کۆنفرانسی بەرەو ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی (١٢/٤ و ٩/٨ ی ٢٠٠٩).

**ئەوڕەحمانی حاجی مارف** (١٩٨٢) گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. دەستەی کورد.ب.

**ئیبراهیم ئەمین باڵدار** (١٩٨٢) زەنگی کاروانی ڕێنووس. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. دەستەی کورد. ب٩.

**بەدران ئەحمەد حەبیب** (٢٠٠١) پڕۆژەی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی. هەولێر.

**تاهیر سادق** (١٩٦٩) ڕێنووسی چۆنیەتیی نووسینی کوردی. چ. .شیمال. کەرکووك .

**توفیق وەهبی** (١٩٢٥) کوردییەکەمان بە چۆن حرووفێك بنووسین. گ. دیاریی کوردستان. ژ ٥ و ٦.

**حامید فەڕەج** (١٩٧٦) ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا. چ. .کۆڕی زانیاریی کورد. بەغداد.

**ڕاگەیاندنامەی کۆتایی سیمیناری زمانی کوردی**.(١٩٩٨) – هەولێر ( ٢٠ و ٢٢ /٩/ ١٩٩٨).

**شاکر فەتاح ئەحمەد** (١٩٨٢) گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. ب٩.

**عومەر عەبدولڕەحیم** (١٩٨٢) ڕێنووسی کوردی. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. دەستەی کورد. ب٩.

**کامیل بەسیر** (١٩٨٢) خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. دەستەی کورد. ب٩.

**کۆڕی زانیاریی عیراق – دەستەی کورد** (١٩٨٥) ڕاسپێرییەکانی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی.(١٨و١٩/ ١٢/١٩٨٥) بەغداد.

**مستەفا نەریمان** (١٩٨١) ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە.دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی. زنجیرەی زمان (٥) . بەغداد.

**محمد معروف فتاح** (١٩٨٢) نووسینی کوردی لە ڕوانگەی فۆنۆتیکەوە. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق – دەستەی کورد. ب٩ . بەغداد.

**نوری عەلی ئەمین** (١٩٧٦) ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی. چ. سلمان الاعزەمی. بەغداد.

**وریا عومەر ئەمین** (١٩٨٢) ئیملای کوردی و چەن تێبینییەك . گ. کۆڕی زانیاریی عیراق. دەستەی کورد. ب٩.

**وریا عومەر ئەمین** (٢٠٠٨) ئەلفوبێی جیهانی . ڕۆژنامەی بەدرخان، ژ ٨٩ ی ٢٢/١/٢٠٠٨.
**وریا عومەر ئەمین** (٢٠١١) گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی بە لاتینی. کۆنگرەی زمانەوانی (١٩-٢٢/٩/٢٠١١) ل١٣٨-١٥٢.
**وریا عومەر ئەمین** (٢٠١٢) بە ستاندارکردنی ڕیزبوونی پیتەکانی نووسینی کوردی. گ. ئەکادیمیای کوردی. ژ ٢١ ل ٧٥ – ٨٨.
**وریا عومەر ئەمین** ( ٢٠١٣) ڕێنووس و چەند پرسیارێك. ڕۆژنامەی چاودێر. ژ ٣٧٥ و ٣٧٦ ی ٢٦/٨ و ٢/٩ ی ٢٠١٣. دیمانەی هەرێم عوسمان.

٢ – سەیری ئەم سەرچاوەیە بکەن:

وریا عومەر ئەمین ( ١٩٨٩) فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی. گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عیراق – دەستەی کورد ژ ٢٠ ، ل ٢٣٩ – ٢٥٩.

دووبارە لە کتێبی (ئاسۆیێکی تری زمانەوانی ـ دەزگای ئاراس ٢٠٠٤ و ٢٠٠٩) ل٤٦ ـ ٥٩ بڵاوکراوەتەوە.

٣ ـ بزووتنەوەی ڕێنووسسازیی زمانی ئینگلیزی لە سەدەی شازدەهەمەوە دەستی پێکردووە.. لە ساڵی ١٥٦٨ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا سێر تۆماس سمیت Sir Thomas Smith یەکەم پێشنیازی ڕێنووسسازیی بە ناوی On Rectifying and Amending the Written English Language ( لە بارەی ڕاستکردنەوەی ڕێنووسی ئینگلیزی) یەوە پێشکەش بە شا ئێدوەردی شەشەم و ئیلەزەبێتی یەکەمی کرد.

دوای ئەمە و لەو چوار سەدەی بەسەر چوو بە سەدان هەوڵ دراوە لەلایەن زمانەوانان و زانایان و دەزگا کۆمەڵایەتی و فەرمی و زانستییەکان لە بەریتانیا و ئەمەریکادا بۆ ئەم مەبەستە، هیچی سەری نەگرت.

شایانی باسە کە ئەنجومەنی ئاسانکردنی نووسین Simplified Spelling Board (SSB) لە ساڵی ١٩٠٦ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دامەزرێنرا. دەستەی دامەزراندنەکە لە ٣٠ ئەندام پێکهاتبوو..کە هەموو نووسەر و پرۆفیسۆر و سەرنووسەری ناوداری سەردەمی خۆیان بوون. دامەزرێنەرەکەی (ئەندروو کارنەگی) سێسەد هەزار دۆلار بەخششی ساڵانەی بۆ تەرخان کرد. ئامانجی ئەم ئەنجومەنە ئەوە بوو کە گیروگرفتی نووسین چارەسەر بکەن. لە نیسانی ساڵی ١٩٠٦ دا لیستەیێکی ٣٠٠ وشەییان بڵاو کردەوە بە ڕێنووسی تازە ..لە کانوونی دووەمی هەمان ساڵدا (١٩٠٦) سەرۆکی ئەمەریکای ئەوسا (تیۆدۆرا ڕۆزفلت) پەسندی کرد و فرمانی دا داموەزگا فەرمییەکان ڕەچاوی بکەن. ئەمە کێشەیێکی زۆری پەیاکرد و بوو بە هەرا و کەوتە کۆنگرس ..کۆنگرس لە کانوونی دووەمی هەمان ساڵدا بڕیاری دا کە بگەڕێنەوە سەر ڕێنووسە کۆنەکە. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدان بۆ سازانی ڕێنووس بەردەوام بوو و تا ئێستاش نەوەستاوە... ئیستا

هەردوو شێوەکە بەکار دەهێنرێن بە تایبەتی لە ئەمەریکادا و تێکەڵ و پێکەڵ بووە.

**لە ساڵی ٢٠١٣ دا پرۆفیسۆری زمانی ئینگلیزی** Simon Horobin **لە زانکۆی ئۆکسفۆرد** (سایمون هۆربن) وتی ( جیاوازیی ڕێنووس و هەبوونی شێوەی جیا بۆ نووسینی هەمان وشە ئەبێ بە شتێکی ئاسایی سەیری بکرێ و قبووڵ بکرێ و هەر هەوڵدانێک بۆ یەکگرتنیان بێ سوودە)..ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە باشترین و بەهێزترین زمانەوان زمان خۆیەتی.

نموونەیێکی تر زمانی چینییە کە زمانی زیاتر لە ملیار و نیوێکە..زمانی چارێگێکی هەموو مرۆڤی سەر ڕووی زەمینە، ئیستاش نووسینی وێنەیی ئیدیۆگرامی بەکار دەهێنن. لە نیوەی یەکەمی سەدەی ڕابردوودا لە سەردەمی ماوتسی تۆنگدا هەوڵدرا بۆ گۆڕینی بە نووسینێکی فۆنیمیکی، نەیانتوانی ، بۆیان دەرکەوت کە گەر بیگۆڕن لە شارستانییەتی کۆن و مێژووەکەیان دەپچڕێن و یەکیەتیی نەتەوایەتییان لەدەس دەدەن و دەبن بە چەن میللەتێک. نووسینەکەیان هۆکاری سەرەکیی لێکبەستنی نەتەوەییانە، بۆیە بڕیاریان دا نەیگۆڕن. بەو نووسینە گەیشتوونەتە لووتکەی تەکنەلۆجیا و بەربەرەکانێ لەگەڵ هەموو جیهاندا دەکەن..

٤ ـ لە ئەلفوبێی نووسینی ئینگلیزیدا پیت نییە بۆ (ش – چ – ژ ) پیتی (ش) بە پێنج جۆر دەنووسرێت s – sh – t – ss – ch وەک لە machine – mission – station - she – sugar

دەنگی (ف) بە سێ جۆر دەنووسرێت ( ph – gh – f ) وەک لە ( tough – elephant – knife)...

(gh) لە night – through – though هیچ دەنگ نانوێنن.

لە وشەی – queen – accept – book - mechanic – car -

c – ch - k – cc – q بە (k ) و لە سەدان وشەی وەک knight (k ) ناخوێنرێتەوە.

بە سەدان نموونەی تری لەم جۆرانە لە ڕێنووسی زمانی ئینگلیزیدا بەرچاو دەکەوێ .

٥ – ئەلفوبێی نووسینی زمانی عەرەبی ٢٨ پیتی تێدایە کە لەم وشانەدا کۆکراونەتەوە **(ابجد – هوز – حطي – كلمن – سعفص – قرشت – ثخذ – ضظغ)** کەچی ( ى (الف مقصورة) ـ **ة** (تێی خڕ) – ئـ (هەمزەی سەر کورسی)– **همزة الوصل – الفی مدة** ـ شدة – بزوێنە کورتەکان...هتد) بەرچاو ناکەون.

( **ظ – ض** ) و ( **ت – ة** ) ( ا – ى) هەر جووتەی یەك دەنگ دەنوێنن.

زۆر وشە هەیە بەجۆرێ دەنووسرێ و بە جۆرێ دەوترێ. کوا پیتی (ا) لە وشەی (**هكذا — ذلك — اولئك**). لەم دوو وشەیە ( **دعا ، سعى) (ا — ى)** هاودەنگن.

هەر پیتەی بە سێ چوار جۆر جۆر دەنووسرێ بۆ نموونە دەنگی (ت) ( **تـ ـ ـتـ ـ ـت ـ ت ـ ة**) زۆر جۆری تر لەم شێواوییەی ڕێنووسی زمانی عەرەبی[1].

هەر بەراوردێکی ڕێنووسی قورئان و هی ئیستا بکرێت ، دەردەکەوێ ئاسمان و ڕێسمانە.

٦ — سەیری پەراوێز ژ (٢) بکەن.

٧ ـ بۆ ئەوەی دەرکی ئەوە بکەین کە ئەمە هەرگیز شایانی ئەوە نییە بکرێتە گرفت و ئەو هەموو هەرایەی لەسەر بکرێ با سەیرێکی جۆری نووسینی (و — وو) ی زمانی ئینگلیزی بکەین:

لە ئەلفوبێی زمانی ئینگلیزیدا بۆ (و) ئەم سێ پیتە هەیە ( u – o – w) لە نووسینیدا دەنگی (وو) بە هەشت جۆر دەنووسرێت ( oo – o – ou – ew – ue – ui – oe - u) وەک لە (moon – do – group – chew – blue – juice – shoe)

دەنگی (و) بە چوار جۆر دەنووسرێت (ou – oo – o – u) وەک لە (put – wolf – good – could).

لە وشەی ( burn - turn) دا (u) بە (ێ) دەوترێ.

لە وشەی (beautiful) دا (u) بە (یوو) دەوترێ.

لە وشەی sward – wander ، (a) بە (ۆ) دەخوێنرێتەوە.

لەم وشانەدا:

(sun – son – country – blood – does)، ( u – o – ou – oo – oe) بە ( ـە ) دەخوێنرێنەوە.

لە ( book و look) دا ـ (oo) بە (و) ئەخوێنرێتەوە.

لە ( boot و poor و ، shoot بە ( وو )

لە ( blood و flood بە ( ـە )

لە ( word – work) ، (o) بە (ێ) دەوترێ.

لە (journey) دا (ou) بە (ێ) دەوترێ.

لە (country) دا (ou) بە (ـە) دەوترێ.

...هتد

ئەمە تەنها بە جۆرەی بزوێنی ( و — وو) لە زمانی ئینگلیزیدا..

شایانی باسه لەم ڕووەوە بوترێ کە لە زمانی ئینگلیزیدا هیچ بزوێنێکی تیا نییە بە گەلێ جۆر نەنووسرێ. بۆ نموونە لەم وشانەدا : – he – believe – Caesar – see
people – seize – sea – key – amoeba – busy - machine
( e – ie – ae – ee – eo – ei – ea – ey – oe – y – i) هەموو بە ( ی) دەخوێنرێنەوە.

لەم وشانەدا:
sit – rhythm – pretty – ladies - private
( i – y – e – ie – a) هەموو بە (i) دەخوێنرێنەوە.
لە set – dead – many (e – ea – a) بە (ێ ) دەخوێنرێنەوە.
ئەم هەرایە دەنگە وەستاوەکانیشی گرتۆتەوە .

٨ ــ سەیری ئەم سەرچاوانە بکەن:
وریا عومەر ئەمین (١٩٩٠) جووتۆکە. ڕۆژنامەی هاوکاری ژ ١١٧٠ ی١٦/٤/١٩٩٠
ــــــــــــ (٢٠٠٨) سێتیلە . ڕۆژنامەی بەدرخان ژ ٩٠ ی ٢٢/٢/٢٠٠٨
دووبارە لە کتێبی (پیتۆکەکانی زمانەوانی- دەزگای ئاراس ٢٠١١) ل ٥٩ ــ ٦٠ و ٦١ ــ ٦٣ بڵاوکراونەتەوە.

**سەرچاوەکان:**

Bloomfield, L. (1933) Language. New York, Holt.

Fischier.Jorgensen, E. (1952) On the Definition of Phoneme Categories on a Distrubitional Basis. AL7.PP8-~ 39.

Sommerstein, A.H.(1977) Modern Phonology. London

Lass, R. (1984) Phonology – An Introduction to Basic Concepts. University Press, Cambridge.

**وریا عومەر ئەمین** (٢٠٠٨) ئەلفوبێی جیهانی . ڕۆژنامەی بەدرخان ژ ٨٩ ی ٢٠٠٨/١/٢٢.

ـــــــــــــ (٢٠١١) گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی بە لاتینی. کۆنگرەی زمانەوانی (١٩-٢٢/٩/٢٠١١) ل١٣٨-١٥٢.

ـــــــــــــ (٢٠١٢) بە ستانداردکردنی ڕیزبوونی پیتەکانی نووسینی کوردی. گ. ئەکادیمیای کوردی. ژ ٢١ ل ٧٥ – ٨٨.

ـــــــــــــ ( ٢٠١٣) ڕێنووس و چەند پرسیارێك. ڕۆژنامەی چاودێر. ژ ٣٧٥ و ٣٧٦ ی ٨/٢٦ و ٩/٢ ی ٢٠١٣. دیمانەی هەرێم عوسمان.

**وریا عومەر ئەمین** و ئەوانی تر (٢٠١٣) ڕێنووسی کوردی بەپێی بنەما زانستییەکانی ڕێنووسی گشتی. ئەکادیمیای کوردی.

**ملخص البحث**

الاجراء الاستكشافي طريقة ميكانيكية مبنية على المنطق الرياضي لاستنباط قواعد اللغة من عينة تلك اللغة والتي يمكن تطبيقها حتى بدون معرفة تلك اللغة. أسس هذه المدرسة اللغوية العالم الامريكي فانسس بوب (١٨٥٨ – ١٩٤٢) لتسجيل قواعد المئات من اللغات الأمريكية الأصلية قبل فنائها.. يمكن بهذا النهج تحديد النظام الصوتي للغة بشكل دقيق.

هذا البحث محاولة للتعريف بهذا النهج اللغوي ومناقشة إحدى المشاكل الإملائية في اللغة الكوردية.

**Abstract**

Discovery Procedure is a mechanical procedure based on Mathematical and Logical principles for deriving a grammar of a language from a corpus, or sample, of sentences even without knowing the language . This theory was found and proposed in America by Franz Boas (1858 – 1942) to preserve the hundreds of indigenous American Indian languages which never previously described , and likely to become extinct if not recorded . This theory developed methods to prescribe sound principles for the analysis of phonemic system.

This research is an attempt to present a concise definition of this method, and discuss the problem of the distinctively phonemic of (u – u:) in Kurdish Language.

# زمان و سنوور

**پ.د. ڕەفیق شوانی**

بەشی زمانی کوردی

کۆلیجی زمان/ زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

ئەم باسە دەربارەی زمان و سنوورە، واتە سنووری بەکارهێنانی زمانی پێوانەیی ( زمانی ستاندارد) وەك زمانێکی نەتەوەیی ، کە تایبەتێتی دەستووری و ڕێزمانی خۆی هەیە، لە ئەنجامی چەندین سەدە لە گۆڕانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەوە لە ناو سنووری نیشتمانی و نەتەوەییدا پێکدێت.

باسەکە، باس لەوە دەکات کە سنووری زمان و سنووری نیشتمانی لەگەڵ یەکتردا ڕێکدەکەوێت یان نا؟

بۆ هەندێك وڵاتی تاك زمانی، سنووری نیشتمانی و سنووری زمانی ڕێکدەکەوێت. لە هەندێك وڵاتیشدا، سنووری زمانی پێوانەیی، سنووری نیشتمانی خۆی تێدەپەڕێنێت و لە ناو سنووری وڵاتی دووەمدا بەکاردێت. لە هەندێك وڵاتیشدا لە ناو سنووری نیشتمانەکەیدا زیاتر لە زمانێکی پێوانەیی دەوری زمانی فەرمی دەبینێت.

زمانی نەتەوەییی واش هەیە، لەناو سنووری وڵات و نیشتمانەکەی خۆیدا، بەکارناهێنرێت و زمانی نەتەوەی دەسەڵاتدار، لە سنووری نیشتمانەکەیدا بە دەستوور و بە دیکتاتۆرییەت بەسەر نەتەوەکەدا دەسەپێنرێت.

بارودۆخی سیاسی و جۆری سیستەمی حوکمڕانی بەندە بەم حاڵەتەوە. باسەکە بەنموونەوە پەیوەندیی نێوان زمان و سنوور ڕووندەکاتەوە. لێرەدا زمان دەکەوێتە بەر سیاسەتی زمان، واتە لە وڵاتدا سیاسەتی یەك زمانی، بریتییە لە سیاسەتێکی ئاینی و مەزهەبی لەو وڵاتانە کە دەسەڵاتی وڵات ئاینییە، کە ئاین تیایدا تێکەڵ بە دەسەڵاتی سیاسی دەبێ.

## زمان و سنوور

پەیوەندیی زمان بە زانستی ترەوە:

زمان لە زۆر رووەوە، بۆتە جێگای بیرکردنەوە و تێڕامانی مرۆڤ بە گشتی و زانایان بە تایبەتی، چونکە زمان پەیوەندییەکی راستەوخۆ و گرنگی بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە.

ئەم پەیوەندییە بەندە بە زانستە جۆراوجۆرەکانی پەیوەند بە ژیانی مرۆڤەوە. وەك ئەوەی دەرکەوتووە زمان: دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە لە رووی کۆمەڵناسی، دەروونناسی[1] و فەلسەفە و جوگرافیا و ... لێی دەکۆڵرێتەوە. لەم رووە وە زمانەوانی جوگرافی و زمانەوانی دەروونی و زمانەوانی کۆمەڵایەتی پەیدابووە.

ئەم بابەتە زمانەوانییە، کە لێرەدا لێی دەکۆڵینەوە بە ناونیشانی (( زمان و سنوور))ە. رووی جوگرافی زمانەوانی بەگشتی دەگرێتەوە، وەك ئەو شوێن و رووبەرەی کە زمانی نەتەوەیی تێدا بەکاردەهێنرێت. بەوەی ئایە زمانی نەتەوەیی سنووری ولات تێپەڕ دەکات و لە دەرەوەی سنووری نیشتمانی نەتەوەکەدا بەکاردەهێنرێت یان نا؟ ئەمجا ئەم دیاردەیە هەموو زمانێك دەگرێتەوە، واتە بۆ هەموو زمانێك یا بۆ زۆربەی زمانەکان وەکو یەکە یا جیاوازە؟

ئەم بابەتە وەڵامی ئەم پرسیارە و لایەنی تری بابەتەکە دەداتەوە. لێرەوە باسەکە دەست پێدەکات.

زمان و سنوور دوو بابەتی لەیەکتر جیاوازن، یەکەمیان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و دووەمیان دیاردەیەکی سروشتییە. زمان لە ناو کۆمەڵەوە دەرکەوتووە، پێویستی ژیان بۆ پەیوەندیکردن هێناویەتییە کایەوە، هەرچی سنوورە دەسکردی مرۆڤە، هۆی سیاسی و نەتەوەیی و هەندێك جار ئابووریشی لە پشتەوەیە.

وەکو زانراوە راستی جیاوازیی جوگرافی نێوان زمانەکان لە یەکەم سەرنج و تێبینییەوە دەرکەوتووە وەکو یەکە، گریکەکان هەستیان بەوە کردبوو ، کە کۆمەڵێکی جیاواز هاوبەشن لە ژمارەیەك زمانی جیاواز لە تێگەیشتنیاندا، کە بەمە

دەوترێــت زار و هەریەکــەی لــە ناوچــەیەکی تایبــەتی بــەکاردێت[٢] واتــە زارە جیاوازەکانی ناو زمانێك لە ولاتدا خەڵکی ولات و نەتەوەکەی لێی تێدەگەن. ئـەم لێتێگەیشـتنە لـەناو چوارچـێوەی رووبـەری شـوێنی دانیشـتوانی هـەمان نەتـەوە دەبێت.

ئەگەرچی هەریەك لەم زارانە، واتە زار، هەریەکەی لە ناوچەیەکی تایبەتی ناو ئەو رووبـەرە فراوانـەی وڵاتەکـە بـەکاردەهێنرێت[٣]، ئەمـە بەنـدە بـە جوگرافیـای زمانناسییەوە، یا بە زارناسییەوە.

## پێناسەی جوگرافی زمانەوانی:

جوگرافیای زمانەوانی: وەك بەشێك یا لقێـك لـە لقـەکانی زانسـتی زمـان، کـە بایـەخ بـە شـیکردنەوە و باسـکردن و وەسـفکردنی جۆراوجـۆری ناوچـەیی یـا کۆمەڵایەتی یا سەردەمی زمانێکی دیاریکراو دەدات، کە چـۆن ئـەم جۆراوجۆریانـە لە رووی دەربڕین لە رووی رێزمانی ( وشەسازی و رستەسـازی) یـا فەرهەنگییـەوە جیـاوازن و چـۆنیش ئـەم جۆراوجـۆرە جیاوازییـە جوگرافییانـە دابەشـدەبن[٤] پێناسەی گونجاو ئەوەیە.

جۆراوجـۆری لـە زمانـدا، واتـە بـوونی شـێوەی جیـاوازی قسـەکردن لـە نـاو زمانێکدا، لـە رووی جیـاوازی دەنگـی و جیـاوازی وشـەی فەرهـەنگی و کەرەسـەی جیاوازی ئەرکی لە ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراودا، سـنوورێکی زمـانی نـاوخۆیی پێکدێنێ. سنووریش بریتییە لە هێمایەکی جیاکەرەوە بۆ دیاریکردنی شـوێن. وەك شوێنی جوگرافی دانیشتوان، شوێنی بەکارهێنانی زار و زمان، شـوێنی کـارکردن و ئەرك بینین و بەڕێوەبردن.

کەواتە زمان پابەندە بـە سـنووری بەکارهێنانـەوە، ئـەم سـنوورە تایبـەتێتی جیاواز دەبەخشێت بە ناو هەمان زماندا، بێ ئەوەی ببێتە هۆی جیـاوازیی تـەواو ، لـە زمانـە نەتەوەییەکـە جیابکاتـەوە و بـە تـەواوی دابـبڕێـت لێـی. بۆیـە زار لـە زمانەوانیدا کە لە ناو زمانی نەتەوەدا پەیدا دەبێت، بەم شێوەیە پێناسە دەکرێت: بریتییــە لــە جیــاوازیی قســەکردن لــە ســنووری رووبــەری ناوچــەیەکی زمانــە نەتەوەییەکەدا.

سنووری زار و زمان بەندە بەلایەنی سیاسی و رۆشنبیری و جوگرافی و کۆمەلآیەتییەوە، زیاتر لەوەی زمانەوانی بێت[٥]، لە ناو ناوچەکەیدا، زارە هاوسێکان و لە یەکتر نزیکەوە لە رووی جوگرافییەوە لەیەکدەچن و زارە دوورەکانیش بەشێوەیەکی گەورە جیاوازن لە یەکتر و لە هەندێك حاڵەتی زۆر دەگمەندا لەیەکتر تێگەیشتن لەگەڵ یەکتردا نابێت. لێرەدا دەبێت ئەوە بزانرێت ، کە زمانە ستاندەرەکانیش ( زمانی نەتەوەیی) بۆ نموونە زمانی ئەڵمانی یا ئینگلیزی یا فەرەنسی ستاندارد لە بنەڕەتدا زارێك بوونە و لە رووی مێژووییەوە بایەخی سیاسی و رۆشنبیرییان هەبووە[٦].

ئەمە راستە زارە ناوچەییەکان، لە سنووری بەکارهێنانی خۆیاندا ، زمانی پەیوەندیکردنی جۆراوجۆرن و کەمترنین لەو بوارانەی کە بەکاردەهێنرێت. زانستی زمان و لێکۆڵینەوەکان لە ئەورووپا دەریانخستووە ، کە جاران وا بیردەکرایەوە زارە ناوخۆییە جۆراوجۆرییەکان کە بۆ کەموکوڕی و شێواندنی زمانە ئەدەبییەکان دادەنرێت[٧]. بە پێچەوانەی ئەم بیرەوە، زارە ناوخۆیی و ناوچەییەکان، کە لە سنووری جیاجیای ناو وڵاتدا قسەی پێدەکرێت دەبنە هۆی دەوڵەمەندیی زمانی ئەدەبی و ستاندارد. زار بۆ زمانی نەتەوەیی وەکو کانی جۆراوجۆر وایە کە بە هەموویانەوە ئاو دەرژێننە ناو رووبار و دەریاکانەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی پەرەسەندنی شێوە زمانییەکان کە سەر سنووری ناوچە جیاوازەکانی هەمان زمانن، واتە لەناو یەك زماندا[٨] و جۆراوجۆریش لە زماندا، لە جۆراوجۆری هەرێمە جوگرافییەکانی زارەوە دێت کە لە سنووری جوگرافی جیاوازدا بوونیان هەیە.

سنوور و زمان وەکو بابەتێکی زمانەوانی ، پابەند بە جوگرافیای زمانەوانییەوە بە تازەترین رێگای لێکۆڵینەوە لە زماندا دادەنرێت و ئەرکێکی کاریگەری زۆری لە لێکۆڵینەوەی زمانەوانی سەردەمی نوێدا[٩] هەیە.

## سنووری زمان:

پێش ئەوەی بابەتەکە روونبکەینەوە، پێویستە پێناسەی سنوور بە گشتی و وەکو زاراوەیەك پەیوەند بە زمانەوانییەوە دیاریبکەین.

سنوور– (border ) : واتە ڕادە، ڕادەی شتێك یا شوێنێك. لـە فەرهـەنگی زمانەوانیدا زاراوەکە بریتییە لە هێمای جیاکەرەوە، یا هێمای ڕادە بـۆ دانـان. بـەم جۆرەش پێناسە کراوە: هێمای ژمارە بۆ دانان، پێکهاتەیەك لەویتر جیادەکاتـەوە، بە واتای جۆرێك لە وەستان وەکو خاڵ یا جیاکەرەوە دێت. زاراوەکـەش ( Border Mark)ە . پەیوەنـدیی ئـەم زاراوەیـە لـە لێکۆڵینـەوەی زمانەوانیـدا بریتییـە لـە دیاریکردنی سنووری بـەکارهێنانی زمانێـك یـا زارێـك لـە ناوچـەیەکی دیـاریکراودا. سـنووری زمـان ئەمسـەر و ئەوسـەری نیشـتمانی نەتـەوە دەگرێتـەوە، ڕۆڵـەی نەتەوەکـە لـە ڕووی یـەك هەسـتی و ڕۆشـنبیری و کـەلتووری و هاوڕەگـەزی و نیشـتمانییەوە بـە یـەکترەوە دەبەسـتێت. دەکرێـت سـنووری جـوگرافی خـاك و نیشتمانی نەتەوەیەك بەهۆی زمانەوە دیاری بکرێت.

واتە سنوورەکەی تا ئەو شـوێنە بـڕ دەکـات کـە زمانەکـە تیایـدا بەکاردێـت. لێرەشدا سنووری زمان ئالۆزییەکی تێدەکـەوێت، بـەوەی ئایـە سـنووری زمـان بـە گشتییە یا مەبەست لە سنووری زمانی پێوانەیی یا زاری زمانەکەیـە. لـە خـوارەوە ڕوونیاندەکەینەوە.

مەبەست لە زمانی پێوانەیی، ئەو زمانەیـە کـە ڕێزمـان و بڕیـار و دەسـتووری خـۆی هەیـە. ئـەم جـۆرە شـێوازە لـە زمانـە ئەوروپییەکانـدا چـەند سـەدەیەکە چەسـپاوە. بەتایبـەتی لـە دوای سـەردەمی ڕاپەڕینـەوە، نەتـەوەیی سەرانسـەری (زمـانی سـتاندارد)، وەکـو زمـانی فەرەنسـایی و ئـەلمانی و ئینگلیـزی و ئیتـالی و ڕۆمـانی و پورتوگـالی و ئیسـپانی، لـە ئـەنجامی هەڵوەشـانەوەی دەوڵـەتی ئـاینی مەسیحییەت پێکهاتن و پەیدابوون، بەتایبەتی لە سەردەمی جیابوونـەوەی ئـاین و دەوڵـەت لـە یـەکتر، زمـانی ئـاین و دەوڵـەت بـوو پاشەکشـەی کـرد و نەتـەوە ئەوروپییـەکان گەڕانـەوە سـەر بـەکارهێنانی زمـانی خۆیـان و زمـانی سـتانداریان بـەکارهێنا. کـە لـە ئـەنجامی ئـەو گـۆڕان و بارودۆخـە مێژووییـەی سـەردەمی وریابوونەوەدا (ڕەینەسانس) پێکهات.

زاریـش جۆراوجـۆرە و لـە نـاو سـنووری زمانـە نەتەوەییەکـە (سـتاندارد) بەکاردێت و شێوەی جیاوازی هەیە، واتە لە ناو سنووری جوگرافی وڵاتی میللەت و نەتەوەکەیدا، چەندین زاری زمانێك بەکاردەهێنرێت. لێکۆڵینەوەکەی ئێمە بەگشتی

باس له مەسەلەی زمان و سنوور دەكات. دواتر لا لە سنووری زمانی كوردیش دەكاتەوە، كە بارودۆخەكەی زۆر جیاوازە لە زمانی نەتەوەكانی تر، بەوەی لەلایەك دەوڵەتی سەربەخۆیان هەیە و، لەلایەكی ترەوە زمانی نەتەوەیی سەرانسەرییان هەیە لە ناو سنووری دەوڵەتی سیاسیدا. ئەمەش پێچەوانەی بارودۆخی نەتەوەی كوردە كە بێ دەوڵەتی سەربەخۆیە، ئەگەرچی زمانی چالاكی لە دوو بەشی كوردستاندا هەیە و مێژوویەكی لە پەیدابوونی و بەكارهێنانی دوو سەد ساڵەی هەیە. هەرچەندە بارودۆخی سیاسی كورد، وایكردووە نیشتمانی كوردی لەیەكتر دابڕیوە.

ئەم لەیەكتردابڕینە زمان و كەلتوور و هونەر و ئەدەبی كوردی تا راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ بەردەوامبووە. دواتر كرانەوەیەك روویدا.

زمان و سنوور لە ولاتێكەوە بۆ ولاتێكی تر لە رووی رێكەوتنیانەوە جیاوازن. لەوانەیە مەودای جوگرافی زمان دیاریكراو بێت و بە تەواوی رێكبكەوێت لەگەڵ یەكەی جوگرافی و رۆشنبیریی دیاریكراودا، كە مەبەست لە دەوڵەتی نەتەوەییە[١٠]. بەلام كاتێك ئێمە باس لە زمانی دەوڵەتێكی تازەی نەتەوەیی دەكەین، بەشێوەیەكی گشتی زاراوەكە بە واتایەكی تەسك و یا زیاتر تایبەت بەكاردەهێنین و تەنیا هێما بۆ كۆمەڵێك زمانی لەیەكتر نزیكی ناو ناوچەیەكی جوگرافی دیاریكراو ناكەین ، بەڵكو مەبەست لە زمانێكی پێوانەیی رێزماندار و بڕیار لێدراوە[١١]. هەروەكو وتمان زمانە ئەوروپییەكان سەرەكین كە چەند سەدەیەكە بەردەوامن و بایەخی نیشتمانی و نەتەوەییان لە بواری بەكارهێنانی فەرمی پەیداكردووە و خەڵك ئەمەی بە نیشانەی نیشتمانی و بەهایەكی دیاری وابەستە بە نەتەوەكەوە وەرگرتووە[١٢].

ئەم حاڵەتەی زمان لە ناو سنووری نیشتمانی نەتەوەكەیدا، واتە بواری ناوچەیەكی جوگرافی دیاریكراو. بە زۆری ناسنامەی پێوانەیی بایەخپێدراوە لە ناو سنووری دەوڵەتێكی نەتەوەیی وەكو خۆی[١٣] .

**سیاسەتی زمان:**

سیاسەتی زمان کە لەلایەن دەسەلاتە جیاجیاکانی دنیاوە پەیڕەو دەکرێت، شێوەی جیاوازی گرتۆتە خۆی. چۆنیەتی ئەم سیاسەتەش بە شێوازی نهێنی جێبەجێدەکرێت. بۆچوونی چاودێرانی دەرەکی لەم رووداوە بەسەرهاتەدا تەنیا خواست و کێشەیە[١٤].

لەم سیاسەتەدا، هەر حکومەتێك، سیاسەتی خۆی هەیە، واتە سیاسەتی زمانی خۆی پەیڕەو دەکات. ئەم سیاسەتەش هەندێك جار جێگای رەزامەندیی هاولاتیانە و جاری واش هەیە، بە فشار و سەرکوتکردن وەردەگیرێت و هەندێك جاریش زەمانێك دەمێنێتەوە. دەسەلاتدارەکان (حکومەت) کەمینەی خۆی بەباشی ناگرێتە خۆی و توندو تیژی زۆریان لەگەڵدا بەکاردەهێنن. مەترسی کەسانێك کە بەهۆی زمانی خۆیەوە ، شێوازی (چۆنیەتی) بیری جیاوازی لەگەڵ حکومەتدا هەیە، شایانی هەستپێکردنە.

لەهەمان کاتدا حکومەتەکان سەبارەت بە ئامانجێکی وا هاوئاهەنگن، جێگای سەرسوڕمان نییە کە ئەمە راستییەکی بەڵگە نەویستە ، کە لە راگەیاندندا سەرچاوە دەگرێت (دەسپێدەکات) کە هەموو زمانەکانی دنیا لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی هەیە، نرخ و رەسەنایەتی و توانای یەکسانیان لە روونکردنەوەی بیری مرۆڤدا هەیە، هەرچەند کە هەموو کاتێك جوانی و ناسکی و واتایان یەکسان نییە.

سیاسەتی زمانی لەلایەن دەسەلاتی ناوەندەوە بڕیار دەدرێت[١٥]، هەموو کاتێك لەگەڵ سیاسەتی یەکێتی زمانی هاوڕا بووە و وەرچەرخانی چەندایەتی نەبووە.

ئەو سیاسەتە جیاوازییەی دەسەلاتە، کە لە بەرانبەر زمانی نەتەوەیی بندەست و کەمینەدا جێبەجێ دەکرێت وەکو زمانی پلەی دوو سەیر دەکرێن. بۆتە هۆی ئەوەی سنووری نیشتمانی لەگەڵ سنووری زماندا رێکناکەوێت و هەردەم هەوڵیانداوە سنووری بەکارهێنانی زمانەکانی نەتەوەکانی تر بەرتەسك بکەنەوە. تا بەهۆی ئەم رێگایەوە بتوانن رەگەزی نەتەوەکانی تر بەرەو کەمبوونەوە و وردە وردە لەناو سنووری زمانی و فەرهەنگ و کەلتووری نەتەوەیی خۆیان بیانتوێننەوە، تا زمان و فەرهەنگ و کەلتووری نەتەوەی دەسەلاتدار بالادەست

بێت. ئەم سیاسەتە لەلایەن دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکانەوە پەیڕەو دەکرێت بۆ نموونە وەکو تورکیا، ئێران و عێراق.

لە بەرانبەرا ئەم سیاسەتەشدا لەناو سنووری وڵاتە سیستەم دیموکراتەکاندا، سنووری بەکارهێنانی زمانی هەموو نەتەوەکانی سنووری وڵاتەکە بوونیان هەیە و، ڕێز لە فەرهەنگ و کەلتووری زمانیان گیراوە. ئەم حاڵەتە لە زمانەوانیی سیاسیشدا ڕەنگی داوەتەوە، لە ڕووی دیاریکردنی سنووری زمانی نەتەوەییەوە، مەبەست لە سنووری زمانی پێوانەییە (ستاندارد)، لە ڕووی ڕێکەوتن و ڕێنەکەوتنی سنووری نیشمانی و سنووری زمانەوە. ئەم حاڵەتەش لە لێکوڵینەوەدا دەکرێت لە ڕووی زانستییەوە بەناڕاست و نازانستی دابنرێت. چونکە ئەمە دەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی زمانی کەمینە و لە هەمان کاتیشدا کەمکردنەوەی نەتەوەی خاوەن زمانەکە. بۆیە دەبێت وەکو کار و لێکۆڵینەوەی زانستی دیاریکردنی سنووری زمان تەنیا لەسەر بنەڕەتی زمانی پێوانەیی (ستاندارد) ئەنجام نەدرێت. بەڵکو لەسەر بنەڕەتی بوونی زمانی هەر نەتەوەیەك بێت. لەبەر ئەوەی ئەگەر وانەبێت وردە وردە زمانی نەتەوەیی کەمینە لە لێکۆڵینەوە و وەسفکردنی زماندا لەبیردەکرێت و ناوی ناهێنرێت. باشترین نموونە بۆ ئەمە زمانی کوردییە چونکە زمانی دەوڵەتی نییە، یا باشتر بڵێین نەتەوەی کورد قەوارەیەکی سەربەخۆی دیاری وەکو بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی نییە فەرامۆشکراوە. لە سەرچاوە زمانییەکاندا بەکەمی ناوی زمانی کوردی لە لێکوڵینەوە زمانەوانییەکانی نەتەوەی تردا هێنراوە.

کەچی زمانی کوردی چ وەکو ئاخاوتن و چ وەکو زمانی نووسین و ئەدەبیات و جێبەجێکردنی پێویستی ژیانی ڕۆژانەی نەتەوەکەوە لە بواری جیاجیای ژیاندا بەکاردەهێنرێت ، لەلایەن زیاتر لە چل ملیۆن هاوڵاتی کوردەوە قسەی پێدەکرێت و لە بەشێکی زیاتری وڵاتی کوردا دەوری دوو سەد ساڵە زمانی نووسینی جۆراوجۆرە.

سنووری بەکارهێنانی زمانی کوردی دەکەوێتە ناو پێنج دەوڵەتی نەتەوە زمان جیاوازەوە. لە راستیدا ئەم سنوورە، سنوورێکی سیاسی دەسکردە، بۆتە هۆی دابڕان و پارچە پارچەکردنی وڵاتەکەی کە کوردستانە. ئەگەر بەپێی

لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان بێت لەم رووەوە نەك هەر زمانی کوردی رێکناکەوێت لەگەڵ سنووری نیشتمانەکەیدا، بەڵکو دەبێت هەر بوونی نەبێت. وەکو پێشتر وتمان لە سێ بەشی ولاتەکەی زمانەکەی لە ناو سنووری خۆیدا بەپێی دەستوور قەدەغەکراوە، رێگە نادرێت بە زمانی دایك تەنانەت لەلایەن کوردێکی زماننەزانەوە لە دادگاشدا بەرگری لەخۆی بکات.

لەم رووەوە زمانی کوردی بەگشتی لەناو پارچە دابڕاوەکانی لە یەکترەوە، هەریەکەی لە سنوورەکەی خۆیدا، کەوتۆتە بەر کاریگەری رۆشنبیری و کەلتووری و فەرهەنگی و زمانی نەتەوەی دەسەلاتدارەوە. ئەم حاڵەتە زاڵبووە بەسەر ئەم لایەنانەی زمانەکەیەوە. بۆیە دەبینین وشە و زاراوە و دەربڕینی زمانە جیاوازەکانی نەتەوەی دەسەلاتداری عەرەب، تورك و فارس زاڵە بەسەر زمانی کوردی لە ناو بەشە دابڕاوەکانیشدا. لە هەندێك حاڵەتیشدا، ئەم دیاردەیە لەناو سنووری بەکارهێنانی زمانی کوردیدا چەسپاوە. بۆ نموونە بە کاریگەری دەربڕینی زمانی عەرەبی ناوی نەسەب لە کوردیدا لە باشووری کوردستاندا وەکو عەرەبی دەردەبڕێن. وەك: فەرەنسی، ئەورووپی لەجیاتی فەرەنسایی، ئەورووپایی.

یا دواخستنی دیارخەر لەناوگرییەکی ناوی فراوانکراودا، وەك: مۆزەخانەی هەولێری شارستانی لەجیاتی: مۆزەخانەی شارستانی هەولێر بە کاریگەری عەرەبییەکەی کە ((متحف اربيل الحضاري))یە.

مدرسة مەم و زين الابتدائية کراوەتە قوتابخانەی مەم و زینی سەرەتایی لەجیاتی: قوتابخانەی سەرەتایی مەم و زین.

ئەمە بێجگەلە بەکارهێنانی هەندێك زاراوەی چەسپاو لەو زمانانەدا، بۆ نموونە لە باشووری کوردستاندا و لە ئاخاوتنی رۆژانەدا، ئەم وشە عەرەبییانە دەبینرێن: مطار/ طيارة، سيارە، خەستەخانە — مستشفى، شارع — اجتماعى، كليە، لوزتين، قولون ... هتد کە کوردییەکان بریتییە لە: فرۆکە، فرۆکەخانە، ترومبێل، نەخۆشخانە، شەقام، کۆمەلایەتی، گورچیلە، قورگ (گەروو — لینچەك)، کۆلۆن.

ئەم دیاردەیە لە بەشەکانی تری سنووری بەکارهێنانی زمانی کوردیدا هەیە وەك کاریگەریی زمان و فەرهەنگی فارسی و تورکی و روسی و ئازەری و .... هتد بەسەر زمانی کوردییەوە.

دیاردەی سیاسەتی زمانی جاری وا هەیە، بەشێوەیەك تۆخ دەبێتەوە، لە سنووری بەکارهێنانی وشە و دەستەواژەی زمـانی دەسـەڵاتدار تێپـەڕ دەبێـت و ئاستی دەنگسازی زمانی دووەمیش دەگرێتەوە. وەك ئەوەی دەنگی نامۆی زمـانی دەسەڵاتدار دەچێتە ناو پێکهاتە و وشەکانی زمانەوە، جێ بە دەنگە رەسـەنەکانی لەق دەکـەن و شـوێنیان دەگرنـەوە. بـۆ نموونـە وەك دەنگـی /ه/ زمـانی تـورکی شوێنی دەنگی /خ/ی کوردی دەگرنەوە. وەك لەم وشە کوردییانـە، کـە دەربڕینـی تورکییان گرتۆتە خۆیان یا لە وشەی تریشدا:

کوردی: خانم --- هانم لە تورکی

خەندان --- هەندان

مەسعود --- مەسود

قەدەر --- کەدەر

بەگۆڕانی (خ) بۆ (ه) و تێچوونی (ع) لە وشەی دووەمدا . دەربڕینی وشەکەی لە کوردییەوە گۆڕیوە بۆ تورکی .

بـەم پێیـە دەنگـی (ح، خ، ڕ، ڵ، ع، ...) کـە لـە کوردیـدا قەدەغـەکرابوون تەنانەت لە نووسینی تورکی لاتینیشدا چونکە کوردییە. ئەم حاڵەتە لـە سیاسـەتی زمانیدا، رووی جیاوازی زمانەکە دەگرێتـەوە وەك رێنـووس و دەنگسـازی، وشـەی فەرهەنگی و فەرهەنگ و تەنانەت گرێ و دەستەواژەش.

حاڵـەتێکی تـری ڕەگـەز پەرسـتی، کـە لـە سیاسـەتی زمـانی نەتـەوەیی دەسەڵاتداردا، جـەختی لێوەدەکـەن. دان نەنانـە بـە زمـانی نەتـەوەی بندەسـت و ژێردەسەڵات، بەوەی کە زمانەکەیان سەربەخۆن، وەك کوردی لە تورکیا بە تورکی شاخاوی و لە ئێرانـدا کـوردی زمـانێکی تـەواو و سـەربەخۆ نییـە، بەشـکو زارێکـی زمـانی فارسـییە. تۆخکردنـەوەی ئـەم دیاردەیـە، لـەوەوە سەرچـاوەی گرتـووە نەتەوەی کورد، دەسەڵاتی سەربەخۆی نییە، ئەم سیاسەتی زمانییە نـا دروسـتەی دەسـەڵاتدارە رەگەزپەرسـتەکان، لـە دوای سـاڵی ۱۹۹۱ ەوە خەریکـە وەکـو بەستەڵەکی بەرخۆر وردە وردە کاڵ دەبێتـەوە و بـەرەو کـزی و نـەمان دەچێت و گۆڕانی بەسەرداد‌ێت و پلانی نوێی زمانی دێتەکایەوە، بەتایبەتی لەو وڵاتانەدا.

### ڕێکەوتنی سنووری نیشتمانی و سنووری زمان:

سنووری نیشتمانی و سنووری زمانی گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەمەش بەندە بە بارودۆخی سیاسیی ولات و نەتەوەکە. بۆیە سنووری نیشتمانی بەکەمی لەگەڵ سنووری بنەڕەتی زماندا ڕێکدەکەوێت. ئەمەش بەهۆی جەنگ و مەسەلەی کۆچکردن و باری ئابووری و گۆڕانی کۆمەلایەتییەوە گۆڕانی بەسەردادێت و وەکو خۆی نامێنێتەوە.

بۆیە ئەم پەیوەندییەی نێوان زمان و نەتەوە و دەوڵەت ئالۆزە و پڕە لە گرفتی سیاسی و ڕۆشنبیری و زمانەوانی. ئەمەش ڕەنگدەداتەوە بۆسەر سنوور و زمان کە وەکیەك نەبن[١٦]. کەم زمانەوانیش هەیە ئەم ئالۆزییانە تێبگات. لێرەدا سنووری زمانی ڕەگەزی و ڕەچەڵەکی و سیاسی بە درێژایی سەدە و بەڕێگای جیاواز و هۆی جیاوازەوە پێدەگات.

ئەم جیاوازی و ڕێکنەکەوتنەی نێوان زمان و سنوور دەگەڕێتەوە بۆ تێپەڕاندنی بەکارهێنانی زمانی نەتەوەیی ولاتێك لە سنووری نیشتمانییەوە بۆ ناو ولاتی تر. دەکرێت لەم ڕووەوە ئەم حاڵەتەی نێوان زمان و سنوور بە نموونەوە ڕوونبکرێتەوە وەکو گرفتی ئالۆزی پەیوەندیی نێوان زمان و گەل و دەوڵەت ، لەم ڕووەوە دەتوانین حاڵەتی فەرەنسا و دەوڵەتانی ئەورووپا و ڕۆژئاوای دەوروبەرییەوە، بە نموونە بهێنینەوە. کە چۆن زمانی پێوانەیی فەرەنسی لە کۆماری فەرەنسادا، کە زمانی فەرمی و نەتەوەییە بۆتە بەستەکی بنچینەیی کە کۆمەڵی ڕۆشنبیری فەرەنسایی یەکخستووە، کە بۆتە جێگای شانازی بەخۆی و بە داب و نەریتە ڕەسەنەکەیەوە.

لێرەدا زمانی پێوانەیی فەرەنسایی، کۆمەڵێکی ڕۆشنبیری و کەلتووری و ڕەگەزیی هاوسۆز لە ناو سنووری ولاتی فەرەنسادا پێکهێناوە. لێرەدا سنووری نەتەوەیی و نیشتمانی لەگەڵ سنووری زماندا ڕێکەوتووە. کەچی سنووری بەکارهێنانی زمانی پێوانەیی فەرەنسایی، سنووری ولاتی تری بڕیوە و لەوێدا وەکو زمانێکی فەرمی بەکاردێت. کە ولاتی سویسرا و بەلجیکا و ولاتی سەربەخۆن، تیایاندا زیاتر لە زمانێك بەکاردەهێنرێن، واتە ولاتی فرەزمانن. دیسان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە هەموو هاوولاتی ئەو دوو ولاتە بە زیاتر لە زمانێك

قسەدەکەن. چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم زمانانە لە ولاَتەکەدا رادەی بۆ دانراوە، کە هەریەکەی بەشێوەیەکی یەکسان لە ناوچەی دیاریکراو پێگەی نیشتمانیی خۆی هەیە لەگەلَ زمانەکانی تر بەشێوەی فەرمی ، بەوەی ناوچە هەیە بە فەرەنسایی قسە دەکەن ، ناوچەش هەیە یا بە ئەلَمانی یا بە هۆلَەندی قسەدەکەن. ئەمەش لەگەلَ هەندێك جیاکەرەوەدا وەکو ئەوەی لە شارەکانی برۆکسل و فرایبورگدا هەیە. ئەم حالَەتەی لەو ولاَتەدا هەیە تارادەیەکی دوور لەگەلَ سنووری زمانیدا رێکدەکەوێت. کە خەلَکەکە لەهەر ناوچەیەکیدا وەکو پێویست بەتاکە زمانێك قسەدەکەن[١٧].

ئەم حالَەتەی کە بەهۆی زمان و سنوورەوە لە ولاَتێکدا بەرپا دەبێت ئەنجامی جیاوازی لێدەکەوێتەوە. بەوەی لە چی روویەکەوە زمان و سنوور لەناو ولاَتی زمانەکە و لە دەرەوەی ولاَتی زمانەکەدا رێکەوتن لە نێوانیاندا روودەدات و لە کوێدا بەشێوەیەکی جیاواز یا لە روویەکی ترەوە رێکەوتنیان هەیە. بۆ نموونە:

زمانی فەرەنسایی لە ناوچەی رۆژئاوایی سویسرایی بەکاردێ. لەبەرانبەر ئەمەشدا خۆیان وەك بەشێك لە کۆمەلَێکی فراوانی رۆشنبیر داناوە، کە لە رووی زمانەوە لەگەلَ کۆمەلَی فەرەنساییدا هاوبەشن ئەم حالَەتەش بەسەر ئەو سویسراییانەشدا رێکدەکەوێت کە بە ئەلَمانی و ئیتالَی قسە دەکەن. لە روویەکی ترەوە، ژمارەیەکی زۆری خوێندەواران لە بەلجیکادا، تا سەردەمێکی نزیك، بەرادەیەك لە خۆیان، وەکو بەشێك لە کۆمەلَگای رۆشنبیری فەرەنسایی ئەروانی و زمانی پێوانەیی فەرەنساییان بەکاردەهێنا. ئەگەرچی زمانی دایکیان شێوەیەکە لە شێوەکانی زمانی هۆلَەندایی لەبەشی باکوری ولاَتەکەیاندا[١٨]. شاعیرانی فلاندەری کە بەلجیکایین بە زمانی فلیمەنکی قسەدەکەن وەکو فیرهارن و مایترلنك کە تەنیا بە فەرەنسایی دەنووسن دەچنە ناو رەوتی داب و نەریتی رۆشنبیری فەرەنساییەوە، یا هەیە لە رووی رۆشنبیرییەوە خۆیان بە هۆلَەندایی دادەنێن، لەگەلَ سەرکەوتنی بزووتنەوەی فلاندەری لە بەلجیکادا، ئەم بینشە (تێروانین) رەزامەندی جیهانی وەرگرت. کەچی ئێستا هۆلَەندایی زمانی فەرمییە لە هەموو فەرمان و کارە بایەخدار و گرنگەکاندا، بەلاَم فەرەنسایی لە هەرێمەکانی باشوور و لە برۆکسلدا شانبەشانی هۆلَەندایی پێگەیەکی فەرمی هەیە[١٩]. کەواتە لێرەدا سنووری نیشتمانی و سنووری زمانی نەتەوەیی لەگەلَ یەکتردا رێکەوتوو نین.

کـارێکی بــه ســوود دەبێـت لــه رووی ڕێکـەوتن و ڕێنەکـەوتنی سـنووری نیشتمانی و نەتەوە لەگەڵ سنووری زمانی نەتەوەیی ( زمانی فـەرمی و سـتاندارد) بەنموونە بهێنینەوە. لە گرۆندوکیای لوکسمبۆرگ لە ئیش و کارە بـە نـرخ و یـا لـە فەرمانە گرنگەکانـدا، زمـانی فەرەنسـایی زمـانی نیشـتمانییە، ئەمـە بێجگەلـەوەی زمانی ئەڵمانیایی پێوانەیی (ڕێزمانی) بەشـێوەیەکی فـراوان لـە هەڵوێسـت و کـارە کەمتر فەرمییەکاندا بەکاردەهێنرێت. کەچی لەگـەڵ ئەوەشـدا زمـانی یەکـەمین بـۆ هەموو دانیشتوان زمانی لوکسمبۆرگییە. ئەم زمانـە تایبـەتێتی نیشـتمانی هەیـە و بەشێوەیەکی گرنگ و بایەخداری ڕێزمانی و پێوانەییە و کارەکـانی خـۆی دەباتـە ڕێـوە و نـاکرێ پشـتگوێ بخرێت. بۆیـە هێمایـەکی دیـار و روونـی بـۆ ناسـنامەی رەگەزی و نەتەوەیی هەیە ، ئەگەرچی قسـە پێکـەرانی هەسـت بـە نزیکبوونـەوەی رۆشنبیری لەگەڵ ئەو ناوچانەدا دەکەن، کە بە فەرەنسایی و ئەڵمانی قسە دەکەن و هەردووکیانیش بە زمانی پێوانەیی وەکو زمانی نیشتمانی قسـە دەکـەن. لەگـەڵ ئەم حاڵەتەشدا هێزی ئەم پەیوەندییانە بە ئاسایی لاوازە بەهۆی ئـەوەی ئـەم دوو زمانە لەبواری فێرکردندا وەریانگرتووە نەك وەکو زمانی دایك[٢٠].

ئەگـەر ناوچـەی تـری جیـاواز بـۆ ئـەم ڕێکـەوتن و ڕێنەکەوتنـەی سـنووری نیشتمانی و سنووری زمـان وەربگـرین پێچـەوانە بارودۆخەکـەی فەرەنسـایە. وەك کەرتی ڤالی د — ئوستای ئیتالی، زمانی نیشتمانی فەرمی لەوێ لە هەموو کاروبار و بــەڕێوەبردن و کــارە گرنگەکانــدا بــە ئاســتێك بــەکاردێت ســنووری ناوچــەکەی تێپەڕانــدووە ئــەویش زمــانی ئیتالیــایی پێوانەییــە و زمــانی نــاوخۆیی وەکــو شــێوەیەکی بــەکارهاتوو بنــەڕەتی زارە فەرەنســاییەکانە ( یــا فەرەنســایی — پرۆفێشناڵ). لێرەدا زمانی فەرەنسـایی پێوانـەیی بـە فـەرمی شـوێنێکی نـاوخۆیی وەرگرتووە و لەگەڵ زمانی ئیتالیادا بەشـێوەیەکی یەکسـان بـەکاردێت. بـەم پێیـە دانیشـتوانە بنەڕەتییەکـە، لێـرەدا سـەر بـەدوو گربوونـەوەی زمانییـە هەرچـەندە ئەمانە لە بنچینەدا بە رەگەز و بە رۆشنبیری ئیتالیایین[٢١].

هــەروەها لــە دوورگــەی کــەناڵ ( Channel Island) کــەناڵی بــەریتانیادا، هەرچەندە شێوە بنەڕەتییەکە زاری نۆرماندی فەرەنساییە، کەچی نە ئـەم زارانـە و نە زمانە فەرەنساییە پێوانەییەکە ( ڕێزمانی و دەسـتووری) بـەهیچ شـێوەیەك

پێگەیەکی فەرمی نییە و بەڵکو زمانی ئینگلیزی لە هەموو کاروبارێکی بە نرخ و فرمانە گرنگەکاندا بەکاردێت و زارەکانی زمانی فەرەنسایی لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانییەوە بەهۆی کۆچکردنە گەورەکانەوە لە بەریتانیا پاشەکشەیانکردووە. تەنیا بەکارهێنانی بەندە بە حاڵەتی خێزانییەوە لە نێوان دانیشتوانە لادێییەکانەوە، کە هیچ هەستی پابەندبوونیان بە ڕەگەزی فەرەنساییییەوە نییە.

هەرچەندە لە فەرەنسادا، زمانی فەرەنسایی پێوانەیی تاکە، کە فەرمیبوونی هەیە، کەچی یەکەم زمان و تاکە زمانیش نییە بۆ بەشێکی گەورەی دانیشتوان. دەبینین شێوەیەك لە زمانی هۆڵەندی لە فالندەری فەرەنسا و شێوەیەکیش لە ئەڵمانیایی لە ئەلزاس و باکوری لۆرین بەکاردێت و لە ڕۆژئاوای بەریتانی ناوچەیەکی باکوری ڕۆژئاوای فەرەنسا بە بەریتانی دەدوێن. زمانی باسکیش لە ڕۆژئاوای بایرینیز باشووری ڕۆژئاوای فەرەنسا بەکاردێت و کاتەلانیش لە ڕۆزیلون لە باشووری فەرەنسادا هەیە. ئەم جۆر و شێوە زمانانە هیچیان شێوەی فەرمییان وەرنەگرتووە. کاتێکیش کە ئەم شێوە زمانانە وابەستەیە بە کۆمەڵگایەکی فراوانی زمانەوە یا بە زمانێکی پێوانەیی نیشتمانی یا ناوخۆیی و ڕۆشنبیریی جیاواز و دەرەوەی سنووری فەرەنسا و بەشێوەیەکی سەرەکی قسە پێکەرانی ئەم زمانانە خۆیان بە بەشێك لە نەتەوەی فەرەنسا لە ڕووی ڕەگەز و ڕۆشنبیرییەوە دادەنێن. لە بەرانبەریشدا هەستکردن بە پابەندبوون بە کۆمەڵگایەکی زمانی ترەوە، ئەمە بێجگە لە کۆمەڵی فەرەنسایی کە بەشێکن لە ناسنامەی هەرێمێکی جیاواز لە ناو فەرەنسادا[٢٢].

هەروەکو وتمان پەیوەندی جوگرافی نێوان زمان و دەوڵەت و نەتەوە و ڕۆشنبیری تا بڵێی ئاڵۆزە، لەبەر ئەوەی سنووری ئاشکرا و دیار، بەشێوەیەکی بنەڕەتی ڕێکناکەوێت تەنیا لەگەڵ زمانی نەتەوەیی و زمانی هەرێمەکاندا، کە ئەم زمانانە تیایاندا بەشێوەیەکی فەرمی بەکاردێت. سنووری زمان و ڕەگەز و سیاسی لەیەکتر جیادەبنەوە، چونکە سنوور لە ئەنجامی بارودۆخێکی مێژوویی جیاوازەوە دانراوە. بۆیە پێویستە لێرەدا، ڕێکەوتن و ڕێکنەکەوتنی سنووری نیشتمانی و سنووری زمان، لەگەڵ زاراوەی زمانێك کە لە چەند زارێکی لەیەکتر نزیکەوە

پێکهاتووە. چونکە جۆری یەکەمیان لە سنووری دیاریکراودا تێپەڕناکات، کەچی هەرچی جۆری دووەمی زمانەکەیە کە پێوانەیی و ستاندارد نییە، سنووری دەوڵەتی نیشتمانی تێپەڕ دەکات وەکو ئەوەی لە ئەورووپادا باسمانکرد.

ئەم مەسەلەیە تا بڵێی بابەتێکی ئاڵۆزە و تا ئێستا چارەسەر نەکراوە، واتە لە حاڵەتی بوونی شێوەی زمانی لەیەکتر نزیك و هاوڕەگەزەوە، کە بە شێوەیەکی قووچەکی (هەڕەمی) لە چەند زارێکی جیاوازی سەر بەهەمان زمانەوە پێکهاتووە.

لەم رووەوە حاڵەتەکە تەواو جیاوازە لەیەکتر، چونکە ئەو زمانانەی کە لە رووی جوگرافییەوە لەیەکتر جیاوازن، سنوورێکی ئاشکراو دیار لە نێواندا هەیە. لە کاتێکدا ئەم زمانانە بە تەواوی لەیەکەوە دوورن و لەیەکتر ناچن وەکو ئەوەی لەنێوان ئەو زمانانەی کە خزمەتیان لاوازە. وەکو پەیوەندیی نێوان ئەڵمانیایی و سلۆڤینی یا تەنانەت لە نێوان ئەڵمانیایی و دانیمارکیدا هەیە. ئەمە بۆ ئەو زمانەی کە لە شێوە زاری جیاواز پێکهاتووە، یا لە یەکترەوە نزیکن سنووری جوگرافی نیشتمانی لە نێوانیاندا دیار نییە و رێکناکەوێت و ئاشکرا و دیار نییە. چونکە دابەشبوونێکی زمانیی دیار لە نێوان زارەکانی زمانێکدا لەم دیو و ئەودیوی سنووری سیاسییەوە بەدی ناکرێت[٢٣]. بۆ نموونە زارەکانی کە لە دەوروبەری ناوچەی زانتنی سەر رووباری راینی خواروو هەیە جیاوازی نییە وەکو ئەوەی کە لە چەند میلێکی کەمەوە لێوەی دوورە، کە لە ناوچەی نایمیگاندا هەیە، ئەمە تەنیا لە شتی کەم بایەخدا نەبێت، کە گرنگی نییە، سنووری سیاسیش لەگەڵ سنووری تایبەتێتی زمانێکی سەرەکی بەتەنها خۆیدا رێکناکەوێت.

بە کورتی زارە لەیەکتر نزیکەکان لە رووی جوگرافییەوە لەهەمان ناوچەدا بەشێوەیەکی زۆر لەیەکتر دەچن، بەڵام زارە دوورەکان لە رووی جوگرافییەوە بەشێوەیەکی زۆر لە حاڵەتی زۆر کەمدا نەبێ لەیەکتر تێناگەن[٢٤].

دیاردەی جیاکردنەوەی زمان و زار بەشێوەیەکی جیا بەندە بەلایەنی بنەڕەتی جوگرافی سیاسی و رۆشنبیرییەوە.

ئەم بابەتەش کە دیاریکردنی سنووری بەکارهێنانی زمانە، بەشێکە لە جوگرافیای زمان، نەك زمانەوانی جوگرافی، چونکە وەك دەردەکەوێت گرنگی

بەلایەنی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتی زمان لە ژیانی مرۆڤ دەدات زیاتر لەوەی بایەخ بە زمانەوانی بدات[٢٥].

دیاریکردنی سنووری جوگرافی زمان بایەخ بە زمان و سنوور دەدات. لەم رووەوە و بەشێوەیەکی زانستی و ورد، بەپێی تێڕوانینی بۆ سنووری بەکارهێنانی زمانەکانی جیهان، بەتایبەتی زمانە ئەوروپییەکان، وەك زمانی پێوانەیی لێکۆڵینەوە و لەم بارەیەوە ئەنجامدەدات. واتە دیاریکردنی زمانی سەرەکی و لاوەکییەکان و دیاریکردنی بەکارهێنەرانی زمانی کەمینەکان، یەکێکن لە ئامانجەکانی جوگرافیای زمان[٢٦].

## چۆنیەتی پەیوەندیی زمان
## بە سنووری بەکارهێنانیەوە (سنووری جوگرافی):

لێرەدا باس لەو سنوورە جوگرافییە دەکرێت کە زمانێك تیایا بەکاردێت. واتە پەیوەندی لە نێوانیاندا پەیدادەبێت. ئەوەی لێرەدا سەرنجڕاکێشە، ئەوەیە ئایە شوێنی سنووری جوگرافییەکە پەیوەندی بە زمانە بەکارهێنراوەکەوە، لە رووی رەگەزی خەڵکەکەیەوە هەیە یان نا؟

بە زۆری زمان لە ناو خودی خەڵکێکەوە بەکاردێت، کە هی خودی خۆی بێت و لە ناو خودی کۆمەڵگای نەتەوە و نیشتمانەکەیەوە سەری هەڵدابێت و لە ئەنجامی گەشە و گۆڕانی مێژوویی کۆمەلەکەوە گەیشتبێتە ئاستی بەکارهێنانی رۆژگاری خۆی. لێرەدا مەبەست لەوەیە هەر زمانەی لەلایەن خاوەنی زمانەکەوە لەناو نیشتمانی خۆیدا بەکاردەهێنرێت.

بەم جۆرە پەیوەندی لەنێوان سنووری نیشتمانی شوێنی زمانەکە و کە لەلایەن نەتەوەکەیەوە بەکاردەهێنرێت کە مەودا قەڵەمڕەوی بەکارهێنانیەتی پەیدادەبێت. لێرەدا رێکەوتن لە نێوان سنووری نیشتمانی و سنووری زمان روودەدات. ئەمە بێ ئەوەی زمانی ستاندارد و زمانی ستاندارد بێت هەر هەمان مەبەستی رێکەوتن و پەیوەندییە، چونکە شێوە زمانیش جیا نابێتەوە، لە زمان بەگشتی. بەڵام دواتر بەهۆی گۆڕانی سیاسی، مێژوویی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری و ئابوورییەوە گۆڕانی بەسەردا دێت، بەهەردوو رووی ئەوەی لە سنووری خۆی

دەردەچێت و قەڵەمڕەوی وڵات و نەتەوەکەی دەبەزێنێت لێرەدا سنووری نێوانیـان ڕێك ناکەوێت.

جاری واش هەیە بـە پێچـەوانەوە، بـەهۆی سیاسـی و ڕووداوی مێژووییـەوە زمانی نەتەوەیی لەناو خودی میللەتەکەیدا قـەتیس دەمێنـێ و قەدەغـە دەکرێـت. هەشە پەیوەندی نێوانیان واتە پەیوەندی سنووری نیشتمانی ڕێکدەکەوێت لەگـەڵ سنووری بەکارهێنانی زمانەکەدا.

## جۆرەکانی ڕێکەوتنی سنووری نیشتمان و سنووری زمان:

لێـرەدا سـێ جـۆر پەیوەنـدی ڕێکـەوتن و ڕێکنـەوتن لـە نێـوان نیشـتمان و زمانەکەیدا هەیە، کە بریتییە لە:

١- ڕێکەوتنی سنووری نیشتمانی زمان.

٢- ڕێکنەکەوتنی سنووری نیشتمانی و سنووری زمان.

٣- قەدەغەکردنی پەیوەندی سنووری نیشتمان و سنووری زمان.

نموونە بۆ جۆری یەکەم لە ڕێکەوتنی دیاردەی سنووری نیشتمانی و سنووری زمان، دەبینرێ تاکە میللەتێك، کە لەناو سنوورێکی سـەربەخۆی سیاسـیدا کـە بـە تاکە زمـان قسـەدەکەن وەکـو ئـەوەی کـە لـە هەنـدێك وڵاتـانی ئـەفریقیای شـێواز خێڵەکیدا هەیە[٢٧].

لە نموونەی ڕێنەکەوتندا نموونە زۆر هەیە، وەك زمانی فەرەنسـایی پێوانـەیی لە سنووری نیشتمانی خۆیدا دەرچووە و لە ناو سنووری وڵاتـانی تـردا بـەکاردێت، وەك لە سویسرا و بەلجیکادا[٢٨]. یا زمـانی ئینگلیـزی لـە هیندسـتان و لـە هەنـدێك وڵاتـی ئەفـەریقیا و زمـانی عـەرەبی لـە وڵاتـی تـری ئەفـەریقیادا[٢٩] بـەهۆی بـاری ئاینییەوە بەمەبەستی گەیاندنی پـەیامی ئـاینی ئیسـلام لـەو وڵاتانـەدا[٣٠]، بێجگـە لەهۆی بەعەرەبکردن و گۆڕینیان.

جۆری سـێیەم لـە نەهێشـتن و قەدەغـەکردنی زمـان و پچـڕاندنی پەیوەنـدیی میللەت بە زمانەکەیەوە. وەك زمانی کوردی، زمانی نەتەوەی کورد لەناو سـنووری گـەورەو فراوانـی کوردسـتاندا. زمـانی کـوردی بەهـەموو شـێوەکانییەوە، زمـانی

پەیوەنـدیی کـورد بـووە لـەناو وڵاتەکەیـدا. لـە ڕووی پەیوەندییانـەوە پێچـەوانە دەردەچێت.

ڕوونکردنەوەی ئەم حاڵەتەی زمانی کوردی، بۆ ڕێکەوتنی سنووری نیشتمانی و سـنووری زمـانی کـوردی، دەگەڕێتـەوە بـۆ هـۆی سیاسـی، کـە خـۆی لـە بەرژەوەنـدیی نێودەوڵـەتی وڵاتـە زلهێزەکانـدا بـە درێـژایی مێـژووی نەتەوەکـەی دەبینێتەوە. ئەویش بە بڕیاری سیاسی نێودەوڵەتی، نیشـتمانی کوردیـان لەیـەکتر دابڕی و، کردیان بە پێنج پارچەوە. دابەشیانکرد بەسەر پێنج وڵاتی زلهێـزی چـوار نەتەوەی زمان جیاوازی وەك عەرەب، تورك، فـارس و روسـدا. لێـرەدا کۆمەڵگـەی فراوانـی زمـان و نەتـەوەی کـورد کـە خـۆی لـە کـەلتوور و فەرهـەنگ و زمـانێکی هاوبـەش دەنوانـد لەیـەکتر دابـڕاو، پارچـە پارچـەکراو، کەوتـە بـەر کاریگـەریی کۆمەڵگەی فراوانی زمانی نەتەوەیی دەسـەڵاتدارانی ئـەم نەتەوانـە و، خۆیشـی لـە کاریگەریی کەلتووری و فەرهەنگی و ڕۆشنبیری دەبینییەوە.

لێرەدا بارودۆخی زمانی کوردی لەناو سنووری سیاسی ئـەم وڵاتانـە بـەجۆری جیاواز خۆی دەنواند. بۆ نموونە:

لە باشووری کوردستانی لکێنراو بە عێراقەوە، بەفەرمی داننرابوو بـە بـوون و بەکارهێنانی زمانی کوردییەوە، کـە لـە قوتابخانـەی سـەرەتایی و لـە ڕاگەیانـدن و ئەدەبیاتـدا، شـێوەی هەڵکشـان و داکشـانی بەدرێـژایی ئـەو ماوەیـە بەخۆیـەوە بینیـوە، ئـەویش لەهـەموو ناوچـەکانی ئـەم بەشـەی کوردسـتانیش نـا، بـەڵکو لـە سنووری پارێزگایەك یا زیاتر. ئەمەش بەپێی گۆڕانی بارودۆخی سیاسی ئەم بەشـە مەودای سنووری بەکارهێنانی زمانی کوردی بەرەو فراوانی چـووە و بـواری جـۆری بەکارهێنانیشـی گـۆڕاوە و بـەرەو فراوانـی چـووە و ئاسـتی قۆناغـە جیاجیاکـانی خوێندن و ڕۆژنامەگـەری و کارگێڕیشـی گرتۆتـەوە. بـەڵام ئـەم بارودۆخـە، هـەموو هەرێمە کورد زمانەکـەی ئـەم بەشـەی کوردسـتانی نەگرتۆتـەوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا سنووری بەکارهێنانی زمانی کوردی، لەگەڵ ئـەم بەشـەی نیشـتمانەکەیدا هـەردەم بەشێوەیەکی زمانی، کە کوردی ناوەڕاستە بەرەو هەڵکشان و فراوانبوون هەنگاوی نـاوە. تـا گەیشـتە ئـەوەی لـە بـواری جیاجیـای پێویسـتی ژیـانی میللەتەکـەدا بەکاردەهێنرێت وەکو هەر زمانێکی پێشکەوتووی میللەتانی وڵاتـان. بـەڵام هێشـتا

لێرەشدا، سنووری نیشتمانی ڕێنەکەوتووە لەگەڵ سنووری زمانەکەدا. لەبەر ئەوەی باری سیاسی لەم بەشەی کوردستاندا، ناوچەیەکی ڕەسەنی کوردی کە بە عەرەبکراوە، زمانی کوردی لە هەندێك شوێنی ئەم بەشەیشدا تەنیا زمانی ئاخاوتنە.

کەواتە لەم بەشەدا، زمانی کوردی سنووری بەکارهێنانەکەی لەگەڵ سنووری نیشتمانەکەیدا، ڕێکنەکەوتووە. ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کە لە وڵاتانی ئەورووپا، یا لە شوێنی تری هەیە.

ڕێکەوتنی سنووری نیشتمانی، لەگەڵ سنووری زمانی کوردی، لە بەشەکانی تری کوردستاندا، وەکو رۆژهەلاتی کە بەدەم ئێرانەوەیە و، باکور و رۆژئاوایشی کە دراوەتە دەم تورکیا و سوریاوە. نەك لە رووی زمانی پێوانەییەوە، بەڵکو لە رووی ئاخاوتنی ژیانی رۆژانەوەش بۆ راپەڕاندنی کاروبارو پێویستییەکانیش سنوورەکەی ڕێنەکەوتووە. چونکە بەپێی دەستوور و یاسای نەتەوەی دەسەڵاتدار، زمانی کوردی لەو دوو بەشەدا قەدەغەکراون و سزای یاساییشی خراونەتەسەر.

هۆی ئەم ڕێکنەکەوتنەش دەگەڕێتەوە، بۆ سیاسەتی رەگەز پەرستانەی دەسەلاتدارانی نەتەوەی دەسەلاتدار، لەم بەشەی نیشتمانی دابڕاوی کوردا، کە بەشێکە لە سیاسەتی زمانی.

هەر ئەمەش وایکردووە، بە فەرمی، کۆمەڵی کورد لەم بەشەی وڵاتەکەیدا، بکەوێتە بەر کاریگەری سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و رۆشنبیری کۆمەڵی فراوانی زمانی تورکی و عارەبی، لە سنووری نیشتمانی وڵاتی تورکیا و سوریادا. کە دەیانەوێت زمانی کوردی و کەلتوور و فەرهەنگی کوردی لەناو ئەو سنوورە زمانییەی وڵاتی خۆیان بە سیاسەتی رەگەزپەرستی تاکزمانی بتوێنێتەوە. لە یەکێتی سۆڤێتیشدا بێجگە لە ئەرمەنستان و ئێرانیش و بارودۆخی زمانی کوردی لەو دوو وڵاتە فرە زمانەشدا بەر شالاوی رەگەزپەرستی کەوتوون و زمانێکی پەراوێزخراوبوونە.

بۆیە لەهەموو حاڵەتێکدا ناتوانرێ بڵێین سنووری سیاسی دەقاودەق دەبێت لەگەڵ سنووری زمانیدا. هەرچەندە زمان رەگەزێکی سەرەکییە، لە پێکهاتنی هەر گەلێك لە گەلانی سەر زەویدا[٣١]. بۆیە لەسەر رووی زەمیندا نەتەوەیەك نییە،

زمان نەکاتە بنچینەیەك بۆ یەکگرتنی نێوان خەڵکەکەی، ئیتر لە توانادا نییە بتوانرێت، پێگەی زمانێکی دیاریکراو لە پێگەی میللەت دەقاودەق بکرێت. تەنها لە تواناداىە لەسەرەتای لێکۆڵینەوەی زمانیك یا زارێکدا، کۆمەڵە زمانێك دیاریبکرێ کە بتەوێت لێکوڵینەوە لەسەر زمانەکەی بکرێت[٣٢].

بابەتی زمان و سنوور بابەتێکە، پەیوەندی بە سیاسەتی دەوڵەتەوە هەیە. بۆ بڕیاردان لە رووی بەکارهێنانی زمانێکەوە لەناو سنووری ولاتێکدا. بەوەی چ زمان و کام زمان ببێتە زمانی پێوانەیی و دەستووری. بەتایبەتی لە ولاتی فرەزماندا، یا هەر ولاتێك زیاتر لە زمانێکی هەیە، کە زمانی میللەتی جیاوازە لە رووی کەلتوور و فەرهەنگ و رۆشنبیرییەوە.

ئەمەش بەندە بە زمانناسی سیاسییەوە، وەك بابەتێك لە روانگەی سیاسییەوە، وەك بابەتێك لە روانگەی سیاسییەوە دەڕوانێتە زمان و لێکۆڵینەوەی زمانەوانی. وەك بابەتێك لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا هاتەکایەوە[٣٣].

لەهەر ولاتێکدا سیاسەتی زمان بەدی دەکرێت. ئەم سیاسەتە، بەندە یا بەهەستی نەتەوایەتی، یا بەرژەوەندیی ئابوورییەوە، دووەمیان بە زۆری لە ولاتانی فرە زمان یا ئەو ولاتانەی کە دەستیان بەسەر ولاتی تردا دەگرن بەهەر هۆیەکی سیاسی و ئابووری یا بەهۆی سیاسەتی فراوانکردنی سنووری حوکمڕانییەوە بێت. لەم حاڵەتەدا یەکەم شت ولاتی داگیرکەر بیری لێدەکاتەوە، سیاسەتی قەدەغەکردنی زمانی نەتەوەی دووەمە، یا پەراوێزی دەکات. ئەمە لە سیاسەتی کۆنی ولاتی زلهێز و سەرمایەدار و داگیرکەر پەیڕەو دەکرا. بۆ نموونە وەك لە جەزایر لەلایەن فەرەنسا‌وە، یا لە ولاتانی ئەفەریقیا و هیندستاندا، زمانی فەرەنسایی و ئینگلیزی دەبووە زمانی فەرمی و دەستووری و پێوانەیی. زمانە ناوخۆیی و نەتەوەییەکانی ناو ولاتەکان یا قەدەغە دەکرا، یا پەراوێز دەخرێت، یا وەکو زمانێکی ناوخۆیی لەناو کۆمەڵدا، بۆ کڕین و فرۆشتن و پەیوەندی کردنی رۆژانەیان بەکاریدەهێنن.

هەر ئەم بارودۆخەیە، سیاسەتی زمانی هێنایەکایەوە، دواتر بوو بە زانستێکی سەربەخۆ لە نیوەی دووەمی سەدەی رابردوودا. هەر وەکو پێشتر هێمایان بۆکرد.

بەکورتی سیاسەت و زمان و پەیڕەوکردنی، بەپێی جۆری سیاسەتی وڵات و بوونی ژمارەی زمان لە وڵاتەکاندا، بەدیدەکرێت. سنووری بەکارهێنانی زمان بەرتەسك یا فراوان دەبێت. چ بۆ زمانی ناوخۆیی و وڵاتی ژێر دەسەلأت و، چ بۆ زمانی بالأ دەست و دەسەلأتدار. لێرەدا ئەم حاڵەتە دەخەینە روو:

**چۆنیەتی زمان و سیاسەت:**

١- لەو وڵاتانەی کە فرە دانیشتوان و فرە نەتەوەیە، بەزمانی جیاواز قسەدەکەن. ئەشێ و ئەتوانرێت زیاتر لە زمانێکی پێوانەیی (دەستووری و فەرمی) هەبێت و پێویست بێت[٣٤].

لەم وڵاتانەدا بە زۆری خاوەنی زمانی فەرمین، کە دەسەلأت ئەم زمانە نەتەوەیی و ناوخۆییانە بەفەرمی دەناسێت وەکو کەنەدا کە زمانی فەرەنسایی و ئینگلیزی فەرمین، لە فیلەندا زمانی فیلەندی و سویدی زمانی فەرمین، لە بەلجیکا فەرەنسایی و فلاندەری (هۆڵەندی) بەفەرمی ناسراون.

کاتێك زمانی کەمینە زۆرەکانی وڵاتەکەش، پێگە و شوێنی فەرمی قەبوڵکراویان هەیە. وەکو لە شەقام و و ڕێگاوبان و لە قوتابخانە و کارگێڕە ناوخۆییەکاندا، پێگەیان هەیە و سوودبەخشن بۆ ئەم جۆرە نموونە خودموختارییەی زمانی ناوخۆیی، وەکو زمانی ئینوئیتی لە کەنەدا، یا زمانی سمی (لپی) لە نەرویج و زمانی روومانیش لە سوئێس[٣٥].

لە وڵاتانی پێشکەوتوو کە بایەخدراوە بە مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت تیایدا جێگیرە ، ئەم سیاسەتی زمان کە باسمانکرد پەیڕەو دەکرێت، کە سنووری زمانی ناوخۆیی لەناو سنووری بوونی کەمایەتییە زمانییەکەدا بوونی هەیە[٣٦]. واتە لە سنوورێکی ناوخۆییدا. لەم شوێنانەدا زمان پەراوێز ناخرێت.

زمانی ئینگلیزی کە بۆتە زمانێکی نێودەوڵەتی بۆ پەیوەندیکردن، بە زۆری لەو وڵاتانەدا بەمەترسی، بۆ زمانە رەسەنەکان دەزانرێت.

لەم ڕووەوە، لەو وڵاتانەی کە خەڵکێك کە ئینگلیزی بە زمانی دووەمی ئەوان دادەنرێت و زۆرتر بۆ پەیوەندیکردنی نێوان خۆیان سوودی لێدەبینن. دەسەلأتی وڵاتەکانیان بەمەبەستی پێشگرتن لە بەینچوونی زمانە رەسەنەکانی خۆیان

بەکارهێنانی زمانی دەرەکی بۆ نموونـە ئینگلیـزی کەمدەکەنـەوە، یـا بـە خـورتی کردنی سوودوەرگرتن لە زمانی ڕەسەنیان[٣٧] وەکو کیك و فەرەنسی کە لە کەنـەدا زمانی ئینگلیزی لە بەرانبەردا کەمدەکەنەوە و زمانی فەرەنسایی لە کاری بازرگانی و پیشەسازیدا هاندەدەن.

٢- لە وڵاتانی چەند زمانیدا: میللەتانی جیهان لە رووی بارودۆخی زمانی زۆر و جۆر بەجۆرەوە، کە لە وڵاتێکی وەکو ئایسـلەندە و پورتەگالـدا بوونیـان هەیـە، لەوێدا تا رادەیەك هەموویان بە یەك زمان قسەدەکەن. ئەگەرچی ئـەم بارودۆخـەی زمان بەچەند وڵاتێکی تاڕادەیـەك بچـووك و ژمـارەی کـەم دەبێـت. بـەڵام بـەزۆری ئەمریکاییـەکان ئـەم بـارە بـە ئاسـایی دادەنـێن. لـە وڵاتـانی وەکـو نەتـەوە یـەکگرتووەکان و ئیسـپانیا هەیـە کـە بـە زۆری یـەك زمانیـان تێدایـە، بـە زۆری خەڵکەکە قسـەی پێدەکـەن یـا هیندسـتان کـە بیسـت و چـوار زمـانی بنچـینەیی و سەدەها زمانی لابەلایان ((فرعی)) هەیە[٣٨].

٣- بـارودۆخی زمـانی میللـەتانی جیهـان جیـاوازن و سیاسـەتی زمـانی ئـەم میللەتانەش جۆراوجۆرە. یەکێك لەم سیاسەتانە کە باوترینیانە ئەویش بـە فـەرمی ناسینی تەنیا یەك زمانە بە ئامـانجی کـارگێڕی و پـەروەردەیی، واتـە لـە سـنووری وڵاتەکەدا یەك زمان بەکاردێت. وەکو لە ئەڵمانیای رۆژهەلات، مالیزیـا، سـەنیگال و زۆری تری وڵاتان. بۆ نموونە لـە ئـەڵمانیای رۆژهـەلات بـە زۆری زمـانی دایـك واتـە ئەڵمانییە، لـە مالیزیـا زمـانی دایـك گـەورەترین بەشـی نەتـەوەی وڵاتەکـە، زمـانی بەهاسا مالاییە، لە سەنیگال زمانی دایك لە ٩٠٪ ی دانیشتوان زمانی ولوفە[٣٩].

لە وڵاتە یەکگرتووەکان زمانی دایك زۆربەی زمـانی ئینگلیزییـە و ئینگلیـزیش زمانی میللییە. هەرچەندە لەم وڵاتەدا یاسای پاراستنی کەمینەکان پارێزراوە و لـە قوتابخانەکانیدا دەبێ و بۆ پەروەردەی منالآنی غەیرە ئینگلیز زمان، بەشـێوەیەك بەرنامەڕێژی بۆ کراوە، زمانی دایك کە جۆراوجۆرە لەوێدا بە نەزەر وەرگیراون.

٤- کەنـەدا و بـەلجیکا و چیکوسـلوڤاکیا سیاسـەتی بـەکارهێنانی دوو زمـان بەشێوەیەکی یەکسان پەیڕەودەکەن. ئەگەرچی ئەم سیاسەتە زیاتر لەقسـەکردندا پەیڕەو دەکرێت تا لە کارکردندا.

له کۆماری ئەفـەریقیای باشـووردا ئـەم جـۆرە سیاسـەتەی بـەکارهێنانی دوو زمانە، ئینگلیزی و ئەفریکانی، زامنی دایکی کەمینەیەکی بچووك زمانی کۆمـەلگای ولاتە، شوێنیش تاکە ولاتە، کە سیاسەتی یەکسانی زیاتر لە دوو زمان، ئـازمودە و ئالمانی، فەرانسە و ئیتالیایی شێوەی یەکسانیان لەو دوو ولاتەدا هەیـە. ڕۆمـانیش کە زمانێکی ڕۆمانییە، بەهایەکی یاسایی هەیە هەرچەندە سنوورداریشە.

٥- لە ولاتانی وەکو یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەت، هیند و فلیپین کە لەوێدا تاقمی گەورە بە زمانی جۆراوجۆری زۆر قسەدەکەن، سیاسـەتی زمـانی نەتـەوەیی - زمانە ناوخۆییەکان هەڵدەبژێرن. لەم حاڵـەت و دۆخـەی یـەك زمانیـدا بـە زۆری گـەورەترین زمـان و وەکـو روسـی لـە یـەکێتی سـۆڤیەتدا، بـە ناونیشـانی زمـانی نەتـەوەیی، لەلایـەن هـەموو خـەڵکی ولاتـەوە بـەکاردەبرێ. هـەروەها لـە هـەموو ناوچەیەکی تایبەتی جوگرافیدا لـەو ولاتـەدا، بەناونیشـانی زمـانی فـەرمی تایبـەت بەفەرمییـەت بناسـرێت وەکـو ئـۆکرانی لـە ئۆکرانیـا. هنـد ئـەم سیاسـەتە پـەیڕەو دەکات کە دوو زمانی نەتەوەیی هەیە. وەکو هیندی و ئینگلیزی، دوانزە زمانی تـر لە ویلایەتە تایبەتی فەرمین (ڕەسمی) وەکو سانسـکریتی و سـندی فـەرمین بـەلام ژێر دەسەلاتی دیاریان نییە(٤٠).

٦- لـە ولاتێکـی وەکـو ئێرانـدا، سیاسـەتی زمـانی بـە درێـژایی دەسـەلاتە جیاوازەکانیدا، زمانی نەتەوە جیاوازەکانی ئـەو ولاتـە، کەوتۆتـە بـەر کاریگـەری و یاسای بەکارهێنانی تاك زمانی، زمانی نەتەوەی دەسەلاتدار، کە زمـانی فارسـییە، لەکاتێکـدا زمـانی نەتـەوەی تـری وەکـو کـورد، عـارەب، ئـازەر و بـەلوج ... هـەن بەشێوەیەکی فـەرمی قەدەغـەکراون. زمـانی کـوردیش، لـەو ولاتـەدا کـە بەشـێکی کوردستانی بەرکەوتووە، زمانی نزیکەی هەشت ملیۆن کەسە، کەچی لە سیاسەتی ئەو ولاتەدا بایەخی پێ نەدراوە، نەبۆتـە زمـانی بـەکارهێنراو. بـەپێی دەسـتوور و یاسا لە سەرانسەری ولاتەکەی خۆیـدا، وەکـو زمـانی پـەروەردەیی و فەرهـەنگی و بەڕێوەبردن. لەم ولاتـەدا سیاسـەتی زمـانی، سیاسـەتێکی نـەك هـەر نەتـەوەیی و ڕەگەزپەرستانەیە، بەڵکو ئاین و مەزەبی دەسەلاتداریش دەوری خۆی هەیـە. کـە بوار نادات زمانی کوردی تەنانەت لە ناو سنوورەکەی خۆیشیدا. بۆیـە دیسـان لـەم بەشەشدا سنووری ولات و نەتەوە لەگەڵ سنووری زمانی کوردیدا ڕێکنکەوتووە.

**ئەنجامی لێکۆڵینەوە:**

١- زمان و سنوور دوو دیاردەی لەیەکتر جیاوازی کۆمەڵایەتی و سروشتین، لە هەمان کاتدا بەندن بە یەکترەوە.

٢- زمان وەك بنەمایەکی نەتەوەیی دەبێتە هۆی دیاریکردنی سنووری جوگرافی نیشتمانی وڵاتێك بەهۆی قسەپێکەرانەوە، واتە بەهۆی زمانی ئاخاوتنەوە.

٣- زمان دەربڕی کەلتوور و فەرهەنگ و داب و نەریتی نەتەوەییە و بەهۆیەوە گەشە دەکەن.

٤- سنووری نیشتمانی رێکناکەوێت لەگەڵ سنووری زمانی نەتەوەییدا ( زمانی پێوانەیی).

٥- بەهۆی بارودۆخی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەوە، زمانی نەتەوەیی، سنووری نیشتمانی نەتەوەیەك تێدەپەڕێنێت بۆ ناو سنووری نیشتمانی و جوگرافی نەتەوەی ترەوە.

٦- باری سیاسی دەوڵەتی کاردەکاتە سەر فراوانبوون و فراوننەبوون و تەسکبوونەوەی سنووری زمانی نەتەوەیەك یا کەمینەیەك.

٧- زمان بەگشتی هۆیەکی سەرەکی و یەکەمینە بۆ بوون و یەکخستنی هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی لە ناوەوە و لە دەرەوەی سنووری نیشتمانی لە ناو رۆڵەی خاوەن زمانەکەدا.

٨- زمانی نەتەوەیی و ستاندارد، کە خاوەن تایبەتێتی رێزمان و دەستووری خۆیەتی، لە ئەنجامی چەندین سەدەی گەشە و گۆڕانی وڵاتەکەوە هاتۆتە کایەوە و پێکهاتووە و لە شێوەیەکی زمانەکەوە لە ناو سنووری نیشتمانی وڵاتەکەوە سەری هەڵداوە و پەرەیسەندووە.

٩- بوونی زمانی پێوانەیی و دەستووری، نابێتە هۆی بەلاوەنان و بەرتەسککردنەوەی شێوەکانی تری زمانەکە، بە پێچەوانەوە هەردوو جۆرەکەیان دەبنە هۆی فراوانبوونی یەکتر.

١٠- زمانی ستاندارد لە دەرەوەی کۆمەڵی زمانی نەتەوەییدا، کۆمەڵێکی رۆشنبیری و کەلتووری وابەستە بە کۆمەڵی زمانی یەکەمەوە، لە ناو سنووری نیشتمانی دووەمدا پێکدێنێ.

١١- هەستی خۆبەستانەوە، بە زمانی کۆمەڵی یەکەم لە دەرەوەی سنووری نیشتمانی زمانەکە وەکو زمانی فێرکردن لەناو کۆمەڵی دووەمدا.

١٢- سنووری نیشتمان و کۆمەڵی کوردی، بەگشتی رێناکەوێت لەگەڵ سنووری زمانی کوردیدا. ئەمەش بەهۆی دابڕانی نیشتمان و کۆمەڵ و زمانی کوردییە لەیەکتر بەهۆی بڕیاری سیاسی دەسەلاتی رەگەزپەرستی و بەرژەوەندی نێودەوڵەتییەوە.

١٣- بوونی دوو زمانی پێوانەیی (دەستووری) لەناو سنووری ولاتێکدا وەکو بەلجیکا، سویسرا و کەنەدا ... کە بۆتە هۆی پێکهێنانی کۆمەڵی زمانی نەتەوەی جیاواز.

١٤- لە دەرەوەی سنووری نیشتمانی زمانێکدا، کۆمەڵێکی کەلتووری یا زمانی دوور لە کۆمەڵی رەگەزی پێکدەهێنێ.

١٥- سیاسەتی زمانی جاری واهەیە دەکەوێتە بەر سیاسەتێکی ئاینی و مەزەبی.

**سەرچاوەکان:**


١- حاتم صالح الضامن، علم اللغة، جامعة بغداد، ١٨٩٩.

٢- د. عبدالصبور شاهين، في علم اللغة العام، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٩٨٠.

٣- عەبدولمەناف رەمەزان ئەحمەد، ئەتڵەسی زمانی، نامەی ماجستێر، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠١١.

٤- لويس جان كالفن، السياسات اللغوية، ترجمة: محمد يحياتن، ط١، بيروت، ٢٠٠٩.

٥- مارتن ديورل، الموسوعة اللغوية، المجلد الثالث، تحرير: د.ن.ى. كونج، ترجمة محى الدين حميدى، عبدالله الحميدان، الرياض ١٤٢١ هـ، ١٩٩٩م.

٦- محمد حسن عبدالعزيز، مدخل الى علم اللغة، القاهرة، ١٩٨٣.

٧- د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري، مكتبة لبنان - بيروت، ١٩٨٠.

٨- د. ميشال زكريا، الالسنية، علم اللغة الحديث، المبادى والاعلام، بيروت، ١٩٨٢.

٩- ميشيل مالرب، زبانهاى مردم جهان، مترجم: عفت ملا نظر، تهران، ١٩٨٦.

١٠- ولیام اگردای، مایكل دابرولسكى و مارك ارنف، در امدى بر زبان شناسى معاصر، جلد ٢، ترجمه د. على درزى، تهران ١٣٨٤.

**پەراوێزەکان:**

(١) د. حاتم صالح الضامن، علم اللغة، جامعة بغداد، ١٩٨٩، ل: ٤٣.

(٢) مارتن ديورل، الموسوعة اللغوية، المجلد الثالث، تحرير: د. ن. ی. كونج، ترجمة: د. محی الدين حميدی، د. عبدالله الحميدان، الرياض، ١٤٢١هجري/ ١٩٩٩، ل: ٩١٩.

(٣) هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

(٤) د. محمد حسن عبدالعزيز ، مدخل الى علم اللغة، القاهرة ١٩٨٣، ل ١٥٥.

(٥) هەمان سەرچاوە، ل ١٥٥.

(٦) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

(٧) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

(٨) د. ميشال زكريا، الالسنية، علم اللغة الحديث، المبادیء والاعلام، بيروت- لبنان، ١٩٨٣، ل: ١٢١.

(٩) د. حاتم صالح الضامن، علم اللغة، جامعة بغداد، ١٩٨٩، ل: ٤٣.

(١٠) الموسوعة اللغوية، جزء ٣، ل: ٩١٩- ٩٢٠.

(١١) الموسوعة اللغوية، جزء ٣، ل: ٩١٩- ٩٢٠.

(١٢) الموسوعة اللغوية، جزء ٣، ل: ٩١٩- ٩٢٠.

(١٣) د. ميشيل مالرب، زبانهای مردم جهان،مترجم: عفت ملا نظر، تهران، ١٣٨٦، ل: ٥٢٣.

(١٤) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

(١٥) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

(١٦) الموسوعة اللغوية، جزء ٣، ل: ٩٢٠.

(١٧) الموسوعة اللغوية، هەمان سەرچاوە.

(١٨) الموسوعة اللغوية، هەمان سەرچاوە.

(١٩) الموسوعة اللغوية، هەمان سەرچاوە.

(٢٠) هەمان سەرچاوە، الموسوعة اللغوية، ل: ٩٢١.

(٢١) هەمان سەرچاوە، الموسوعة اللغوية، ل: ٩٢٢.

(٢٢) هەمان سەرچاوە، الموسوعة اللغوية، ل: ٩٢٢.

(٢٣) هەمان سەرچاوە، ل: ٩٢٣.

(٢٤) هەمان سەرچاوە، الموسوعة اللغوية، ل: ٩٢٣.

(٢٥) عەبدولمەناف ڕەمەزان ئەحمەد، ئەتڵەسی زمانی، نامەی ماجستێر، دەزگای سپیریز، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠١١،ل:٨٤.

(٢٦) عەبدولمەناف ڕەمەزان ئەحمەد ، ئەتڵەسی زمانی، ل: ٨٨.

(٢٧) د. عبدالصبور شاهين، فى علم اللغة العام، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٩٨٠، ل: ١٤٧.
(٢٨) الموسوعة اللغوية، ج٣، ل: ٩٢٣.
(٢٩) د. عبدالصبور شاهين، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل: ١٤١.
(٣٠) د. عبدالصبور شاهين، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(٣١) د. عبدالصبور شاهين، ل:١٤٧.
(٣٢) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕەی پێشوو.
(٣٣) لويس جان كالفن، السياسات اللغوية، ترجمة: محمد يحياتن، ط ١، بيروت، ٢٠٠٩، ل: ٨.
(٣٤) وليام اگردای، مايكل داربرولسكی و مارك ارنف، درامدی بر زبان شناسی معاصر، جلد٢، ترجمة: دكتر علی درزی، تهران، ١٣٨٤، ل: ٥٤٣.
(٣٥) وليام اگردای و ديگران، هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەڕە.
(٣٦) د. ميشيل مالرب، زبانهای مردم جهان، مترجم: عفت ملا نظر، تهران، ١٣٨٦، ل: ٥٢٣.
(٣٧) وليام اگردای و ديگران، درامدی بر زبان شناسی معاصر، ج٢، ل: ٥٤٣.
(٣٨) وليام اگردای، هەمان سەرچاوە، ل: ٥٤٤.
(٣٩) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.
(٤٠) وليام اگردای و ديگران، درامدی بر زبان شناسی معاصر،ج٢، ل: ٥٤٥.

## Abstract

This Study Research is about (the composition of Language and Geographical boundaries). The Research sheds light upon the question (To what extent the Native Language is consent with the Nation's (national) boundaries). This Situation (Circumstance) became a Phenomenon which is related to the powerful Political system where there is the policy of Racism and National oppression above/over that nation. Then, the country policy will adopt Multi-Language Method or Approach. This means, despite the Native language, the other languages of Nations in the same country will consent with the same Geographical boundaries ofthe population's language and Mother Tongue will be taken into account. In case, if the political system is not Democratic, then the country boundaries will not consent with language boundaries (language Border), In addition, this appear in a country that adopts the method or approach of 'one – Language'.

Sometime, according to (based on) the situation the language boundaries will increasingly expand more than country's boundaries and the nation's language. For example, in the case of expanding or increasing the political power's boundaries of a nation/country through monopoly and Occupational policy. The language of the powerful nation will cross the boundaries of its nation. For instance, the English Language in 20th century, when colonized many countries and put them under its control and hegemony. Hence, the English Language crossed its Geographical boundaries. Therefore, the adaption of 'one- Language' plan and policy will not consent with country's nationalboundaries.

As a result, the Kurdish Language due to the division and Occupationof its land 'Kurdistan' is not only consent with its country boundaries/border but also had been prohibited as a result of adapting the 'one- Language method' and racism policy.

# نوور و شێوەکانی
# لە شیعری (جزیری)دا

**پ.ی.د.یادگار ڕەسوڵ باڵەکی** **د.هێمن عومەر خۆشناو**

بەشی کوردی /فاکەڵتیی ئاداب/ زانکۆی سۆران

**پێشەکی:**

نــوور و شــێوەکانی لە شــیعری (جزیــری[*]) دا، ناونیشــانی ئەو لێکۆڵینەوەیە کە هەوڵدەدات لە چەمکی نوور و ئەو شێوە جیاوازانەی کە لە سیاقدا خۆیان بەرجەستە دەکەن، بکۆڵێتەوە. لەو ڕوانگەوە پشت بەو تیۆرانە بەستراوە کە بزاڤی سۆفیگەری و عیرفان لە هەمبەر ئەم چەمکەدا خستوویانەتە ڕوو.

کەرەســتەی ئەم لێکۆڵینەوەیە شــیعرەکانی (مەلای جزیـری)یە**، بەو پێیەی مەلای جزیری شاعیرێکە کە کاریگەریی سۆفی و عاریفەکانی پێش خۆی بەسەرەوەیە و گەیشتۆتە ئەو ڕادەیە کە هەندێک ڕوانینی تایبەت بەخۆی هەبێ و بە یەکێک لە عاریف و شاعیرە گەورەکانی سەردەمی خۆی دادەنرێ، لەم ڕووەوە زۆر بە وردی مامەڵەی لەگەڵ چەمکی نوور کردووە. ئەوەی ئێمەش تێبینیمان کردبێ، تاکە شاعیری کــوردە کە هێنــدە بە وردی و کارزانــانە ئەم چەمــکەی بەکارهێنــاوە. لەلایەکی تر بۆیە پێویست بوو ئەم چەمکە بخرێتە ڕوو، تا ئێستا وا بە فراوانــی قســە لەبارەی ئەم چەمکە نەکراوە و بەندیواربوونی لەگەڵ شیعردا ڕوانینێکی تازەی هێناوەتە کایەوە و شێوەیەکی دیکەی بە جۆر و چۆنیەتی چنینی شیعری کوردی بەخشیوە.

ئەو میتۆدەی بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە بەکارهاتووە بریتییە لە میتۆدی وەسفیی شیکاریی بەراوردانە، کە پێمان وابووە باشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی چەمکەکــان لە ســیاقی تــایبەتی خۆیانــدا شــیبکرێنەوە و لەگەڵ

چەمکی تردا بەراورد بکرێن بۆ گەیشتن بە واتایەکی دیکە لە ڕاڤەکردنی دەقی شیعریدا. لەو سۆنگەیەوە باسەکە دابەشی سەر دوو تەوەرە کراوە، تەوەرەی یەکەم بۆ نوور لە قورئان و سەرچاوە ئیسلامییەکان تەرخانکراوە، کە سەرەتا چەمکی نوور لە قورئان و پاشان لە تێگەیشتنی سۆفییانەدا خراوەتە ڕوو. هەرچی تەوەرەی دووەمە تایبەتە بە چەمکی نوور لە شیعری جزیری، کە ئەویش دابەشی سەر چەند سەرەبابەتێک دەبێ، لەوانە چەمکی نوور وەک بنەمایەک بۆ ڕاڤەی جودا، کە هەریەک لە شێوەکانی نوور وەک نووری نار و نووری نۆشین و نووری بەرزەخی و نووری نوور و نووری خودا و نووری ئەحمەدی باسیان لێوەکراوە. دواتر لق و شێوەکانی نوور کە بریتین لە هەریەکە لە نووری ئەحمەدی و شێوەکانی و هەروەها نووری تاریکی، کە نووری بوونی ئیبلیسییە قسەیان لەبارەوە کراوە. لە هەموو ئەمانەدا بە نموونەی شیعرەکانی جزیری ڕوانین و ڕوئیای جزیری لەهەمبەر شێوەکانی نوور خراوەتە ڕوو، کە بریتین لە پەیوەندیی نوور لەگەڵ چەمکەکانی (ئافتاب، ڕۆژ، عەرش، مەشریق، جەمال، خەتوخاڵ، ئەزەل) دواتر بنەماکانی ناو چوارچێوەی نوور لە تاریکی، بەتایبەت پەیوەندیی لەگەڵ جەلال و چەشم و زوڵف ڕوونکراوەتەوە. لە کۆتاییشدا بە چەند خاڵێک ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە خراوەتە ڕوو، دواتریش سەرچاوەکان بە ڕیزبوونی هیجایی ڕیزکراون.

## نوور لە قورئان و سەرچاوە ئیسلامییەکاندا

### ١-١. نوور لە قورئاندا :

قسەکردن لەبارەی چەمکی نوور لە شیعری کلاسیکیدا، هەر دەمانباتەوە بۆ سەرچاوە ئیسلامییەکان، بەتایبەتیش قورئانی پیرۆز کە ئەم چەمکەی نەک هەر فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو لە سیاقی جیاوازی واتاییشدا بەکاریهێناوە، بەو واتایەی لە چوارچێوەی فراوانبوونی واتاییدا خۆی بەرجەستەکردووە. لە سۆنگەی ئەوەی دەقی سۆفییانەش

یەکێک لە سەرچاوەکانی بریتییە لە قورئان و کەلەپووری ئیسلامی، بۆیە بە گوشراوی لە دەوری بنەماکانیدا دەخولێتەوە، بەڵام لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا تایبەتمەندیی خۆی بەدەستهێناوە بەوەی لە شێوەی هەڵمژینی سەرچاوەکەدا، بە سیاقی جودا خۆی نمایش کردووە.

لە قورئانی پیرۆزدا وێڕای ئەوەی لە چەندین شوێندا ئەم چەمکە هاتووە، بەڵام ئەوەی هەرە سەرەکییە بریتییە لە ئایەتی (اللهُ نُـورُ السمواتِ وَالأرضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشكواةٍ) [1] ، کە دواتر بەلای ڕاڤەکەرانی قورئان، ڕاڤەی جودای هەڵگرتووە و هەر تەنیا سیاقی ئەم ئایەتە بۆتە سەرچاوەی بنەما عیرفانییەکانی عاریفە گەورەکان و پاشانیش شاعیرانی سۆفی بە چەندین شێوەی جیاواز لە تێگەیشتنیان بۆ ئەم ئایەتە سوودیان بینیوە و لەناو شیعرەکانیاندا تەوزیفیان کردووە.

ئەوەی لەم ئایەتە هەڵدەهێنجرێ، بریتییە لە پەیوەندییەکانی نێوان (خودا و نوور، نوور و ئاگر، نوور و چرا، نوور و شووشە، نوور و هەسارە و ئەستێرەکان، نوور و زەیت (ڕۆن)، نوور و ڕووناکی، نووری لە نوور پەیدابوو، ...هتد). لەلایەکی تر ئەم ئایەتە نوێنەرایەتی تێگەیشتنێکی تایبەت لەناو قورئانی پیرۆزدا دەکات، کە زۆرترین و قووڵترین تەئویل و لێکدانەوە لەخۆدەگرێ.

قورئان جگە لەوەی سوورەتێکی تەواوی بەناوی نوور کراوە، بە زێتر لە دە واتاش هاتووە[2]، کە دیارترینیان بە واتای خودا، پێغەمبەر و قورئان هاتووە. لەلایەکی تریش فەرموودەکانی پێغەمبەریش لە دەستنیشانکردنی ئەم نوورەی خودا خاڵی نین، لەو ڕوانگەوە دەفەرموێت: (ان لله سبعين الف حجاب من نور وظلمة لو كشفها لاحرقت سبحات وجهه كل من ادركه بصره) [3].

### ١-٢. نوور لە تێگەیشتنی سۆفییانەدا:

بێگومان هەر خودی لێکدانەوە بۆ قورئانی پیرۆز بە بێ لە قالبدانی لە چوارچێوەی ڕێباز و میتۆدی جودا، تێگەیشتنی جۆراوجۆر هەڵدەگرێ، ئەمەش لەبەر هەڵکەوتەی چنینی وشە و ڕستەکانی و هێزی

واتــاییەکەی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا هەمــوو ئەوانەی لە ڕوانگەیەکــی تایبەتەوە لە قورئان ڕادەمێنن، ئەوا بە گوێرەی ئەو ڕوانینە، تێگەیشتنی تایبەت دەسازێ، بەتایبەتی عاریفە گەورەکان و زانا دیارەکانی جیهـانی ئیسـلامی بە درێژایـی مێژوو توانیویـانە واتـای وا هەڵبکرێنن، کە دواتـر مشــــتومڕی زۆری بەرجەســـتەکردووە و پاشــــان شــــاعیرانیش ئەم تێگەیشتنانەیان تێکەڵی ناو دەقەکانی خۆیان کردووە.

ئــایەتی (نــوور) یەکـێکە لەو ئایەتــانەی کە زۆرتــرین تێگەیشــتنی لەخـۆدا هەڵگرتـووە، بە جۆرێک تێگەیشـتنەکان هێندە ورد کـراونەتەوە، وای لێ هاتووە، ئەوەندەی بەرەو مەعنەوییەت دەبردرێن، ئەوەندە واتا ڕووکەشییەکە لەخۆیاندا بەرجەسـتە ناکەن. ئەم بـارە مەعنەوییە کاتێک دەقی ئەدەبیش دادەپۆشێ، لەلایەک دەقەکە بە ئاراستەیەکی تەمـومژاوی دەبـات و لەلایەکـی تـریش ئەگەر دەقەکە مـامەڵەی تـایبەت لەگەڵ ئەم تێگەیشتنانەدا بکات بۆ ئایەتی نـوور و بـۆ چەمکی نـوور، ئەوا دوو قـات بەرەو نائاسـایی واتـا و تێگەیشـتنێکی ئـاڵۆز دەچێت، لەمەشـدا وێـڕای شیعرییەت بەخشین بە دەق، وەرگرێکی شارەزایشی گەرەکە، کە کۆد و نهێنی و لایەنی تاریکی دەق ڕووناک بکاتەوە.

(غەزالـی) یەکێـک لەو زانـا و سـۆفییە گەورانەیە، کە مـامەڵەیەکی تـایبەتی لەگەڵ ئەم ئـایەتە کردووە و ڕاڤەیەکـی ڕۆحییـانەی بـۆ چەمکی نوور کردووە، لەوەدا مرۆڤ کاتێک کارلێک لەگەڵ ئەم چەمکە دەکات، ئەوا دەبــێ قۆناغەکــان ببــڕێ. هەروەک چــۆن قورئــان لە ئــایەتەکەدا نمـوونەی ئەم نـوورە خـوداییە بەم شـێوەیە دابەش دەکـات: نمـوونەی نــــوورەکە وەک قەنــــدیلۆکەیەکە، ئەم قەنــــدیلۆکەیە چرایەکــــی تێـــدا داگیرســـاوە، ئەم چـــرایەش لەنـــاو شووشـــەیەکدایە، شووشـــەکەش لە درەختێکەوە سەرچاوەی گرتووە کە نە ڕۆژهەڵاتی و نە ڕۆژئاواییە، بە هـۆی ڕۆنێک ڕۆشـنایی دەداتەوە، ئەگەر ئـاگری تێدا بەرنەکەوێت ئەوا نـوورە لە نوورێـک. هەتـا ئێـرە واتـایەکی ڕووکەش هەڵـدەگرێ، بەڵام بەلای غەزالییەوە، لێکدانەوەکە پەیوەندی بە ڕۆحـی مرۆڤییەوە هەیە و

قۆنـاغ و پلەکـانی دەبـێ ئەم ڕیزبەنـدییە ببـڕن و هەر ڕیزبەنـدییەکیش پلەیەکـی ڕۆحـی مـرۆڤییە، کە نـوورەکە ڕۆشـنی دەکـاتەوە. هەر لەم ڕووەوە (نەسەفی)یش هەمان ڕا و بۆچوونی هەیە بۆ ئەوەی تێگەیشتنی نوور بۆ پلەبەندکردنی ڕۆحی مرۆڤ بێ و مرۆڤەکان دەبێ بە بڕینی سـلوکەوە ئەم نـوورە وەربگـرن، هەر وەک لەم هێڵکـارییە ڕوون دەبێتەوە: [٤]




لێرەدا دەردەکەوێ، ئەم نـوورە وا کارلێـک لەگەڵ ڕۆحـی مـرۆڤ دەکات، کە بەهۆی ئەم پلەبەندییەوە نوورەکە بناسرێتەوە و دواتر پلە بە پلە تـا دەگـاتە نـووری ڕاسـتەقینەی خـودا، کە بەلای ئەوانەوە هەر ئەم نـوورە سـەرچاوەی نوورەکـانی تـرە و چـۆنیەتی هاتنیشـی لەگەڵ ئەم پلەبەندییانە و دواتر دەستنیشـانکردنی جۆری ڕۆحەکان لەم ڕوانگەوە تێگەیشتنێکی تەئویلیانەیە و لەو سۆنگەشەوەیە شیعر و دەقی سۆفییانە مامەڵەی لەگەڵ ئەم چەمکەدا کردووە و لەگەڵ چەند چەمکێکی تریشدا مەداری کردووە، کە هەر یەکێک لەوان بۆ تێگەیشتن لە دەقی شیعری جێگەی دیارە، چونکە هەموو چەمکەکان دواجار دەوروبەر (سیاق)ێکی واتایی دێننە کایەوە، کە بۆ تێگەیشتنی ئەمڕۆی دەقی شیعری گرنگیی تایبەتییان هەیە.

حەســەنی بەســرِی (-١١٠ك) دەڵــێ: (مەبەســت لەم ئــایەتە، دڵــی بڕوادارو نووری یەکتاپەرستییە، چونکە دڵی پێغەمبەران نوورانیترە لە نــووری ڕووکەشــی). هەر لەو چوارچێوەیەشــدا توســتوری (-٢٨٣ك) لەبــارەی ڕاڤەی ئــایەتی نــوور و لەژێــر ڕۆشــنایی ڕایەکەی حەســەنی بەســرِی پێــی وایە: نــوور نمــوونەی قورئــانە، وەک چــۆن چــرایەکە "مصباح"ــە، شووشــەکە "زجاجـة"یە، ئەم چـرایە مەعـریفەتە، فتـیلەکەش فەرائیزەکـــانە، ڕۆنەکەیـــش دڵســـۆزییە و نوورەکەیشـــی نـــووری پەیوەندیکردنە، هەرکاتێک دڵسۆزی هەبێ، ئەم چرایە دەدرەوشێتەوە و هەر کاتێکیش ئەم فەرائیزە بە حەقیقەتەوە پەیوەست بێت، چرایەکەش بە نوور دەدرەوشێتەوە[٥].

مەشــایەخی تەســەووف دەڵــێن: مەبەســت لە نــوور لەم ئــایەتەدا نــووری دڵــی عاریفـانە بە تەوحیـدی حەق. هەروەک (تەهــانەوی) دەڵــێ: نــوور لای ســۆفییەکان دەرکەوتنـی حەقە لە خـودی خۆیانـدا کە ئەمەش وجوودی حەقە. یان بە مانایەکی تر نوور تەجەللای زاتە، کە گوزارشتە لە هەمـوو نوورەکـانی ئەسـماء و سـیفاتی خـوا کە دەفەرمـووێ (فأينمـا تولوا فثم وجه الله). مادامیش هەموو بوونەوەرەکان پلەیەکن لە نووری حەق، بۆیە نووری حەقیقەتیش ئەوەیە کە غەیری خۆی ڕۆشن بکاتەوە، ئەگەر وا نەبـوو پێـی نـاوترێ نـوور، لەبەر هەندێیە خۆر نـوورە، مانـگ نوورە، چرا نوورە، بەو مانایەش نا کە لە خودی خۆیاندا ڕۆشنن، بەڵکو بەو مانایەی کە دەوروبەری خۆیـان رۆشـن دەکەنەوە. لەو سـۆنگەیەش ئـاو و ئـاوێنە بـا بـۆ خۆیـان رۆشـن بـن، بەڵام نووریـان پـێ نـاگوترێ، چـونکە دەوروبەریـان رۆشـن نـاکەن. لەبەرئەوە (اللـە) رۆشـنکەرەوەی ئاســمان و زەوی و رۆحەکــانە و هەمــوو نوورەکــان لەو ســەرچاوە دەگرن. [٦]

هەمــوو ئەم ڕا و بۆچوونــانە و ڕا و بۆچــوونی عــاریف و گەورە زانای تر، هۆشمان لەسەر ئەوە دەسەنگرێننەوە، کە خـودا بۆیە نووری ئاسمان و زەوییە و خۆی نـوور و ڕۆشنایی دەخـاتە دڵـی بەنـدە، تـا دڵ

ببێتە سەرچاوەی ڕۆشناییەکان و لە دڵەوە هەنگاوە ستراتیژییەکانی چوونی مرۆڤ بەرەو ویساڵ و حەقیقەت و یەقین بچن!

**١. چەمکی نوور لە شیعری جزیری دا :**

مەلای جزیری وەک شاعیرێک و لە هەمانکاتدا زانا و سۆفییەکی سەردەمی خۆی، پیاوی ناو کەشی سۆفییانەی سەردەمی خۆی بووە، بە جۆرێک وێڕای بنەماکانی سۆفیگەری، کاریگەریی قورئانی پیرۆزیشی بەسەرەوەیە و هەر لەم سۆنگەیەوە خۆی لە چەمکی نوور نەبواردووە و لە سیاقی جۆربەجۆردا بەکاری هێناوە و پەیڕەوی بنەماکانی سۆفیگەری و ڕوانینە قووڵەکانی مەعنەوییەتی کردووە، کە دواتر لەگەڵ بونیادی وێنەی شیعریدا ئاوێزانی کردوون.

ئەوەی لە دیوانی (جزیری) دا هەڵدەهێنجرێ، تایبەت بە چەمکی نوور، بریتییە لە دوو شێواز، شێوازێکیان ڕاستەوخۆ ڕاڤەی ئایەتی قورئانی و فەرموودەکانی پێغەمبەرە، کە ئەمە وەک جۆرێک لە تێکهەڵکێش و دەقئاوێزانی ئاینی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ. هەرچی دووەمیانە سازاندنی وێنەیەکە بە هەوێنی نوور، کە هەڵگری بنەمای سۆفییانە و واتاگەلێکی تایبەتییە کە لێکدانەوەکان لەگەڵ چەمکی تری شیعریدا خۆی پەیوەست دەکات. بۆیە لەم ڕووەدا لێی رادەمێنین:

**٢-١. نوور وەک بنەمایەک بۆ ڕاڤەکردنی جودا :**

لە سۆنگەی ئەوەی جزیری وەک شاعیرانی سەردەمی خۆی بە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) کاریگەربووە، بۆیە لەنێو جۆری ئەم کاریگەربوونەدا، چەمکی نووریش بێبەش نییە لەو کەرەستانەی کە شوێنێکی دیاریان لەناو شیعرەکانی جزیریدا هەیە، لەبەرئەوە دەتوانین لەژێر ڕۆشنایی تەفسیری زاناو عاریفەکان بۆ ئەم ئایەتە، چەند بنەمایەک دەستنیشان بکەین و خۆمان وەک وەرگرێک دابنێین بۆ کارلێککردن لەگەڵ چەمکەکەدا، چونکە کاتێک ئێمە وەک وەرگر مامەڵە

لەگەڵ چەمکی نوور دەکەین، دەبێ هەموو ئەو سیاقانەش بدۆزینەوە کە وشـەکەی لەگەڵ دێـت، بـۆ ئەوەی ڕوانینـی شـاعیر وەک پەیڕەوکـاری چەمکەکە ڕوون بێت. بێگومـان شـاعیریش وەک لاسـاییکردنەوەیەک بۆ فەلسـەفەی ئیشـراق و سـۆفیگەری بەتـایبەتی لاسـایی هەریەک لە (سـوهرەوەردی) [٧] و (نەسـەفی) کـردووەتەوە، کە دەتـوانین ئەم شێوانەی لێ دەستنیشان بکەین.

**٢-١-١. نووری نار:**

جزیـری وەک سـۆفییەکانی پـێش خـۆی ئەم بنەمـایەی یەکلاکردۆتەوە، کە نـوور لە ئـاگری مەعنەوییەتەوە سـەرچاوە دەگرێ، هـاتنی ئـاگریش بـۆ نـاو سـیاقی شـیعری بریتییە لە ئـاگری عیشـق، بەو پێـیەی تیـنە گەرمیـیەکە لە ئـاگرەوە و ڕۆشـنایی بەخشـینەکەش لە نوورەوە، بە ئـاوێتەکردنی هەردووکیـان عیشـق و گەیشـتن بە حەقیقەت دێتەدی:

**بێ نوور و نارێ موحبەتێ بێ نەقش و وەصفێ قودرەتێ**
**ناچین مەقامێ وەصلەتێ نور لنا والليل داج /١١٢**

لێـرەدا وێـڕای باسـکردنی نـوور و نـارەکە، لەگەڵیشـیدا فریکوێنسـەکانی قـودرەت و مەقـامی وەسـڵەتیش ئاماژەیـان بـۆ کـراوە. لەلایەکـی تـر بەلای جزیـرییەوە نـارەکە سـەبارەت بە مـرۆڤەوە دەبـێ عیشـق بەرهەم بهێنـێ و وا بکـات جەسـتە بسـووتێنێ بـۆ ئەوەی ڕۆح بگاتە یەقین و بە وەسڵ شاد بێ. وەک دەڵێ:

**موحبەتا صووری دو قسمە قوفڵ و مفتاح و طلسمە**
**هن ژ ڕووحن هن ژ جسمە نار و نوورە هن هەوایە /٢٦٢**

تا دەگاتە:

**هەر کەسێ موحبەت ژ ڕووحە موبتەلای نوورا سوبووحە**
**وی د دل دا سەد جورووحە جەذبە و لەرزین و تایە /٢٦٣**

جزیـری پـێچەوانەی هەنـدێ حـاڵەتی مەولانـای ڕۆمـی، نـاری نەکردۆتە دژی نـوور، چونکە بە لای مەولانـا (نـار وێڕای ئەوەی دژی

نوورە، درکەشە لە تەماع و خۆپەرستی و کرداری خراپە و ئەم ئاگری ئارەزووبازییەش تەنیا بە نوور دەکوژێتەوە)[٨] ، لە کاتێکدا لای جزیری هاوشێوەی غەزالی تێگەیشتنی بۆ فتیلەی ئایەتەکەی نوور بریتییە لە سووتان بەرەو گەیشتن بە وەسڵ و یار و نووری نوور.

**٢-١-٢. نووری نۆشین:**

هاویەکبوونی نوور لەگەڵ نۆشینی خواردنەوەیەک جۆرێک لە نائاسایی بوونی واتایی دێنێتەکایەوە، بەڵام ئەمە بنەمایەکی سۆفییانەی هەیە، بەو پێیەی مرۆڤ لێرەدا لەو دیو سروشت مامەڵە دەکا، لەوەشدا دەچێتە ڕیزی فریشتەکان و لەو نێوەندەشدا خۆراک و خواردنەوەکان خۆراک و خواردنەوەی دونیایی نین، بەڵکو هی ئاسمانین و هەڵبەت بۆ ڕۆحیش تەنیا نوور خورد و خۆراکە، لەبەرئەوە باشترین خواردنەوەی نوورانی بریتییە لە شەڕاب، کە ئەمەش بۆ خۆی تەئویلێکی گەرەکە، بەڵام بەکارهێنانی نوور وەک هاوشانی بۆ وشەی بادە و شەڕاب، دەلالەتێکی ڕۆحی هەیە و پلەیەکی بەرزی نووری ئیلاهییە کە وەسڵ و حەقیقەتی تێدا دەسەنگرێتەوە[٩]:

**حەتتا ب نوورا بادەیێ ڕەنگین نەکی سەججادەیێ**
**دووری ژ وێ شەهزادەیێ دوڕ دانەیا گەردەن ژ عاج/١١٢**

لێرەدا جزیری ئەمەی کردۆتە مەرج، کە دەبێ بە نووری بادە، واتە نووری ڕاستەقینە کە نووری خودایە، دەبێ ئەو بەرماڵە ڕەنگین بێ بۆ ئەوەی پەیوەندی پەرستشەکە ببێتە پەیوەندییەکی دوولایەنەو گیرابوونەکە مسۆگەر بێ، کە پەرستنێکە، دوورە لە هەموو پەیوەندییە مادییەکان (الا لله الدین الخالص). بە جۆرێک ئەم بەرماڵە پەرستشی تەواوی لێ ناکەوێتەوە، ئەگەر بە نووری بادە ڕەنگ نەکرێ، چونکە هاتنی بادەکە لە فەرهەنگی سۆفییانەدا سەرەتای عیشقی ئیلاهییە و لەگەڵ زاراوەکانی تری شەڕابدا چوارچێوەیەکی واتاییان هەیە[١٠].

**٢-١-٣. نوور خودایە:**

وێڕای ئەوەی بە پشتبەستن بە ئایەتی (اللهُ نُورُ السمواتِ وَالأرضِ)، خودا بە سەرچاوەی سەرەكی ڕۆشنایی زەوی و ئاسمان دەزانرێ، لەلایەكی تریش نوور و خودا یەكسان دەبن، بە جۆرێك بە لای سۆفییەكان و هەروەها حیكمەتی ئیشراقیش نوور و تاریكی بەرامبەر یەكتر نین، چونكە بەلای ئەوانەوە بەرامبەرییەكە لە بوون و نەبووندایە، واتە خودا و بوون بریتییە لە نوور، هەر جێگایەك كە خودای نەبێ تاریكاییە و عەدەمە، بۆیە بەو هۆیەوە لە فەلسەفەی شێخی سوهرەوەردی، نوور بۆ هەموو شوێنێك دەچێ، بەڵام تینی نوورەكە بە گوێرەی هەبوونەكە و ئامادەیی كەسەكە دەگۆڕێ و دەدرەوشێتەوە[١١]. هەر لەسەر ئەم ڕوانینەوە، سۆفییەكان بە مرۆڤی نووری ناو دەنرێن، ئەمەش لەبەر دوو هۆیە، یەكەمیان ئەوەیە ئەوان بڕوایان وایە نوور بناغەی بوونە و لەو ڕێگایەوە حەقیقەتی بوونەوەرەكان ڕۆشن دەبێتەوە. دووەمینیان بڕوایان وایە خودا دڵ بە هۆی كۆششەوە ڕۆشن دەكاتەوە، سۆفییەكانیش بەهۆی ئەم ڕۆشناییەی دڵانەوە هەندێ شتی پەنهانیان بۆ ئاشكرا دەبێ.[١٢] لەوەشدا (جزیری) هەمان بۆچوونی هەیە و نوور بە بنەمای بوون دادەنێ و پێی وایە پێش دروستبوونی هەموو بوونەوەرەكان نوور هەبووە و دواتر هەموو بوونەوەرەكان بە ئەندازەی كۆششی خۆیان ئەم نوورەیان بەركەوتووە:

**نوورن ژ سەر حەتتا قەدەم نەققاشێ سەرمەشقێ قدەم**
**پێ زەییناند لەوحێ عەدەم یەک یەک د وان دا چەشنە دا /٥٣**

جزیری لە دیوانەكەیدا زیاتر لە ١١٥ جار وشەی نووری بەكارهێناوە و تەنیا لە قەسیدەی (اللە سەحەر)دا ٣٧ جاری هێناوە، وێڕای ١٧جاریش وشەی تەجەلـلا، كە بەشی زۆری یەكسانكردنی نوورە لەگەڵ خودا و ڕاڤەی ئایەتەكەی نووری قورئانی پیرۆزە.

٢-١-٤. **نووری بەرزەخ:**

لە نووری زۆر نزیکی خودا کە بە نووری ئەقرەب ناسراوە، دوو شت دەردەچن، یەکێکیان بەرزەخ و ئەویتریش نووری موجەرڕەد، چونکە لە نووری ئەقرەبدا دوو حاڵەت هەیە، یەکێکیان هەژاری خود کە لێرەدا بە پێوەری نووری نوور لە خودی مرۆڤدا دێتە بینین، بەو واتایەی نووری هەژاری پێویستی بە نووری دەوڵەمەند (غەنی) هەیە، کە نووری خودایە، لەم هەژارییەشدا سێبەر بە دەست دێ، کە ئەمەیان بەرزەخی باڵایە، کە لەم جیهانە زۆر گەورەترە، دواتریش لە کاروباری شەریعەتدا هەمان خەملاندنی عەرش-ی بۆ دەکرێ[١٣].

جزیری ئەم مەسەلەیەی فەرامۆش نەکردووە و لەنێو ئەم پۆلێنکردنەی بۆ نوور، ئەم بەرزەخەی نزیک لە عەرش تەماشا کردووە و لە سەرەتاکانی هێنانەدیی نووری موحەممەدی داناوە:

**سەرچەشمەیا ڤێ بەرزەخێ　　بەحرا جەمەد دابوو ڕەخێ**
**فەیضەک ژ نوورا بەرزەخێ　　داگرت و گەهـ گەهـ فوورەدا /٦٠**

٢-١-٥. **نووری ئەحمەدی:**

نووری ئەحمەدی بابەتێکی عیرفانی و سۆفییانەیە و لە مێژووی عیرفانی ڕۆژهەڵاتیدا شوێنێکی دیاری هەیە، بەتایبەتی لای (سوهرەوەردی) و (غەزالی) و کە پێشتریش لای حەللاج بە حەقیقەتی موحەممەدی ناسراوە.[١٤] هەروەها لە دەقی شیعری (مەولانای ڕۆمی)ش ڕاشکاوانە باسکراوە، بابەتەکەش لەوەدا خۆی بەرجەستە دەکات، کە دوای دروستبوونی وجوود لەلایەن خوداوە، سەرەتای هەموو شتەکان لە نووری خوداوە نووری موحەممەدی پێغەمبەریش (د.خ) دروستبووە، جزیریش ئەم ڕاستییەی زۆر بە ڕاشکاوانە دەربڕیوە:

**نوورەک ژ نوورێ وی ڤە کر　　گەنجا ظوهوورێ پێ ڤەکر**
**کەنزا خوە قوفل و مفتەکر　　هێژ وێ د قوفل و مفتەدا**
**حوسنەک مونەززەهـ صەووراند　　نوورا حەبیب ژێ ئافراند**
**عالەم د کونهێ حەبیراند　　(روح القدس) جان نەفخەدا /٥٨**

تا دەگاتە:

| | |
|---|---|
| **ناریَ ژ نوورا ئەحمەدی** | **سررا صفاتیَ سەرمەدی** |
| **د ئایینەیا ذاتیَ خوە دی** | **کەشفا کەمالاتیَ خوەدا /٥٩** |

## ٢-٢. لقەکانی نوور:

دەتوانین لەژێر ڕۆشنایی بۆچوونی (عەینولقوزاتی هەمەدانی) دوو جۆر لە (نوور) دیاری بکەین، ئەوانیش نووری نوور (نووری ئەحمەدی) و هەروەها نوور لە تاریکی (نووری ئیبلیسی):[١٥]

١- نوور لە نوور (نووری ئەحمەدی و سیفاتی):

١- ئافتاب (فلما رأى الشمس بازغة)
٢- ڕۆژ (والنهار اذا جلاها)
٣- عەرش
٤ جەمال (ان أرواح المؤمنين من نور جمال الله)
٥- سەلام
٦- خەتوخاڵ
٧- مەشریق
٨- ئەزەل

٢- نوورلە تاریکی (زوڵمەت) (نووری ئیبلیس و سیفاتی):

١- ماهتاب (فلما راى القمر بازغا)
٢- شەو (والليل اذا يغشاها) و (والليل اذا يغشى)
٣- زەوی
٤- جەلال(ڕۆحی کافران لە نووری جەلالە)
٥- نەفرەت
٦- زوڵف و چاو (نیشانەی ئیبلیس)
٧- مەغریب (نووری ڕەشی عزرائیل )

### ٢-٢-١. بنەماکانی نووری نوور (نووری ئەحمەدی):

جزیری هەمان ئەو ڕێچکەیەی گرتووە، کە ئەم خشتەیە لەسەری ڕۆیشتووە، بە جۆرێک لە دابەشکردنی چەمکەکان بۆ هەریەکە لە

نووری ئەحمەدی و نووری ئیبلیسی هەنگاوەکانی بە گوێرەی گونجانی کەرەستە شیعرییەکە لە بەرژەوەندیی ڕوونکردنەوەی چەمکی (نوور) هێناوە. لەوەشدا وەرگر (المتلقي) ناتوانێ بەبێ ڕەچاوکردنی ئەم خشتەیەی سەرەوە شیکردنەوەیەکی زانستانە بۆ چەمکی نوور ئەنجام بدا، بەتایبەتی لە هاتنی سیاقی چەمکی نوور و فێلدە واتاییەکانی، کە هەموو جارێ لەگەڵ چەمکی تردا خۆیان گونجاندووە. بۆیە دەتوانین بەم شێوەیە پۆلێنیان بکەین:

**٢-٢-١-١. پەیوەندیی نوور و ئافتاب:**

وێڕای ئەوەی نوور و ئافتاب لە ڕۆشنایی بەخشین هاوبەشن، بەڵام هاتنی هەردوو وشەکە لەیەک سیاقدا مەدلوولی تایبەت بەخۆی هەیە، بە جۆرێک ئەگەر (خۆر حەقیقەتی نووری خودا و خودی یەکتاییە)[١٦] ، ئەوا چۆن نووری ڕاستەقینە بریتییە لە نووری نوورەکان (نور الانوار)، بە هەمان شێوەش خۆر- ئافتاب سەرۆکی ئاسمانە و چەندین نووری تری گەردوون لەودا سەرچاوە دەگرن[١٧]. بۆیە مادەم هەردووکیان نوور بە ئەوانیتر دەبەخشن، ئەوا پەیوەندییەکانیان پتەو دەبێ و لەو ڕوانگەوەش بنەمای عیرفانی لەو سۆنگەوە ئەم پەیوەندییە بەدیاردەخات، بە جۆرێک هاتنیان لە یەک سیاقدا ئەو سەرنجە دەنەخشێنن، کە هەڵبژاردنی ئافتاب وەک چۆن بۆ ئیبراهیم پێغەمبەریش سەرەتای هەوڵدان بووە بۆ دۆزینەوەی خودا لەو ڕێگایەوە، ئەوا بۆ شیعریش بۆ چنینی وێنەکە دەلالەتە لە نووری خودا و نوورێک کە لە نووری ئەحمەدی یان نووری ئەنوارەوە سەرچاوەی گرتووە. وەک دەڵێت:

**ئافتابێ کو نە تەصویر ژ حوسنا تە بتن**
**(نورها فی نظری ظلمة داج وحلک)  /٢٠٨**

ئەم دێڕە ئەوە ڕوون دەکاتەوە، نووری ئافتاب ئەگەر لە یارەوە سەرچاوە نەگرێ ئەوا دەبێتە تاریکی، واتە هەڵبژاردنی ئافتاب بۆ

نوورەکە، نیشانەی لووتکەی بەهێزییە، چونکە سەرچاوەکەی نووری ڕاستەقینەیە، بۆیە ئەگەر لای ئەو نەهاتبێ، با بە ناو ئافتابیش بێ، بەڵام هەر دەبێتە ڕووناکیی جەستەیی و دواجاریش سەرچاوەکەی لە تاریکییەوە بەرجەستە دەبێ. هەر لەژێر ئەم ڕۆشناییەشدایە خشتەکە ئافتاب دەخاتە سەرووی فێڵدەکانی تر، کە لە چوارچێوەی نووری نوورەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ.

**٢-٢-١-٢. پەیوەندیی نوور لەگەڵ ڕۆژ:**

مەبەست لە ڕۆژ بریتییە لە (النهار)، کە پێچەوانەی شەوە و خودا لە قورئاندا سوێندی پێ خواردووە کاتێک دەفەرمووێ: (والنهار اذا جليها). بەڵام لە ڕوانگە عیرفانییەکەوە، (ڕۆژ: نوورێکە و ڕواڵەتی خودایەتییە و دەرخەری وەسفە پیرۆزە بێگەردەکانی خودایییە و بنەڕەتی هەموو خولقێنراوە ڕەگەزییەکانە.. ڕۆژ خاڵە نهێنییەکانە و جغزی نوورەکانە) [١٨] ، لەو ڕوانگەوەش جزیری دوای ئەوەی باس لە نووری ئەحمەدی دەکات، لەو نوورەشەوە باس لە تەجەللاکردنەکەی دەکات، کە چۆن دواتر وێڕای عەقڵ و ڕۆح، ڕۆژیش لە قەوسی قوببەدا خۆی نواندووە:

**ئەڤ ڕەنگ تەجەللا کر سوبووح ساقی ژ شەهکاسا فوتووح**
**مەی ڕێهتە جاما عەقل و ڕووح ڕۆژ بوو د قەوسێ قوببەدا /٦١**

بۆیە لێرەشدا ڕۆژبوون، دەرخەری نهێنییەکانی خودایە، لەنێو ئەم نهێنییانەشدا نهێنی نووری نوورە کە خودایە و دواتر لەم نێوەندەشدا نووری ئەحمەدی دەخەملێ.

**٢-٢-١-٣. پەیوەندیی نوور و عەرش:**

عەرش یەکێک لەو بنەمایانەیە کە نیشانەیە بۆ نووری ئەحمەدی، بە جۆرێک پێچەوانەی زەوی دێ، ئەگەر زەوی لە ئاستی ئاسمان و خودادا نزم و نەوی بێ، ئەوا عەرش وێڕای بڵندییەکەی بە شوێنی خوداش دادەنرێ، شوێنێکیش کە خودا هەڵبگرێ، دەبێ نقومی ناو نوور

بێ، دواتر ڕاستەوخۆ ئەم نوورە لە خوداوە پێش هەموو بوونەوەرەکان بۆ پێغەمبەر دێ، چونکە لەلایەک خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: قُل مَن رَبُّ السَمواتِ السَبعِ وَرَبِّ العَرشِ العَظيمِ/ المؤمنون: ٨٦، هەروەها لەلایەکی تر دەفەرمووێ: رَفيعُ الدَّرَجاتِ ذُو العَرشِ/غافر: ١٥، لە فەرموودەی پێغەمبەریش هاتووە خۆرو مانگ و ئەستێرەکان لە نووری عەرشەوە دروستبوون، وەک دەفەرمووێ: حدثنا محمد بن يونس العصفرى قال ثنا يزيد بن عمرو بن البراء الغنوي قال ثنا معقل بن مالك قال ثنا عبد الرحمن بن سليمان الأنصارى عن عبيد الله بن أبى بكر بن أنس قال سألت أنس بن مالک عن ثلاث خيال عن الشمس والقمر والنجوم من أي شیء خلقن فقال حدثني رسول الله صلى الله عليه وسلم إنهن خلقن من نور العرش. [١٩]. یان: جوانیی یوسف لە نووری کورسی و جوانیی پێغەمبەریش لە نووری عەرش سەرچاوەی گرتووە وەک دەفەرمووێ:

هبط جبرائيل فقال: إن الله يقول: حبيبي إني كسوت حسن يوسف من نور الكرسي وحسنک من نور العرش ) [٢٠] .

جزیریش هەمان ئەم بنەما عیرفانییەی زۆر بە ڕوونی ڕەچاو کردووە و ڕاستەوخۆ لە خوداوە ئەم نوورە دێتە ناو عەرش و لە عەرشەوە تەجەللا دەکات و دەدرەوشێتەوە و لەپاشان ناوەکان دروست دەبن کە بنەمان بۆ هەموو بوونەوەرەکان. وەک دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **نوورا تەجەللا هاتە عەرش** | **ئەسما حەمی لێ بوونە نەقش** |
| **شەوقا د وان چوو تا ب فەرش** | **ئسمان ب ذاتی سەجدەدا /٥٩** |
| **کاتب قەلەم دیسا گەڕاند** | **ئسمەک ژ ئسمان صەووراند** |
| **کورسی ژ نووریٚ ئافراند** | **جەنناتێ خولد و سدرەدا /٦٠** |

٢-٢-١-٤. **پەیوەندیی نوور و جەمال :**

وێڕای ئەوەی جەمال خەسڵەتی خوایە و نووریش ناوی خوایە هەردووکیان یەکتربڕیشن لە پرسی نووری ئەحمەدیدا، بە جۆرێک خودا جوانە و جوانانیشی خۆشدەوێن، لە هەمان کاتدا هەموو نوورێک دەبێ

جوان بێ، چ جای ئەوەی نووری نوور کە نووری بنەڕەت و سەرەتایە. جزیری ئەم هاوکێشەیەی بەو ئاقارە بردووە، کە مرۆڤ و جیهانی دونیایی مادام سێبەری نووری ڕاستەقینەیە، واتە ئێمە لە نووری خوداوە ڕۆشنایی وەردەگرین و ڕۆحی بڕوادارانیش لە نووری خوداوە وەدیهاتووە، بۆیە بە جەمالی خوداش ئێمە بەرچاومان ڕوون دەبێ و دەتوانین ڕێ بکەین و دیدەمان بە ساغی دەمێنێتەوە. بە واتایەکی تر دووربوون لە نوور و جوانیی خودایی، واتە بێ چاو مانەوە و دوورکەوتنەوە لە تەجەللای ڕاستەقینە، کە بریتییە لە نووری ئەحمەدی. وەک دەڵێ:

**نوورێ چەشمێ مە کو عالەم مە ب چەشمێن تە ددی**
**ب جەمالا خوە تە وەک دیدەیێ بێ نوور کرین /٢٣٣**

یان دەڵێ:

**جەمالا نوورین صافە د وەجهێ تەجەللایێ /٣٩٠**

**٢-٢-١-٥. پەیوەندیی نوور و (خەت و خاڵ):**

خەت و خاڵ چ خەت و خاڵی ڕوخسار بێ، یان خەت و خاڵی نووسین بێ، لە هەردوو لاوە دەربڕی نوقتەی وەحدەت و یەکتاپەرستیی خودایە، بەتایبەتی لە یەکەمیاندا پرسی جوانی لە بۆتەی وێناکردنی عیشقی زەمینیدا دەسەنگرێنێتەوە، بەو پێیەی خاڵ بنەمای دەستپێکردنی هەموو ڕووبەرێکە، واتە هەموو شتەکان لە نوقتەوە دەست پێدەکەن، بۆیەشە ئەگەر لە سیاقی نوور هات، ئەوا دەچێتە چوارچێوەی نووری نوور. جزیریش ئەم ڕەنگدانەوەیەی فەرامۆش نەکردووە، وەک دەڵێ:

**مە ژ دەستخەتا تەرحێن شەلال خال و خەطین نوورا زەلال**
**دانی ل صەندووقا ل بال مالێ مە سەد قەنتار خەط /١٧٩**

لە لایەکی ترەوە زاراوەی خەط (پەیوەندیی بە مرۆڤی کامڵەوە هەیە کە ئیبن عەرەبی بۆ یەکەم جار لێی دواوە و مەبەست لە مرۆڤی کامڵیش حەقیقەتی موحەممەدییە)[٢١]. جزیری ئەم پەیوەندییە جارێکی تر

دووپات دەکاتەوە و ئەم نوورە لە چوارچێوەی نووری موحەممەدیدا دەخاتە بەرباس، کاتێک دەڵێ:

**دیسا ل بەدرێ کاتبی کێشا ژ نوو ژەنگار خەط**
**نوورا ڕشاندی واهبی دەرگردشی پەرگاری خەط /١٧٩**

**٢-٢-١-٦. پەیوەندیی نوور بە مەشریق:**

مەشریق بە واتای ڕۆژهەڵات، ئەو شوێنەی کە خۆری لێ هەڵدێ، لە ئەدەبیاتی سۆفییانەدا شوێنێکی گرنگی هەیە، بەوەی (تەجەلییاتی زاتە)[٢٢]، بەتایبەت ئەو کاتەی لەگەڵ چەمکی نووردا بەندیوار دەبێ. لەلایەکی تر پرسی ئیشراقیش کە نوێکەرەوەکەی (سوهرەوەردی)یە و ئەمیش لەو چوارچێوەیەدا تریسکایی وەردەگرێ، بە جۆرێک مەشریق لە بەرامبەر مەغریب داندراوە و وەک چۆن لە خۆرەوە ڕۆشنایی بۆ هەسارەکانی تر دەچێت، بە هەمان شێوە دەرکەوتن تین و وزەکەی لە ئاوابوون زیاترە. لەو سۆنگەوەش ئەدەبیاتی سۆفییانە بە مەبەستەوە نوور لە سیاقی مەشریقەوە بەکار دێنێ. ئەگەرچی بە گوێرەی ئایەتی نووری قورئان (لا شرقية ولا غربية)، نوورەکە بێ شوێنە، بەڵام لە ئاستی مومکینات و بوونەوەردا خۆرهەڵاتن لە خۆرئاوابوون هێزی زیاترە.

جزیری ئەم مەشریقەی بە چڕی ورد کردۆتەوە و لە چوارچێوەی گزنگی بەیانی و ساتی هەڵهاتنی خۆرەکەدا لێکی داوەتەوە، بۆیە لە چەندین شوێن دەربڕینی صوبح و سپێدەی بەکارهێناوە و لە تەکیدا چەمکی نووری بەهێزتر کردووە، ئەمەش دەلالەتە لەسەر ئەم بناغە عیرفانییەی، کە دەروازەیەکی دیکە بۆ چەمکی نوور دەکاتەوە. بە جۆرێک لەگەڵ چەمکی ئەزەلیشدا هاوتا دەبن و دەبنەوە بەشێک لە نووری ئەحمەدی (موحەممەدی)، کاتێک لە زاراوەی سۆفییەکاندا (خۆرهەڵات گوزارشتە لە جیهانی ڕۆح و خۆرئاواش گوزارشتە لە جیهانی جەستە. خۆرهەڵاتی ئەزەل، دونیای ڕۆح، دونیای ئەلەست، هەندێک جار بە خۆرهەڵاتی لاهووتیش گۆ دەکرێ، کە گوزارشتە لە

دونیای لاهووتی کە لە سەرووی جیهانی مەلەکووتەوەیە) [٢٣]. جزیریش بەم شێوەیە بۆی چووە:

**سوبحان ژ ڕەمزا خالقی        نوورا سپێدا صادقی**
**ئاڤێتە قەلبێ عاشقی        لەرزین و تاو و جەذبەدا /٥٢**

لە دەقــی تــردا زۆر وردبینــانە جزیــری عیشــقی ڕۆحــانی و خۆشەویستیی ڕاستەقینە دەخاتە چوارچێوەی ئەوانەی، کە بە نووری بەیانیان تاقی دەکرێنەوە. دواتر ئەم نوورە چەندین برین و جەزبە و لەرزین و تا لە کەسەکە دێنەکایەوە. هەروەک دەڵێ:

**هەر کەسێ موحبەت ژ ڕووحە    موبتەلای نوورا سوبووحە**
**وی د دل دا سەد جورووحە        جەذبە و لەرزین و تایە /٢٦٣**

**٢-٢-١-٧. پەیوەندیی نوور بە ئەزەلییەتەوە:**

مادەم ئەوە ساغکرایەوە کە نووری نوور دوای دروستکردنی زاتی خۆی، نووری ئەحمەدیی دروستکردووە، بۆیە ئەزەلبوون واتە دێرین و هەبوون لە سەرەتاوە و بێ سەرەتایشە، ئەمە دەبێتە خەسڵەتی خودا و لەگەڵ نــووردا بەیەکەوە دەدرەوشــێنەوە. ئەمە وێــڕای ئەوەی لەنــاو زانستی کەلامدا ساغبوونەوەی بۆ دەکرێ، بەڵام بەندیواربوونی لەگەڵ نووردا، ئەو ڕاستییە دووپات دەکاتەوە، کە جزیری بە ئاگاییەوە و پلە دوای پــلە هەمــوو ئەو شــتانەی لە خــوداوە نــزیکن دەیانخــاتە چوارچێوەیەک و دواتر لە ئاقاری نووری ئەحمەدیدا پەیوەندییەکان و بنەمایەکان دەستنیشان دەکات. هەروەک نوور و ئەزەل لە یەک دێڕدا چڕ دەکاتەوە و هەر لە سەرەتاوە ئاوا لە بارەی نوور و ئەزەلییەتی خوداوە دەدوێ:

**(الله) سەحەر گاها ئەزەل        یەلموومێ عشقێ شوعلەدا**
**نوورا جەمالا (لم یزل)        ذاتێ تەجەللایا خوەدا /٥١**

**٢-٢-٢. بنەماکانی نوور لە تاریکی (نووری ئیبلیسی):**

هەموو ئەوانەی پێشتر ئاماژەیان بۆ کرا، جۆرێک بوون لە نوور، کە پەیوەنــدییان بە تــاریکییەوە نەبــوو، بەڵکــو لە زاتــی خــوداوە

سەرچاوەیان گرتبوو، کە خودا (واجب الوجود)ە، واتە بوونەکەی پێویستە و پێویستی بە بوونێکی تر نییە کە بوونەکەی لەسەر بوەستێنێ، لەو ڕوانگەشەوە نووری خودا لێرەدا ئەسڵە و هەموو بوونەوەرەکانی تر لەوەوە نوور وەردەگرن، بەتایبەت ڕاستەوخۆ نووری ئەحمەدی یەکەمین تریسکەی بەردەکەوێ.

چەمکە دونیاییەکان، لەوەدا خۆیان گرمۆڵە دەکەن، کە دونیا بەر لە دروستبوونی ئەم شێوەیەی، بریتی بووە لە تەنێکی تاریک، لەم تاریکییەوە ڕووناکی دەرهێنراوە، جا کارلێککردنی ئەم دووانە کارێکی سەختە، بەتایبەتی دەستنیشانکردنی جیاوازییەکان، واتە چۆنیەتی لێک هاوێرکردنی نوور و تاریکی، لەوەشدا مرۆڤ مادەم مومکیناتە و بەشێک نییە لە نووری ئەحمەدی، چونکە (جیهانی تاریک بریتییە لە جەستە)[٢٤]، ئەم جەستەیەش دەبێ بە چەند قۆناغێکەوە بڕوات تا نووری لێ وەدیدەهێنرێ. بۆیە بە پێچەوانەی نووری ئەحمەدی دەبێ هەموو ئەم تەنە ڕۆشناییە بەخشانە بەکاربهێنرێن کە لە بنەڕەتدا ڕۆشنایی لە نووری ڕاستەقینە وەردەگرن، واتە خۆیان ناتوانن نوور و ڕۆشنایی بۆ خۆیان دابین بکەن. کە دەتوانین لەمانەی خوارەوەدا چڕیان بکەینەوە:

(ماهتاب = مانگ، شەو، زوڵف، زەوی، نەفرەت، جەلال، مەغریب) کە هەریەکێک لەمانە وەربگرین، لەو ڕۆشنتر هەیە و پشتیان بە ڕۆشنایی ڕاستەقینە بەستووە، کە لە تەوەرەی نووری ئەحمەدی ئاماژەمان بۆ کردن. بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە شیعری سۆفییانە بەگشتی و شیعری مەلای جزیری بەتایبەتی زۆر وردبینانە ئەم ڕوانینەیان بەرجەستە کردووە، بە جۆرێک ماهتاب کە ڕووناکی لە خۆر وەردەگرێ و بەهۆی خۆرەوە دەتوانێ تریسکاییەکانی پەخش بکات، بۆیە شاعیر چونکە خۆی بە کەسێکی مومکینات دەزانێ و هێشتا دڵ و دەروونی ڕۆشن نەبۆتەوە، خۆی دەخاتە لایەنی "مانگ" ماهتاب و یار و دڵبەریش دەخاتە لایەنی "خۆر" ئافتاب، کە نووری ڕاستەقینە و

ئەحمەدییە. لەلایەکی تر ئەگەر (نووری ئەحمەدی) نوورێک بێت خودا بە خەسڵەتی (جەمال) کەشفی ناو دڵ بکا، ئەوا بۆ سەر زەوی کە شەو و زوڵف لە تاریکیدا هاوبەشن، ئەگەر (خودا بە جەلالی خۆی ڕوانییە دڵ ئەوا دڵەکە فانی دەکا و دواتر مەحو دەبێتەوە) [٢٥] فانیبوونیش لە دونیا و سەرزەمین هەیە. وێڕای ئەمەش چونکە مەغریب نیشاندانی ئاوابوونی نوورە، هێزو تینی نوورەکە وەک تینی نووری بەیانیان نییە، بۆیە ئەمەش ئەو گوزارشتەی لێ دەکرێ کە نوورێکە لەگەڵ تاریکیدا بەیەکەوە دەخولێنەوە و وەک بینینی جیابوونەوەی ڕووناکییە لە تاریکی. ئەمەش کەم تا زۆر جزیری داویەتیە پاڵ خۆی و هەمیشە هەوڵی داوە بگاتە ئەو پلەیەی کە نووری ئەحمەدی لە دڵیدا بەرجەستە بکات:

**یەک د زاتێ سوڕ شرینان بوو جەمال و حوسن و سوڕ**
**یەک د قەلبێ ئەهلێ دل نارو جەلال و جەذبە بوو /٢٩٦**

یان:

**زوڵف چوونە سەر نوورا زەلال جارەک وەرە بایێ شەمال**
**بسکان ژ سەر دێمێ ڤەمال زولفان لەسەر جوهتێ ئەسەد/ ١٣٥**

یان:

**ژ هەردو چەشمێن تەی مەست و خوونریز**
**نوورا دو چەشمان کێ دی سەلامەت/٩٩**

لەلایەکی تر چاو و زوڵف بە نیشانەی ئیبلیس دەخەمڵێنرێن و زیانیان هەیە، بەوەی (ئەسکەندەر بە دوای ئاوی حەیاتەوە بوو بەچاوێک بە دوای کەوت کە لە تاریکیدا جێگیر بوو)[٢٦] بۆیە هەر ڕووناکییەک لە تاریکایی زوڵف و چاوەوە سەرچاوە بگرێ، بە واتای نوورێکە لە تاریکی دروست بووە. جزیریش ئەمەی ڕوون کردۆتەوە و کرداری وێرانکردنیان دەداتە پاڵ:

**عالەمێ وێران دکن زوڵفێن ژ ڕەنگێن عەنبەری**
**چەرخ و پەروازێ ددن جارەک ل بایێ ڕاست و چەپ/٨٣**

**یان نوور دەرهاتن لەسەر شەو (شەب):**

**جەبهەت کەشفی ژ صوبحێ صادیق**

**نوورێ کوڤەدا ژ سەر شەبێ داج/١٠٩**

یان:

**ئەرواحێ موقەددەس شەبێ قەدران تە دخوازن**

**نوورا تەیە مصباحێ د قەندیلی حەرەم دا / ٣٢**

لە دێڕێکدا (جزیری) دوو لایەنی نووری ئەحمەدی و نووری ئیبلیسی ڕوون دەکاتەوە و بەشێک لە بنەماکانیان دەخاتە ڕوو، وەک دەڵێ:

**مە کوفری دی د ئیسلام بێ — ژ شەرقێ ظوڵمەت و شام بێ**

**ژ زولفان عەنبەرێ خام بێ — کنارێ خاڵ و نیشانێ**

**دو زوڵفی عەنبەر ئەفشانن — دو لەعلێ شەککەرەستانن**

**دو چەشمێ سیحرێ فەتتانن — دلێ من وان خەدەنگ دانێ/٣٢٢**

لێرەدا بۆ کوفر زوڵمەت و شام (ئێوارە= مەغریب) و زوڵف و چەشمی بەکارهێناوە و لە بەرامبەریشدا بۆ ئیسلام (شەرق و شەککەر و خاڵ) ی بەکارهێناوە، کە بەڵگەن لەسەر پیادەکردنی واتا جیاوازەکانی نوور لەلای مەلای جزیریدا.

**ئەنجام:**

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- جزیری پێچەوانەی حاڵەتێکی مەولانای ڕۆمی، ناری نەکردۆتە دژی نوور، بەڵکو هاوشێوەی غەزالی تێگەیشتنی بۆ فتیلەی ئایەتەکەی نوور بریتییە لە سووتان بەرەو گەیشتن بە وەسڵ و یار و نووری نوور، کە ئەمەش هەنگاوێک زیاتر لە خودا و نووری ئەحمەدی نزیک دەبێتەوە.

٢- جزیری هاوشێوەی سۆفییەکان نوور لەگەڵ بادە و شەڕابی ئیلاهی هاوتا دەکات و پێی وایە پێش ئەوەی بوونەوەر بخولقێ نوور هەبووە، بۆیە نوور لەگەڵ خودا یەکسان دەکات.

٣- جزیری زیاد لە ١١٥ جار وەک فریکوێنس وشەی (نوور)ی پاتکردۆتەوە، کە تەنیا لە قەسیدەی (الله سەحەر)دا ٣٧ جاری هێناوە، ئەمەش بایەخی زیاد لە ڕادەبەدەری جزیرییە بۆ تێگەیشتن و سەرسامبوون بەم وشەیە.

٤- جزیری لە بەکارهێنانی سیاقی نووردا زۆر کارزانانە نووری نوور (نووری ئەحمەدی) لە نووری تاریک (نووری ئیبلیسی) جیاکردۆتەوە و پەیڕەوی هەموو ئەو بنەمایانەی کردووە کە ئەم نوورانە لەگەڵ هاوتاکانیان دێن، بۆیە لە نووری نووردا کە نووری ئەحمەدییە لەگەڵ چەمکەکانی عەرش، ئافتاب، ئەزەل، خەتوخاڵ، جەمال پەیوەستی کردوون و لە نووری ئیبلیسیشدا پێچەوانەی بونیادەکانی پێشوو، لەگەڵ جەلال و چەشم و زوڵف و عیشقی زەمینیدا بەندیواری کردوون، ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستییەیە جزیری بە هۆشیارییەوە مامەڵەی لەگەڵ شێوەکانی نوور کردووە، دواتر سەری کێشاوە بۆ چنینێکی جوان لەناو چوارچێوەی دەقی شیعریدا.

## پەراوێزەکان:

* جزیـری، نـاڤێ وی (ئەحـمەد)ە و نـاڤێ بـابێ وی (مـحەمەد)ە، خەڵکـێ (جزیـرا بۆتـان)ە. ل سـالا (٩٧٥)ی مشـەختی بەرانـبەری (١٥٦٧-١٥٦٨) زایینـی ژ دایـک بـوویەو ل سـالا (١٠٥٠)ی مشـەختی، بەرانـبەری (١٦٤٠)ێ زایینـی چـوویە بەر دلوڤانیـا خـودێ. شـێخ ئەحـمەدێ جزیـری ناسـناڤێن (مەلـێ، مەلاو نیشـانی) و هوزانێن خودا بکارئینایەنە.

دەمـێ ژی یـێ وی (٣٢) سـال، ل گونـدێ (سترباسـێ) ل نزیکـێ ئـامەدێ- و ژ مەلایەکی دبێژنێ: (مەلا طاها) ئیجازا مەلاتییێ وەرگرت و بوو مەلایەکێ دوازدە علم، و بوو ئێک ژ سەیداییێن مەدرەسا (سۆر) ل جزیرێ.

مەلایـێ جزیـرە بێ دووندەهـ بێ چـووی چـونکی ژن نەئینـابوو و گۆرا وی یێ د سەرداڤەکیڤە ل ئاڤاهییێ مەدرەسا (سۆر).

(دیوانا مەلایـێ جزیـری، تەحسـین ئیبـراهیم دوسـک، چاپا دووێ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ/ هەولێر، دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشـانێ/ دهـۆک، ٢٠٠٥، ل ١٩- ٢٦.

** بـۆ ئەم لێکـۆڵینەوەیە دیـوانی مەلای جزیـری، سـاغکردنەوەی تحسـین دۆسـکی، کـراوەتە کەرەسـتە و لەبەر زۆر هـاتنی نموونەکـان، پەراوێزمـان بـۆ دانەنـاوە و دوای هەر نموونەیەک بە ژمارە ئاماژەمان بە لاپەڕەکەی کردووە.

١- سورة النور، ئایەتی٣٥.

٢- لەوانە:

أ- بە واتای ئایینی ئیسلام لە ئایەتی (یریدون لیطفئوا نور الله ) ژمارە ٨ی سـورەی الصف و ژمارە ٣٥ی سورەی نوور.

ب- نوور بە واتای بڕوا و ئیمـان لە ئـایەتی١٢٢ی سـورەی ئەنعـام و ٢٨ی سـورەی الحدید و ٢٥٧ی بەقەرە.

ج- بە واتای ڕێنماییکەر لە ئایەتی ژمارە ٣٥ی سورەی نور.

د- بە واتای پێغەمبەر هەر لە ئایەتی پێشوو .

هـ- بە واتای ڕووناکایی ڕۆژ لە ئایەتی ١ی سورەی ئەنعام.

و- بە واتای ڕووناکایی مانگ لە ئایەتی ١٦ی سورەی نوح.

ز- بە واتـای ڕووناکـایی بڕوادار لەسـەر پردی سیرات لە ڕۆژی دوایی، لە ئـایەتی ١٢ی سورەی الحدید.

ح- بە واتـای ڕوونکـردنەوەی حەڵاڵ و حەرام لە تەوراتـدا لە ئـایەتی ٤٤ی سـورەی مائیدە، ٩١ی ئەنعام، ٤٨ی ئەنبیا.

ط- بە واتای قورئان، لە ئایەتی ١٨ی سورەی التغابن .
ي- بە واتای نووری خودا لە ئایەتی ٦٩ی الزمر.
بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە تەفسیرەکانی قورئانی پیرۆز، هەروەها تویژینەوەی (الفاظ النار والنور في القرآن الكريم، د.ايمان صالح سعدي، ئینتەرنێت) .
٣- المعجم الأوسط، أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني، تحقيق: طارق بن عوض الله بن محمد، عبدالمحسن بن إبراهيم الحسيني، دار الحرمين - القاهرة، ١٤١٥، ج٦، ص٢٧٨.
٤- مشكاة الانوار ضمن مجموع رسائل الامام الغزالي، دار الكتب العلمية، ط٤ بيروت، ٢٠٠٦م، ص١٧. هەروەها (نواورى هاى نسفى در ايه نور، دكتر محمد رضا يوسفى، الهه حيدرى جونقانى، مجله متن شناسى ادب فارسى (علمى - پژوهشى)، دانشگده ادبيات و علوم انسانى، دانشگاه اصفهان، دورهء جديد، شماره٢ (پياپى ١٤) تابستان ١٣٩١، ص١٢٧.

٥- نماد نور در ادبيات صوفيانه، بهمن نزهت، مطالعات عرفانى (مجله علمى- پژوهشى) دانشكده علوم انسانى دانشگاه كاشان، شماره نهم، بهارو تابستان ٨٨، ص١٦٣-١٦٧.
٦- فرهنگ اصطلاحات تعبيرات عرفانى، دكتر سيد جعفر سجادى، چاپ نهم، چاپ افست گلشن، انتشارات طهورى، تهران، ١٣٨٩، ص٧٧٢-٧٧٣.
٧- لەو سۆنگەیەوە ناوی سوهرەوەردی و نەسەفی دەهێنین، کە بە تەنیا یەک جۆر نووریان باس نەکردووە، جزیری بە کاریگەریی ئەم پێشڕەوانە و پێشڕەوانی تر نووری دابەشکردووە، ئەگەرچی لە هەموو بڕگەکانیشدا وەک یەک نەبن، بەڵام بیرۆکەی پۆلێنکردنەکە هی پێش جزیرییە. هەر بۆ نموونە سوهرەوەردی پانزە جۆر نوور باس دەکات و دەیانخاتە بواری بڕینی سلووک لای ئەهلی سلووک و هەر نوورێک لەوان پلەیەکە لەو سلووکەدا و ئاکامەکەیشی بۆ خواچوونە، وەک نوری ئەهلی مەعریفەت و ئەهلی بیدایەت و ئەهلی بەصیرەت و نوورێک کە چێژبەخشە و نوورێک کە لە دەماغ جێگیر دەبێ و نوورێک لە گەرماوگەرمی ویصال دێت و نوورێک ........هتد. بڕوانە (فرهنگ اصطلاحات تعبيرات عرفانى، ٥١W).
٨- انواع و مراتب كاربرديهاى نور در مثنوى، دكتر رضا روحانى، الهام عربشاهى كاشى، پژوهشهاى زبان و ادبيات فارسى (علمى – پژوهشى) دانشگده ادبيات

علوم انسانی- دانشگاه اصفهان، دوره جدید، سال سوم، شماره٣، (پیاپی ١١)، پاییز ١٣٩٠، ص٢٩.
٩- استعاره نور در دیوان شمس، مینا بهنام، پژوهشی نقد ادبی، فصلنامه علمی، سال دوم، شماره ١٠، تابستان ١٣٨٩، ص١٠٨.
١٠- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە فەرهەنگەکانی سۆفیگەری لەبابەت زاراوەکانی شەڕاب، بەتایبەتی: فرهنگ اصطلاحات تعبیرات عرفانی دکتر سید جعفر سجادی، چاپ نهم، افست گلشن، ١٣٨٩.
١١- مراتب انوار و تطبیق ان با نصوص عرفانی و شعر مولوی، محبوبه عبداللهی اهر، فصلنامه علمی پژوهش کاوش نامه، سال یازدهم، شماره ٢١، ١٣٨٩، ص١٩٤.
١٢- فلسفه العشق الالهي فی شعر الجزیري، محمد امین دوسكي، راجعه وقدم له د. محمد بكر، منشورات وزارة الثقافة، دهوک، ٢٠٠٠، ص١٢٥.
١٣- مراتب انوار و تطبیق ان با نصوص عرفانی و شعر مولوی، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٠٢ .
١٤- لەبەر سنووری باسەکە ناتوانین بە درێژی لەسەر ئەم چەمکانە بدوێین. بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی حەقیقەتی موحەممەدی بڕوانە: ڕەنگدانەوەی کەسێتی و دنیابینی حەللاج لە شیعری کلاسیکی کوردی و فارسیدا بەتایبەت لای مەحوی و حافزی شیرازی، سەبور عەبدولکەریم (شکار)، سلێمانی ٢٠٠٩، لا١٦٩-١٩٢.
١٥- نور سیاه پارادوکس زیبای عرفانی، محمد رضا یوسفی، الهه حیدری، مجله ادیان و عرفان، سال چهل و پنجم، شماره دوم، پایزو زمستان ١٣٩١، ص١٧٦.
١٦- فەرهەنگی سۆفییانەی دیوانی جزیری و مەحوی، د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر٢٠١٠، لا١٣٥.
١٧- نور و مباحث مشترک ان در فلسفه اشراق و شعر مولوی، محبوبه عبدالهی اهر، فصلنامه فلسفه و کلام اسلامی اینه معرفت، دانشگاه شهید بهشتی، پاییز ١٣٨٧، ص١٢٠.
١٨- فەرهەنگی سۆفییانەی دیوانی جزیری و مەحوی، سەرچاوەی پێشوو، لا١٧٢.
١٩- رواه الطبراني في معجمه الأوسط ج ٦/ ص ١٥٣ حديث رقم: ٦٠٦٢.
٢٠- رواه الخطيب/جامع الأحاديث القدسية/ ١/ص١٥٤.
٢١- فەرهەنگی سۆفییانەی دیوانی جزیری و مەحوی، سەرچاوەی پێشوو لا١٣٠.
٢٢- فرهنگ اصطلاحات تعبیرات عرفانی، دکتر سید جعفر سجادی، چاپ نهم، افست گلشن، ١٣٨٩،ص٧٣٣.

٢٣- سەرچاوەی پێشوو لا٧٢٥.
٢٤- سهروردی شیخ اشراق مدیحه سرای نور، نگارش عطاءالله تدین، چاپ چهارم، انتشارات تهران، ١٣٨٨. ص٢٠٦.
٢٥- الجمال وجلال الجمال في القرآن الكريم من منظور صوفي وانعكاسهما في الزخرفة الاسلامية، د. ضاري مظهر صالح، الطبعة الاولى، بغداد٢٠١٣، ص٢٦.
٢٦- فرهنگ اصطلاحات تعبیرات عرفانی، ص٣٠٤.

## سەرچاوەکان


دوای قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ).

**یەکەم : بە زمانی کوردی**

کتێب:

١- دیوانا مەلایێ جزیری، بەرهەڤکرن: تحسین ابراهیم دوسکی، چاپا دوویێ، دەزگای سپیرێز ، دهۆک، ٢٠٠٥.
٢- رەنگدانەوەی کەسێتی و دنیابینی حەلاج لە شیعری کلاسیکی کوردی و فارسیدا بەتایبەت لای مەحوی و حافزی شیرازی، سەبور عەبدولکەریم (شکار)، چاپی یەکەم، ، چاپخانەی کەمال، سلێمانی ٢٠٠٩.
٣- فەرهەنگی سۆفییانەی دیوانی جزیری و مەحوی، د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر،٢٠١٠.

**دووەم: بە زمانی فارسی:**

کتێب:

١- سهروردی شیخ اشراق مدیحه سرای نور، نگارش عطاءالله تدین، چاپ چهارم، انتشارات تهران، ١٣٨٨.
٢- فرهنگ اصطلاحات تعبیراتی عرفانی، دکتر سید جعفر سجادی، چاپ نهم، افست گلشن، ١٣٨٩.

گۆڤار:

١- استعاره نور در دیوان شمس، مینا بهنام، پژوهشی نقد ادبی، فصلنامه علمی، سال دوم، شماره ١٠، تابستان ١٣٨٩.
٢- انواع و مراتب کاربردیهای نور در مثنوی، دکتر رضا روحانی، الهام عربشاهی کاشی، پژوهشهای زبان و ادبیات فارسی (علمی– پژوهشی) دانشگده ادبیات

علوم انسانی- دانشگاه اصفهان، دوره جدید، سال سوم، شماره۳، (پیاپی ۱۱)، پاییز ۱۳۹۰.
۳- مراتب انوار و تطبیق ان با نصوص عرفانی و شعر مولوی، محبوبه عبداللهی اهر، فصلنامه علمی پژوهش کاوش نامه، سال یازدهم، شماره ۲۱، ۱۳۸۹.
٤- نماد نور در ادبیات صوفیانه، بهمن نزهت، مطالعات عرفانی (مجله علمی- پژوهشی) دانشکده علوم انسانی دانشگاه کاشان، شماره نهم، بهارو تابستان ۱۳۸۸.
٥- نواوری های نسفی در ایه نور، دکتر محمد رضا یوسفی، الهه حیدری جونقانی، مجله متن شناسی ادب فارسی (علمی - پژوهشی)، دانشگده ادبیات و علوم انسانی، دانشگاه اصفهان، دورهء جدید، شماره۲ (پیاپی ١٤) تابستان ۱۳۹۱.
٦- نور سیاه پارادوکس زیبای عرفانی، محمد رضا یوسفی، الهه حیدری، مجله ادیان و عرفان، سال چهل و پنجم، شماره دوم، پایزو زمستان ۱۳۹۱.
٧- نور و مباحث مشترک ان در فلسفه اشراق و شعر مولوی، محبوبه عبدالهی اهر، فصلنامه فلسفه و کلام اسلامی اینه معرفت، دانشگاه شهید بهشتی، پاییز ۱۳۸۷.

**سێیەم: بە زمانی عەرەبی**

کتێب:
١- الجمال وجلال الجمال في القران الكريم من منظور صوفي وانعكاسهما في الزخرفة الاسلامية، د. ضاري مظهر صالح، الطبعة الاولى، بغداد،٢٠١٣.
٢- فلسفه العشق الالهي في شعر الجزيري، محمد امين دوسكي، راجعه وقدم له د. محمد بكر، منشورات وزارة الثقافة، دهوك، ٢٠٠٠.
٣- مشكاة الانوار ضمن مجموع رسائل الامام الغزالي، دار الكتب العلمية، ط٤ بيروت، ٢٠٠٦.
٤- المعجم الأوسط، أبو القاسم سليمان بن احمد الطبراني، تحقيق: طارق بن عوض الله بن محمد، عبد المحسن بن إبراهيم الحسيني، ج٦، دار الحرمين - القاهرة ، ١٤١٥.

**ئینتەرنێت:**

الفاظ النار والنور في القرآن الكريم، د. ايمان صالح سعدي
www.iasj.net/iasj?func=fulltext&aId ٤٣٣٦٧=

## پوختەی توێژینەوە

نوور و شێوەکانی لە شیعری (مەلای جزیری)دا، ناونیشانی ئەو لێکۆڵینەوەیە، کە هەوڵی داوە لە ڕەهەندێکی عیرفانییانە لە چەمکی (نوور) بکۆڵێتەوە، بەو پێیەی نوور وەک دیاردەیەکی نێو شیعری ڕۆژهەڵات و شیعری نەتەوە مسوڵمانەکان و لەنێویشیاندا شیعری کلاسیکی کوردی ڕووبەرێکی فراوانی بەرجەستە کردووە. باسەکە وێڕای ئەوەی لە تەوەری یەکەمدا تیشک دەخاتە سەر چەمکی نوور لە سەرچاوەی ئیسلامی لە هەریەکە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر و کەلەپووری ئیسلامی. لە تەوەری دووەمدا شیعرەکانی جزیری وەک نموونە وەرگیراون، بەهۆی ئەوەی جگە لەوەی ناوبراو عاریفێکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە، ئەم چەمکەشی فەرامۆش نەکردووە، بۆیە نوور وەک بنەمایەک بۆ ڕاڤەکردنی جودا لە سیاقدا چەند شێوەیەک لەخۆدەگرێ، لەوانە بنەمای نووری نار، نووری بادە، نووری خودا، نووری ئەحمەدی، نووری بەرزەخی. دواتر لەناو لقەکانی نووردا هەردوو لقی نووری نوور کە بە نووری ئەحمەدی ناسراوە لەگەڵ نووری تاریکی کە بە نووری ئیبلیسی ناسراوە باسیان لێوەکراوە، لە یەکەمیاندا وەک بنەما پەیوەندیی لەگەڵ چەمکەکانی (ئافتاب و ڕۆژ و عەرش و جەمال و ئەزەل و مەشریق و خەت و خاڵ) و لە دووەمیشیاندا پەیوەندیی لەگەڵ جەلال و چەشم و زوڵف و مەغریب لێی کۆڵدراوەتەوە. باسەکە هەوڵی داوە واتایەکی دیکە بۆ هەریەکە لە سیاقی هاتنی ئەم چەمکە بدۆزێتەوە و لە ڕوانگەیەکی تەئویلییانە و بەسوود وەرگرتن لە چەمکە عیرفانییەکان دیوە شاردراوەکانی بخاتە ڕوو.

وشەی کلیلی: نوور، نووری نار، نووری ئەحمەدی، مەلای جزیری

## ملخص البحث

هذه الدراسة الموسومة بـ (النور وأشكاله في شعر ملا الجزيري) محاولة لدراسة مفهوم (النور) من منظور التصوف والعرفان، علما بأن النور ظاهرة بارزة في النصوص الشرقية، واحتل مساحة كبيرة فيها، ولاسيما في النصوص الإسلامية، ومن بينها النصوص الكوردية القديمة. وقسمت هذه الدراسة على محورين، ففي المحور الأول أخذ بعين الاعتبار مفهوم النور في القرآن والمصادر الإسلامية التراثية. أما المحور الثاني فقد تناول نصوصا من أشعار ملا الجزيري الكوردية للتطبيق، إذ إنه يعد من أهم الشعراء الكورد الصوفيين، فقد استعمل مفهوم النور بكثرة وبأشكال متعددة، مثل (نور النار، ونور الخمر، ونور الله، ونور البرزخ، والنور الأحمدي)، ثم عرض البحث أقسام النور ومن بينها نور النور (النور الأحمدي)، ونور النور الصادر من الظلام (النور الإبليسي). تحدثنا في النور الأحمدي عن علاقة النور بكل من (الشمس، والنهار، والعرش، والجمال، والأزل، والمشرق، والخال والخط)، أما في النور الإبليسي فتناولنا علاقة النور بكل من مفهوم الجلال والعين وشعر المرأة. وحاولنا في كلا المحورين أن نكشف عن معان أخرى لكلمة النور بسياقات مختلفة وبتأويلات تراثية من خلال الاستعانة بقواعد عرفانية قديمة.

## Abstract

*Noor* and its types in Melay Ciziri's poetry is the title of this research in which the researchers explore the concept of *noor* from the viewpoint of Sufism. Since *noor* is a practise widely used in the literature of the Muslim cultures and people, including Kurdish, a special argument is debated in this research. This research comprised on two parts. The first part highlights the concept of *noor* from the wealth of Islamic resources that includes Quranic verses and the Prophet's sayings. The second part, however, examples of Ciziri's poems are shown as cases for analysing. It is also shown that Ciziri, as a Sufi poet, paid a great respect to *noor* in his poetic works.

The researchers discussed *noor* and its variations, which include *noori nar, noori bada, noori Khuda, noori ahmadi* and *noori barzakhi*, in this research. They then discourse about both mainstream styles of *noor*: first, is *noori noor*, which is known as *noori ahmadi*; second, is dark *noor,* which is also known as *noori Iblisi.* In *noori noor,* the first style, the researchers discuss the links between *noori noor* and its relation to these concepts: *aftab, roj, arsh, jamal, ezel, mashriq and khatukhal.* In the second style, dark *noor*, links to concepts such as *jalal, chashm, zulf and makhriq* is discussed. The researchers argue to define *noor* from the viewpoint of Sufism and give another meaning to the contemporary research methodology in Ciziri's work.

# مۆنۆلۆگی درامی لە قەسیدەی (هەولێر لە یەکی شوباتا) ی عەبدوڵلا پەشێودا

**د. سەنگەر قادر شێخ محەمەد حاجی**
کۆلێژی پەروەردە– شەقلاوە
زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

**پێشەکی:**

ئەم لێکۆڵینەوەیە بە ناونیشانی (مۆنۆلۆگی درامی لە قەسیدەی "هەولێرلە یەکی شوباتدا"ی عەبدوڵلا پەشێودا) یە. ئەم لێکۆڵینەوەیە دابەشی سەر دوو بەشی سەرەکی کراوە و هەر بەشێکی لە چەند تەوەر و لقێك پێکدێ. لە بەشی یەکەمدا ئێمە قسەمان لەسەر چەند تەوەرێك کردووە تا بەشێوەیەکی روون چەمك و چییەتی مۆنۆلۆگی درامی بخەینە روو. هەروەها لەبارەی گرنگی و تایبەتمەندی و بنیاتی مۆنۆلۆگی درامی دواوین. جگە لەمانەش پەیوەندیی مۆنۆلۆگی درامی بە ژانرە ئەدەبییەکان و بە رەخنەی ئەدەبی هاوچەرخ دوو تەوەری سەرەکین کە لەبەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە کاریان لەسەر کراوە. سەرەڕای ئەمانەش جیاوازی نێوان مۆنۆلۆگی درامی و خۆدواندن و ئەو توخمانەی کە دەتوانین بەهۆیانەوە ئەو دوو هونەرە ئەدەبییە لە یەکتری جودابکەینەوە.

لە بەشی دووەمدا کە بەشی پراکتیکی ئەم لێکۆڵینەوەیە پێکدێنێ، هەموو ئەو بابەت و تەوەرانەی لەبەشی یەکەمدا خراونەتە روو. لەبەشی دووەمدا لەسەر قەسیدەی (هەولێر لە یەکی شوباتدا ی عەبدوڵلا پەشێو) پراکتیزەکراون و تایبەتمەندییە دیارەکانی مۆنۆلۆگی درامی لەناو ئەم قەسیدەیەدا دەستنیشانکراون دواتریش ئەنجام و سەرچاوەکان بەجیا خراونەتەروو.

## تەوەری یەکەم: چەمك و تایبە تمەندییەکانی مۆنۆلۆگی درامی

### ١-١ چەمکی مۆنۆلۆگی درامی:

هەر چەمکێکی ئەدەبی وەربگرین ریشەییێکی هەیە و مانایەك یان چەند واتایەکی هەن کە لە فەزا و ژینگە و کات و شوێنی جیاوازدا هەر خۆی، بەلاّم بە یەکێك لەو مانایانە، بەکاردێ. هەندێك چەمك لەناو دونیای ئەدەبدا زوو خۆ بەدەستەوە دەدەن و واتاکەیان رێك لەگەڵ رەهەند و کردارەکە دێتەوە، بەلاّم هەندێکی دیکە ئالۆزن و بە ئاسانی ناتوانین ماناکانیان دەستەبەر بکەین، یان بڵێین بەڵێ رەهەند و مانای ئەم چەمکە ئەمەیە. مۆنۆلۆگی درامی کە بە ئینگلیزییەکەی پێی دەگوترێ (Dramatic Monologue) چەمکێکی ئالۆزە و لە دوو وشە پێکدێ: یەکەمیان (Dramatic) واتا درامی و دووەمیشیان (Monologue) کە لە کوردیشدا بەزۆری ناوەندە ئەکادیمییەکان هەر مۆنۆلۆگی بۆ بەکاردەهێنن. (Dramatic) واتای (لەپڕ و زۆر مەزن دەگەیێنێ) (Sally Wehmeir et al:463). هەرچی مۆنۆلۆگ (Monologue)ە، ئەوا خۆشی وشەیەکی لێکدراوە و لە دوو بەش پێکدێ (( (Mono) کە واتای یەك ئاڕاستەیە و (Logue) یش واتای ئاخاوتن یان قسەکردن دەدات)) (Sally Wehmeir et al:905) بەم پێیە بێ مۆنۆلۆگ واتا یەك ئاڕاستەیی لە قسەکردندا و ئەمەش واتای ئەوەیە کە تەنیا یەك قسەکەرمان هەیە و کەسی دیکەمان نییە وەلاّمبداتەوە. تا ئێرە کێشەمان نییە، بەلاّم کاتێك وشە یان چەمکی درامی دەخەینە پاڵ ئەم دوو وشەیە چەمکێکی ئالۆزمان بۆ دروست دەبێ کە ئەگەر تەنیا واتای وشەکان وەربگرین دەبینین واتای قسەکردنێکی درامی دەدات کە کەس نییە وەلاّممان بداتەوە، بەلاّم ئایا ئەمە بەڕاستی پڕ بە پێستی ئەم چەمکە ئەدەبییەیە یان نا؟

دەبێ ئاگاداری ئەوە بین کە وشەی (درامی) لە (مۆنۆلۆگی درامی)دا هیچ پەیوەندییێکی بە (سەرنجڕاکێشی) و (جەختکردنەوە) و (روونی)یەوە نییە کە ئەمانە خەسڵەتی درامی هەر رووداو و بەرهەمێکن. مۆنۆلۆگی درامی چ لەسەر تەختی شانۆ بێ، یان لە شیعرێکدابێ لەتوانایدایە بەتەواوی بگونجێ و دەربکەوێ. بەپێی بۆچوونی (ئێدگار هسۆمپسن) بێ، مۆنۆلۆگی درامی (( تەنیا پێویستی بەوەیە سەرنجڕاکێش بێ)) (Edgar H. Thompson:39) ئەمەش لە دوو لایەنەوە

سەرچاوە دەگرێ، یەکەمیان هەر بابەتێك ناکرێ بکرێتە بابەتێکی ئەدەبی و سەرکەوتووش بێ ئەگەر توخمی سەرنجڕاکێشی تێدا نەبێ، چونکە خوێنەر ئامادە نییە بابەتێك بخوێنێتەوە کە سەرنجی ڕانەکێشێ.

دووەمیشیان، مۆنۆلۆگی درامی گێڕانەوەی تێدایە و گێڕانەوەش هەم پێویستی بە دروستکردنی فەزاییێکی سەرنج ڕاکێش هەیە و هەم فەزاکەشی بواری ئەفراندنی توخمی سەرنجڕاکێشی تێدا دەستەبەر دەکرێ.

ئەمە هەمووی واتای ئەوەیە کە کاتێك قسە لەبارەی ڕیشەی مۆنۆلۆگی درامی دەکەین، بەرەوڕووی سێ وشە دەبینەوە ئەوانیش (درامی Dramatic) و (تاك Mono) و (قسەکردن Logue) کە واتای (لەپڕ) و (کاتێك) و (قسەکردن) دەدەن و هەمووشیان بەیەکەوە واتای ئەوە دەدەن کە (کەسێك بەخەیاڵ قسە لەگەڵ کەسێکی دیکە دەکات و دونیایێك شتی بۆ دەگێڕێتەوە و بابەتی جۆراوجۆری بۆ دەکاتەوە، بەڵام لەبەرانبەردا هیچ کەس نییە وەڵام بداتەوە.

### ١-٢ پێناسەی مۆنۆلۆگی درامی:

ئاشکرایە، زۆرینەی ئەو چەمك و دیاریدە و تەکنیك و هونەرانەی پەیوەندییان بە زانستە مرۆڤایەتییەکانەوە هەیە پێناسەی زۆریان بۆ کراون کە ناتوانین هیچ کامێکیان بە ڕەهایی قبوڵ بکەین و ناشکرێ هیچیان بە ڕەهایی ڕەت بکەینەوە، چونکە لە هەر یەکێکیان چەند حەقیقەتێك خراونەتە ڕوو و لەهەر یەکێکیشیان چەند حەقیقەتێك فەرامۆش کراون.

مۆنۆلۆگی درامی بریتییە لە شیعرێك کە لەسەر شێوەی گفتوگۆدا نووسراوە و هی تاکە کارەکتەرێکە. ((ئەو دەخزێنرێتە ناو دیمەنێکی ڕوونەوە کە پەیوەندی بە مێژوو یان سایکۆلۆژیای کارەکتەرەکەوە هەیە)) ( Dramatic Monologue Article Press:310). مۆنۆلۆگی درامی پەیوەندییێکی ڕاستەوخۆی بە دەروون و نەستەوە هەیە. شاعیر لە یارەکەی دوورە یان لەدەستی داوە و ئێستا دەیەوێ شتێکی پێبڵێ. ئەو دەیەوێ هەموو ئەو شتانە دەربڕێ کە لە زەین و مێشکی خۆی هەڵیگرتوون لەوساتەوەی نەیدیوە. هاوڕێیەکی نزیکی لە زیندانە و دەیەوێ پێبڵێ ژیان دوور لە هاوڕێی خۆشەویست پڕیەتی لە تاڵی و ناخۆشی و چەڵەمە. شاعیر خاکی داگیر کراوە، ئێستا دێ و دەیەوێ ئەوەی هەیەتی دەربڕێ، بەڵام لەگەڵ

کێ؟ ڕەنگە ئەو نەیەوێ کەس لەو خەمەی بەشدار بێ، یان متمانە بەکەس نەکا، لەوانەشە بیەوێ هەر خۆی قسەبکات و هێندە کۆڵ لە دڵ بێ ڕێگە بە کەسی دیکە نەدا ببێتە هاوبەش لە قسەکردن و سەرەنجام تەکنیکی مۆنۆلۆگی درامی هەڵدەبژێرێ.

(ئەبرامز) لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ((مۆنۆلۆگی درامی بەشێك نییە لە شانۆ، بەڵکو جۆرێکە لە شیعری لیریکی)) (M.H. Abrams:85) تاکە پەیوەندییەك کە لە نێوان شانۆ و مۆنۆلۆگی درامیدا هەیە، ئەو گفتوگۆیەیە کە لەنێوان دوو کارەکتەر ئەنجام دەدرێ. لە یەکەمیاندا قسەکەر و گوێگر هەن و زانیاری و تێڕوانینەکانیان دەگۆڕنەوە، هەرچی دووەمیانە قسەکەر و گوێگر هەن، بەلاّم گوێگر هیچ بەشدارییێك لە گفتوگۆکەدا ناکا و زۆرجاریش گوێگر وێنا دەکرێ و لەوێ ئامادە نییە. ئەم پێناسەیە نە ڕەگەز و نە توخم و نە هیچ تایبەتمەندییەکی مۆنۆلۆگی درامیمان بۆ دیار ناکا، تا لەڕێیەوە بزانین مۆنۆلۆگی درامی چییە و چۆن دەنووسرێ. کەچی لە هەمان کاتدا بابەتێکی گرنگی وروژاندووە و تاڕادەییێك یەکلایشی کردۆتەوە کە ئەوەی دەیەوێ ئەم تەکنیکەی شیعر نووسین بەکاربێنی دەبێ بە نەفەسی شاعیرێکی لیریکی شیعرەکە بهۆنێتەوە، نەك بە نەفەسی دراما نووسێك کە شیعر وەکو ئامرازێکی یارمەتیدەر و پێناو بەکاردەهێنێت، نەك وەك خودی مەبەست.

مۆنۆلۆگی درامی بریتییە لە شیعرێکی لیریکی کە تێیدا قسەکەر قسە لەگەڵ گوێگرێکی کڕ و کپ دەکات و خۆی لە فەزای حاڵەتێکی درامیدا دەردەخات، کارەکتەرەکە قسە لەگەڵ گوێگری ناسراو، بەلاّم بێ دەنگ دەکات لە ساتێکی درامی ژیانی قسەکەرەکە. ئەو بارودۆخەی دەوری گفتوگۆکەی داوە، وای لێکردووە گفتوگۆ تاك لایەنەکەی کە بەرهەمی مۆنۆلۆگی درامییە لە ڕێی ئەنجامێکی ڕوونەوە کە لەناخی کارەکتەرەکەوە هەڵێنجراوە، سەرچاوە بگرێ.

**هەروەها** (J.A. Cuddon) لە فەرهەنگە بەناوبانگەکەیدا (Literary Terms) بەم شێوەیە پێناسەی مۆنۆلۆگی درامی دەکا ((شیعرێکە کە قسەکەرێکی خەیاڵی قسە لەگەڵ گوێگرێکی خەیاڵی دەکا)) (Cuddon:401). دەبێ لێرەدا چەمکی (خەیاڵیبوون) ڕوون بکەینەوە، چونکە لە مۆنۆلۆگی درامیدا هەم قسەکەر و هەم

ئـەوەی قسەشـی لەگەڵـدا دەکـرێ، بوونیـان هەیـە، بـەڵام مـەرج نییـە لـە دەمـی قسەکردندا ئامادەیان هەبێ. (زین) ی (ئەحمەدی خانی) (مۆم) دەکاتـە هـاودەمی خۆی و دڵنیاشـە لـەوەی ئـەو بوونـە وەڵامـی ناداتـەوە، بـەڵام ئـەو هـەر دەیکاتـە دەمسازی خۆی. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە گـوێگری مۆنۆلـۆگی درامـی بـوونی هەیە.

هــەروەها قســەکەر لــە مۆنۆلــۆگی درامــی یــان شــاعیرە کــە مرۆڤێکــی راستەقینەیە، یان شاعیر دەبێتە زمان حاڵی کەس یان شتێکی دیکە کـە ئـەوانیش واقیعین و خاوەنی بوونی خۆیانن. بەم پێیە خەیاڵی بوون بەمانا دیارەکـەی خـۆی لەگەڵ ئەم تەکنیکە نایێتەوە. کەواتە (Cuddon) بۆ پێی وایە لەم جـۆرە شـیعرەدا هەم قسەکەر و هەم گوێگریش خەیاڵین؟

لە مۆنۆلـۆگی درامیـدا خـەیاڵ هـەموو دەم ئامـادەیی هەیـە، ئـەویش بـە دوو شێوە: یان ئەوەتا شاعیر رووداوێکی بەسەرهاتووە و ئێستا بووە بە مێـژوو و ئـەو دێ بە خەیاڵی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە. یان شاعیر لەگەڵ بوونێك دەدوێ کە ئـەو بوونە بەرجەستەیە و ناتوانێ قسە بکا و ئەمەش خۆی لەخۆیدا خەیاڵە.

مۆنۆلۆگی درامی ((گوتارێکی نەپساوە و بەردەوامە (لەکاتی ئێسـتا) لەلایـەن کارەکتەرێکەوە دروسـتدەکرێ کـە قسـە لەگـەڵ (هیـوا) یـان (نیـەت)ێك دەکـا بـۆ بەئەنجامگەیاندنی هەندێك گۆڕانکاریی لـەبارودۆخی خۆیـدا، ئەمـەش عادەتـەن بـە دروستکردنی کاریگـەری لەسـەر هەنـدێك گۆڕانکـاری لەسـەر کارەکتـەر یـان چـەند کارەکتەرێك دەبێ کە ئەو لـە شـیعرەکەدا لەگـەڵیان دەدوێ)) (Hougton:114) لـە مۆنۆلۆگی درامیدا کاتێك شـاعیر دەسـت بـە هۆنینـەوەی شـیعرەکەی (قسـەکردن) دەکات تا کۆتایی شیعرەکە بەردەوام دەبـێ لـە قسـەکردن، چـونکە هـیچ کەسـێك هــیچ پرســیارێکی لێ ناپرســێت و جگــە لــەو زانیارییانــەی خۆشــی لــەبارەی پرسیارەکانی خۆیەوە هەیەتی کەسی دیکە نییە زانیاریی زیاتری پێ ببەخشێ.

ئەو بوونەی شاعیر قسەی بۆ دەکات و لەگەڵی دەدوێ، بوونێکە شـاعیر هیـوا و ئومێدێکی زۆری پێیە. ئەگەرچی زۆربەی جار (قسە بۆ کـراو) لای قسـەکەر نییـە یان لەدەستی داوە و ئێستا دەستی پێی ناگا، بەڵام (قسەکەر) هیوا بـڕاو نابێـت و بـەردەوام دەبـێ لـە ژیـان لـە سـاتێك لـە سـاتەکان لەگـەڵ (قسـە بۆکراو)ەکـەی.

هەروەها شاعیر له هۆنینەوەی شیعرەکەیدا نییەتێك دەخاتە روو کە دەیەوێ هەم بە (قسە بۆکراو) و هەم بە گوێگرانیش بڵێ من مەبەستم له هۆنینەوەی ئەو شیعرە ئەمەیە.

مۆنۆلۆگی درامی ((فۆرمێکی ئەدەبییە کە تێیدا کارەکتەرێك قسە لەگەڵ گوێگرێکی بێ دەنگ دەکات لەساتێکی گلەیی ئامێزدا و ئەوەی هەیەتی لەحاڵەتێکی درامیدا دەیخاتە روو)) (Random Hose: 35) بەپێی ئەم پێناسەیە بێ دەبێ ئێمە لە مۆنۆلۆگی درامیدا (ساتی گلەیی)مان هەبێ لەگەڵ (حاڵەتێکی درامی). (ساتی گلەیی) هەمیشە لە مۆنۆلۆگی درامیدا ئامادەیی هەیە، چونکە شاعیر گلەیی له شتێك یان حاڵەت و بارودۆخێك دەکات، یان حەزی له شتێك نییە و دەیەوێت بیگۆڕێ. ئەو گۆڕان و گواستنەوانەی لە فەزای دەقەکە و لەناو دەقەکەدا روودەدەن جووڵە و بزاوتێکی درامیمان بۆ دەئافرێنن.

زۆرێك لەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانەی له شانۆ و گفتوگۆی شانۆییدا هەن لە مۆنۆلۆگی درامیشدا بەدیاردەکەون: تاکە کەسێك قسەدەکا، لە قسەکردنەکەشیدا کەسێتیی خۆیان پێ دەناسێنێ و ئاشنای بیروباوەڕەکانی دەبین، ئەو حاڵەتەمان بۆ روون دەبێتەوە کە شاعیر تێکەوتووە بەوەی لەسەرەتادا چیرۆکەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە تا کۆتایی پێمان دەڵێ ئەو بۆ تووشی ئەم حاڵەتە بووە و بۆ وای بەسەردا هاتووە.

### ١-٣ گرنگیی مۆنۆلۆگی درامی:

بە پشتبەستن بەو بیروڕایەی کە لە شیعردا هەموو دەنگێك هەموو وشەیێك و گرێ و رستەیێك و هەر وێنەیێك.. هتد خاوەنی گرنگی و بایەخی خۆیانن، دەتوانین بڵێین مۆنۆلۆگی درامی خاوەنی گرنگیی خۆیەتی، چونکە فۆرمێکی نوێی شیعرییە. هەروەها خاڵی بەیەکگەیشتنی دراما و شیعرە.

دەکرێ بڵێین لە مۆنۆلۆگی درامیدا مێژوو خۆی بە پێچەوانەوە دووبارە کردۆتەوە، چونکە لە سەرەتادا دراما لە رێی شیعرەوە دەنووسرا، بەلاّم لە مۆنۆلۆگی درامیدا شیعر پەنای بۆ دراما بردووە بۆ دروستکردنی فۆرمێکی نوێی شیعری. ئەمەش کارێکی ئاسایی و رێپێدراوە و دواجار بە تێکچڕژان و تێکەڵبوونەوەی جۆر و ژانرە ئەدەبییەکانە لە سەدەی بیست و یەکەمدا وایکردووە

بە ئەستەم بتوانین جۆرە ئەدەبییەکان و تایبەتمەندییەکانیان لەیەك جودا بکەینەوە.

ئەگەر نووسەر ((شانۆگەری بنووسێ یان ڕۆمان ئەوا مۆنۆلۆگی درامی ئامرازێکی گرنگە بۆ خێراترکردنی پەرەسەندنەکانی کارەکتەر و تیشك خستنەسەر سەرەکیترین مەغزاکانی دەقە چیرۆك ئامێزەکان)) (Anjeli,et al: 21) ئەوەی (ئەنجیلی) و هاوڕێکانی دەیڵێن سەلمێنەری ئەوەیە کە مۆنۆلۆگی درامی هەر تایبەت نییە بە جۆرە شیعرێك کە ئەم ناوەی لێنراوە، بەڵکو دەکرێ لەناو دراماش پەنا بۆ بەکارهێنانی ئەم جۆرە تەکنیکە ببرێ. هەروەها ئەم تەکنیکە لەناو ڕۆمانیشدا زۆر بە ئاسانی شوێنی خۆی دەگرێ، چونکە ڕۆمان خەسڵەتی لەخۆگرتنی هەموو ژانرە ئەدەبییەکانی دیکەی هەیە و یەکێك لەو توخمانەی کە بەردەوام لەناو ڕۆماندا ئامادەیە، مۆنۆلۆگە.

لێرەدا پرسیارێك خۆی رەپێش دەکات، ئایا دراما کە یەکێك لە توخمە سەرەکییەکانی مۆنۆلۆگە بە هەموو جۆرەکانییەوە و خۆشی پڕیەتی لە حاڵەتی درامی، بۆ ناتوانین هەموو مۆنۆلۆگەکانی ناو دراما بە (مۆنۆلۆگی درامی) دابنێین؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەمەیە، بۆئەوەی مۆنۆلۆگێك بە (مۆنۆلۆگی درامی) دابنرێت، پێویستە زمانێکی شیعری بە هەموو ڕەهەند و جوانکاری و ڕەوانی و وردەکاری و پڕ هەستییەوە تێدا بەکاربێت.

هەروەها ئەرکێکی دیکەی مۆنۆلۆگی درامی ئەوەیە کاتێك دەقێك دەخوێنیتەوە کە مۆنۆلۆگی درامی تێدا بەکارهاتبێ ((دەتوانی ئەوە هەڵبهێنجی کە ئەو (ئەو)ە چۆنە و لە چی دەچێ کە هیچ قسەیێك ناکا. هەروەها دەستەبەرکردنی ناسنامەی کەسێتی و بیروباوەڕ و خووڕەوشتی لە ڕێی تێبینی کردنی ئەوەی قسەکەر دەیڵێ یان ئەنجامی دەدا)) (Addyb: 37) لە زۆر شیعردا کە بە تەکنیکی مۆنۆلۆگی درامی هۆنراوەتەوە، شاعیر لە ڕێی ئەو گلەییانەی لە کەسی بەرانبەری دەکا، کۆمەڵێك زانیاریی وردمان لەبارەی (قسە بۆکراو)ەوە پێ دەدا

هەروەها لە هەر مۆنۆلۆگێکی کاریگەردا ((قسەکەر لەسەر ئەجندایەك دەڕوا بۆ وەدەستهێنانی ئامانجێك و ئەوەی دەشیڵێ مەبەستێکی لە پشتەوەیە.

قسەکردنەکە هەر بۆ ئەوە نییە لە چوارچێوەی چیرۆکێکدا بەسەرهاتەکان بگێڕدرێنەوە، بەڵکو بۆ نمایشکردن یان قەناعەتپێکردنە تا ئامانجەکەی قسەکەر لەدەست نەچێ یان لێڵی تێ نەکەوێ)) (Billy Marshal: www.ask.com). ئەگەر بە شێوەیێکی دیکە بیڵێین قسەکەر بۆیە قسە دەکات، تا ئەو بارودۆخەمان بۆ بگوازێتەوە کە خۆی بە دەستییەوە دەناڵێنێ و دەیگوزەرێنێ بە ئومێدی ئەوەی پشتگیرییەکان تۆماربکرێن و گلەیییەکان قەناعەت پێکەر بن. هەروەها دڵ یان بیروڕای ئەو کەسە بگۆڕێ کە ئەو قسەی بۆ دەکا.

لەم بۆچوونە لەبارەی مۆنۆلۆگی درامییەوە ئەوە هەڵدەهێنجین کە شاعیر هەوڵدەدات زمانێکی رێك و رەوان بەکاربێنێت و وەك چۆن رووداوەکانی ناو شیعرەکە یەك بەدوای یەك ریز دەکا، ئاواش زمانە روونەکە دەکاتە پێناوێك بۆئەوەی پەیامی خۆی بەتەواوی بگەیێنێتە خوێنەر. دیارە روونی مانای ئەوە نییە کە هیچ رەمزێك لە مۆنۆلۆگی درامیدا بەکارنایێت، بەکاردێت، بەلآم زۆرینەی رەمزەکان لە شێوەی توانج و پلاردان بۆ (قسە بۆکراو).

### ١-٤ تایبەتمەندییەکانی مۆنۆلۆگی درامی:

(ئەبرامس) لە فەرهەنگە زاراوەییە بەناوبانگەکەیدا ( A Glossary of Literary Terms) لەسەر ئەو باوەڕەیە کە هەر دەقێك کە لەسەر شێوەی مۆنۆلۆگی درامیدا نووسرابێ، پێویستە ئەم تایبەتمەندییانەی هەبێ:

١- ((کەسێك، بە روونی دیارنییە شاعیرەکەیە یان کەسێکی دیکە، ئەو ئەو قسانە دەکا کە تەواوی شیعرەکە لەخۆ دەگرێ لە حاڵەتێکی دیاریکراو و لە ساتێکی گلەیی ئامێزدا.

٢- ئەو کەسە قسە لەگەڵ کەسێکی دیکە یان زیاتر لە کەسێك دەکات، ئێمە لەڕێی قسەکردنەکەوە دەزانین کە چەند کەسن و چییان گوتووە و چییان کردووە، تەنیا لەڕێی فیکرەکانی کەسەکەوە هەموو ئەمانە دەزانین.

٣- ئەو بنەما سەرەکییەی کە بژاردەکانی شاعیر کۆنترۆڵدەکات و دایدەڕێژێ لەبارەی ئەوەی قسەکەرەکە دەیڵێ ئەوەیە کە بەو شێوەیە بابەتەکە بخەیەڕوو کە چێژ و میزاج و کەسێتییەکەی باشتر بکا)). (M.H. Abrams:85)

لێرەدا تەنیا ئاماژە بە هەبوونی (کەس) کراوە لەکاتی قسەکردن لەسەر تایبەتمەندی مۆنۆلۆگی درامی، بەڵام هیچ ئاماژەیێك بۆ شتی دیکە لەئارادا نییە. ئەمەش کەموکورییە لە دیاریکردندا، چونکە (ڕۆبەرت براون) کە یەکێکە لە داهێنەرانی ئەم شێوازەی شیعر شیعرێکی هەیە بەناوی (The Portrait of a Lady) و لەویێ قسە لەگەڵ تابلۆییێك دەکا و هەموو ڕەخنەگرانیش کۆکن لەسەر ئەوەی ئەمە شیعرێکە بە شێوازی مۆنۆلۆگی درامی نووسراوە.

دەکرێ سەرەڕای ئەم سێ تایبەتمەندییەی سەرەوە، چەند تایبەتمەندیێکی دیکەی ئەم تەکنیك و جۆرەی شیعر بخەینەڕوو کە بریتین لە:

١- گوێگر بەجۆرێك لە جۆرەکان ئامادەیە، بەڵام یان هیچ قسەیێك ناکات، یان توانای قسەکردنی نییە.

٢- لە مۆنۆلۆگی درامیدا شاعیر هیوا و ئومێد و مەبەستێکی هەیە و دەیەوێ بە (قسە بۆکراو) ی بڵێ و لەڕێی ئەویشەوە بە گوێگرانی بگەیێنێ.

٣- هەموو شیعرێك کە بە تەکنیکی مۆنۆلۆگی درامی دەنووسرێ، دەبێ ساتێکی درامی و گلەیی ئامێزی تێدابێ و شاعیر یان قسەکەر سکاڵای لە شتێك هەبێ.

٤- لەماوەی گێڕانەوەی چیرۆکی ناو شیعرەکە، شاعیر یان قسەکەر زانیاریی وردمان لەبارەی (قسە بۆکراو) پێ دەدا.

دەتوانین بڵێین بەشێوەیێکی گشتی مۆنۆلۆگی درامی ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی هەیە:

١- هەبوونی گفتوگۆ.

٢- راناوی (تۆ) زۆر بەکاردێ.

٣- دەروونی شاعیر و نەستی ئەو دەخاتە روو.

٤- شاعیر یان لە یار دوورە، یان لەگەڵ شتێکی بەرجەستە دەدوێ وەك تابلۆ، مۆم، خاك...هتد

٥- شیعرەکە تەواوی تایبەتمەندییەکانی شیعری لیریکی تێدایە لە ڕەوانبێژی و وشە ئارایی و... هتد

٦- قسەکردنەکە هی کاتی ئێستایە.

٧- هەبوونی هیوا و نیەت.

٨- مەبەستێکی هەیە و دەیەوێ بیگەیێنێ.

٩- ساتی گلەیی ئامێزە و سکاڵای لە شتێك هەیە.

١٠- ناسنامە و کەسێتی قسەکەر و قسەبۆکراومان بۆ روون دەکاتەوە.

١١- زمانێکی روون بەکاردێنێ.

١٢- هەبوونی بەشێك لە رۆمانتیکییەت.

١٣- هەست بەتەواوی بەسەر عەقڵدا زاڵە.

١٤- سەرەتا، خاڵی وەرچەرخان، کۆتایی هەیە.

### ١-٥ بنیاتی مۆنۆلۆگی درامی:

مۆنۆلۆگ دەتوانرێ وەك چیرۆکێك پیشانبدرێ. سەرەڕای ئەوەی مۆنۆلۆگی درامی گرنگترین داهێنانی شیعری سەردەمی ڤیکتۆرییە کە تا ئەمڕۆشی لەگەڵدابێ بەکاردێ. تا ئێستاش ئەکادیمییەکان بە روونی سنوور و خەسڵەتە تایبەتییەکانیان دیارنەکردووە و هەتا دەرکەوتنیشی لەسەر رووی لاپەڕەکان دەستنیشان نەکراوە. لە راستیدا زۆرینەی ئەو قسانەی لەبارەی بنیاتی مۆنۆلۆگی درامی کراون شتێك دەخەنە سەر تێکەڵاوی و ئاڵۆزی ئەو پێناسە و بۆچوونانەی لەبارەی بنیاتەکەیەوە دەربڕاون بەوەی (مۆنۆلۆگی درامی) کە فۆڕمێکە ناکرێ وەکو تاکە بوون یان دیاردەیێك لێی بڕواندرێ ((مۆنۆلۆگی درامی یەکێکە لەو فۆڕمانەی شیعر کە بە ئاڵۆزترین شێوە داڕێژراوە، بەڵام لە هەمان کاتدا نوێنەرایەتی ئەو دەربڕینە دەکات کە (وۆردس وۆرس) لەو بارەیەوە هەیەتی و دەڵێ: پیاوێك یان ژنێك قسە لەگەڵ پیاو یان ژنێکی دیکە دەکا))( John Morton:14)

هەموومان لەسەر ئەوە کۆکین کە شیعرێك ئەوکاتە دەبێتە شیعرێکی مۆنۆلۆگی درامی کە تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە شیعرەی تێدا بەرجەستە بن. ئەم جۆرە شیعرەش پێویستە لە دوو شت بێ بەش نەبێ، ئەوانیش: قسەکەرێك و گوێگرێکی ئاماژە بۆ کراو کە درك بەو مەودایەی کە لەنێوان ئەوەی کە قسەکەرەکە دەیڵێ و ئەوەی کە بەڕاستی ئاشکرابووە، دەکا.

لە روانینێکی نوێ و جیاوازی دیکە لە هەموو ئەو تێڕوانینانەی پێشتر خستماننە روو (رۆبەرت لۆنگ بوم) مۆنۆلۆگی درامی بە تەواوکەری جۆرێك لە شیعری رۆمانتیکی دادەنێ کە پێی دەگوترا (شیعری ئەزموون — Poetry of Experience) کە تێیدا ((خوێنەر ئەزموونی ئەو دڵەڕاوکێیە دەکا کە لە نێوان تەعاتوف و بڕیارداندا هەیە)) (Geaorge P. Landow:7). ئەوە راستە کە شیعری رۆمانتیکی باسی گەلێك لەو بابەتانە دەکا کە ئەزموون کراون ئێستا شاعیر وێهەڵدەچێتەوە و باسیان دەکا و بە سۆزەوە سەودا لەگەڵ ئەو رۆژانەدا دەکا کە بەسەری بردوون و سەرەنجام بڕیاریشیان لەسەر دەدا، داخۆ ئەوەی لەم سەردەمدا کردوویەتی کارێکی باش و قبوڵکراو بووە، یان سەرەڕۆیی و پشتگوێ خستن.

هەرچی لە مۆنۆلۆگی درامییە هەست و سۆز و عاتیفە بە هەموو هێزییەوە ئامادەیە و لانیرێکی شیعر و گێڕانەوە و بەسەرهاتەکان دەهاژوا، بەلاّم چەمکی دووەم کە بڕیاردانە لەوێ هەستی پێ ناکرێ، چونکە شاعیر لەبری ئەوەی بڕیار بدا دێ یار یان ئەوەی لێ دوورە و لەدەستی چووە دەیلاوێنێتەوە یان سکالاّی لەسەری هەیە و هەنگاو بە هەنگاو رووداوەکان بیر خۆی دەهێنێتەوە.

لە هەموو حاڵەت و بارودۆخێکی درامیدا و لەناویشیاندا لە (مۆنۆلۆگی درامی)دا ئێمە پێویستمان بەمانەی خوارەوە هەیە:

١- سەرەتا. دەستنیشانکردنی ئەوەی کە چۆن و کەی دەست بە مۆنۆلۆگەکە دەکەی ئەوە گرنگە.

٢- خاڵی وەرچەرخان. هەروەکو هەر چیرۆکێکی دیکە کە هەیە دەبێ لووتکەی مۆنۆلۆگەکە مەودا و ئاراستەی چیرۆکەکە بگۆڕێ. هەروەها پێویستە ببێتە ئەو تەوەرەیەی کە پەرەسەندنی کارەکتەرەکەی لەسەر وەستاوە.

٣- کۆتایی. لێمەگەڕێ کارەکتەرەکەت هەر بەردەوام بێ و بەرەوپێشەوە بڕوا. لەوکاتەی کە دەرفەتت بە کارەکتەرەکەت داوە ئەوەی حەز بکا بیڵێ، ئیتر پێویستە مۆنۆلۆگەکەت بەشێوەیێکی سروشتی کۆتایی پێ بێنی و دیمەنە درامییەکە تەواو بکەی)). (Anjeli, et al: 37)

ئەمانـەی لەسـەرەوە بـە خـاڵ خراونەتـە روو، لـە بنیـاتی هـەموو چـیرۆك و رۆمانێکیشدا هەن و بنچینە و دروسـتکەری ئـەو ژانـرە ئەدەبییانەشـن، بـەلاّم وەك پێشـتر گوتمـان ئـەوەی مۆنۆلـۆگی درامـی پێویسـتە بـە شـیعر بێـت و لـە هـەمان کاتیشـدا چـنینەکەی ئەوەنـدەی دەقـە چـیرۆکئامێزەکان ئـاڵۆز نییـە، بـەڵکو زۆر سادەیە و دەسپێکێکمان هەیە کە سەرەتای رووداوەکانی لێ دەستپێدەکا و پاشان وردە وردە لە رێی گێڕانەوەوە ئاشـنای کارەکتـەر (یـان کارەکتـەرەکان) دەبـین و دەزانین بابەت و تەوەری مۆنۆلۆگەکەمان چییە و شاعیر دەیەوێ چی بڵێ و ئینجـا دەبێ وەرچەرخانێك لە رەوتی گێڕانەوەکە رووبدات بۆئەوەی زەمینـە سـازییێك بـۆ کۆتایی بکرێ. لە کۆتاییشدا شاعیر بە سـادەیی پێمـان دەڵـێ کۆتـایی رووداوەکـە چییە و چی لێ دێ و رووەو کوێ دەڕوا.

جگە لەم خاڵانەی سەرەوە ئەم تایبەتمەندییانـەی خـوارەوەش پێویسـتە لـە بنیاتی مۆنۆلۆگی درامیدا هەبن:

١– خوێنەر وەکو گوێگرە بێ دەنگەکەی لێ دێ.

٢– قسـەکەر قسـە لەسـەر کەیسـێك دەکـا کـە شـێوازی جـەدەل و گفتوگـۆی لەخۆگرتووە.

٣– ئێمە دیمەنە درامییەکەمان لـە رێـی وێنـاکردن و وەدەستخسـتنەوە تـەواو دەکەین)) (Landow: 12)

وەك دیارە لـەم سـێ خاڵـەی سـەرەوە دوو بابـەتی گـرنگ ورووژێنـدراون کـە بریتین لە جەدەل و وێناکردن. لە مۆنۆلۆگی درامیدا جەدەل هەیە، بـەلاّم جـەدەل لەگەڵ خود نـەك لەگـەڵ ئـەوانی دیکـە و شـاعیر (یـان قسـەکەر) هـەر خـۆی قسـە دەکـات و زۆرجـاریش هـەر خـۆی وەلاّمدەداتـەوە و جارناجـارێکیش وەك ئـەوەی (قسە بۆکراو) قسەیێکی کردبێ ئەو قسەکانی خۆی دەکات بە پرسیار و وەلاّم.

لـەبارەی وێناکردنیشـەوە دەتـوانین ئـەوە بڵـێین کـە وێنـاکردن یەکێکـە لـە گرنگترین ناسەرەوەکانی مۆنۆلۆگی درامی. بەوپێیەی لە مۆنۆلۆگی درامیدا جۆرێك لە گێڕانەوە هەیـە، بـەلاّم وەك داسـتان یـان چـیرۆك یـان رۆمـان نییـە کـە بـاس و وەسفی هەموو وردەکارییەکانی رووداوێـك بکـا، بۆیـە خوێنـەر ناچـار دەبـێ لـەزۆر حاڵەتدا خۆی وێنای ئەوە بکا کە چی روویداوە یان شاعیر چی بەسەر هاتووە.

### ١-٦ مۆنۆلۆگی درامی و جۆرە ئەدەبییەکانی دیکە:

یەکێك لە گرنگترین ئەو جۆرانەی ئەدەب کە کاریگەریی راستەوخۆی لەسەر مۆنۆلۆگی درامی هەبووە، شیعرە رۆمانتیکییەکانن، چونکە لەزۆر خەسڵەت و تایبەتمەندی یەکدەگرنەوە و بابەتەکانیشیان هەتا رادەیێکی زۆر هەمان بابەتن، بەلاّم ئەوەی جیاوازیان دەکاتەوە جگە لە هەندێك تایبەتمەندی، شێوازی دەربڕینەکەشیانە. هەربۆیەش زۆر شیعر هەن رۆمانتیکین و درێژن، بەلاّم لەبەرئەوەی تایبەتمەندییەکانی مۆنۆلۆگی درامییان تێدا بەدی ناکرێ، ناکەونە چوارچێوەی ئەو شیعرانەی کە بە مۆنۆلۆگی درامی ناسراون.

دراما و رۆمانیش هاوشێوەی شیعری رۆمانسی کاریگەریی خۆیان لەسەر مۆنۆلۆگی درامی جێهێشتووە بە تایبەتی لەوکاتەی قسە لەسەر تایبەتمەندییەکانی مۆنۆلۆگی درامی دەکەین دەبینین زۆرێك لەو تایبەتمەندییانەی لەخۆگرتوون کە لە درامادا هەن ((مۆنۆلۆگی درامی رێگەیێکە بۆ ئەزموونکردنی تێڕوانینی کەسێك و دەروازەیێکی فراوانتر بۆ گوێگر دەکاتەوە تا پتر ئاشنای هەست و سۆزی ئەو کەسە بێ)) (Anjeli, et al: 39) ئەمەش لە هەموو دەقە چیرۆکئامێزەکاندا هەیە.

مۆنۆلۆگی درامی لەگەڵ رۆمانیش تەبایی هەیە و(( دەتوانرێ لە رۆمانیش بەکاربێ بۆ ئەوەی بەهۆیەوە چیرۆکێکمان بۆ بگێڕدرێتەوە)) (Anjeli, et al: 39). رۆمان تەبایی لەگەڵ هەموو ژانرە ئەدەبییەکان هەیە و هۆکاری ئەمەش فرە شێوازی و هەمەجۆری تەکنیك و جۆری رۆمانە، بۆیە دەکرێ لە رۆمانێکدا چەند مۆنۆلۆگێکی درامی کە بە شیعر نووسراون جێگەیان بکرێتەوە.

### ١-٧ سەردەمی ڤیکتۆریا و مۆنۆلۆگی درامی:

کاتێك بڕیاردەدەین قسە لەبارەی مۆنۆلۆگی درامی و مێژووەکەی بکەین، ئەوا دەبێ بە لایەنی کەم شارەزایێکی باش و ئەزموونێکی قووڵمان لەگەڵ ئەو ئەدەبیات و ژینگە و فەزایە هەبێ کە لەسەردەمی ڤیکتۆریدا باو بووە. لەسەرەتادا ((مۆنۆلۆگی درامی بریتی بوو لە پەرەسەندنێکی تاك لایەنەی توخمە ئەدەبییەکان و دواتر ئەمانەی هەمووی بەیەکەوە کۆکرانەوە و بەرهەمێکی نوێیان لێ دەرچوو کە مۆنۆلۆگی درامییە)) ( J.A. Cuddon: 404). پەرەسەندنی تاك لایەنە واتای

ئەوەیە شیعر لەلایێك و دراما لەلایێکی دیکە و مۆنۆلۆگیش هەم لەناو دراما و هەم لەناو ژانرە ئەدەبییەکانی دیکەدا پەرەی دەسەند و لە کۆتاییدا بەکاریگەریی شیعری رۆمانتیکی هەموویان لە دووتوێی جۆرە شیعرێکی نوێوە کۆکرانەوە و مۆنۆلۆگی درامی لێ پێکهات.

تایبەتمەندیی شیعری سەردەمی ئیلیزابێس کە خۆی لە مۆنۆلۆگی درامی دەبینێتەوە بریتی بوو لە (گەرم و گوڕی و لەخۆوەیی و مەتاتی بوون. دەربڕینەکان تەنیا لە حاڵەتی کاردانەوە و رامان کورت نەکرابوونەوە و هەستەکانیش هی مرۆڤەکان بوون و بە ئاسوودەیی خەڵکی دەیانتوانی هەستەکانیان دەربڕن. هەستەکان لەخۆوەبوون و کاریگەرییان هەبوو نووسەر بەردەوام پەنای بۆ دەبردن و هەستەکان پانتاییێکی زۆریان لە دونیای نووسەر و شاعیران هەبوو) (John Morton: 14)

سەردەمی ڤیکتۆریا نوێنەرایەتی ئەوجی مۆنۆلۆگی درامی دەکا لە ئەدەبی ئینگلیزیدا و ئەم شاعیرانەی خوارەوە سەرئامەدی شاعیرانن لە نووسینی شیعر بە شێوازی (مۆنۆلۆگی درامی) (

١- (یۆلیسیس)ی (ئەلفرێد لۆرد تینسۆن). لە ١٨٤٢ بلاۆکراوەتەوە. پێی دەگوترا راستەقینەترین بەرهەمی مۆنۆلۆگی درامی. دوای (یۆلیسیس) کاریگەرترین بەرهەمی (تینسۆن) لەو بارەیەوە بریتی بوو لە (تیسۆنیوس)، (لۆتۆ- خۆرەکان) و (سیمۆنە خواناسەکە) هەموویان بەشێکن لە شیعرەکانی کە لەساڵی ١٨٤٢ بلاۆیکردنەوە.

٢- (کەناری دۆڤەر)ی (ماتیۆ ئارنۆڵد) و (ستانزاکان)ی لە (گراند چارتریۆز) کە بەناوبانگ بوون و وەکو مۆنۆلۆگی سەرگوزشتەی کەسی وابوون. ئەمانە لەچوارچێوەی ئەو دیوانەدان کە لە ١٨٦٧ دا بلاۆکرایەوە.

٣- (رۆبەرت براون) ئەو کەسەیە کە ئەم فۆرمەی نووسینی شیعری گەیاندە لووتکە و بەناوبانگترین بەرهەمی خۆی کە (مای لاست دەچزە بلاۆکردەوە My – Last Duchess) هەروەها بەرهەمی دیکەشی هەبوون لەو بوارە (Fra Lippo Lippi) و (Caliban upon Setebos) .. هتد و چەندین بەرهەمی دیکەی رۆبەرت براونگ). (Langboum: 34)

### ١-٨ مۆنۆلۆگی درامی و رەخنەی نوێی ئەدەبی :

وەك ئەوەی خوێنەران مۆنۆلۆگی درامی هەستی پێ دەکەن مۆنۆلۆگی درامی شێوازێکی بەهێز و پتەوی نێو دونیای شیعرە بە شیمانەی ئەوەی بتوانرێ قەناعەت بە خوێنەر بکرێ. ئەم شێوازەی شیعر رێ بە شاعیر دەدا تا ئەوەی لە ناخیدایە دەریببڕێ. ((تێکەڵبوونی توخمە درامییەکان و ئەنجامە دەروونییەکان فۆرمێکی سیحر ئامێز دروست دەکا)) (Langbaum:35). لە شیعری نوێدا، سەرەڕای رۆڵی قسەکەر و گوێگری کڕوکپ، شاعیر خۆشی بەشێوەیێکی بەرفراوان فۆرمی مۆنۆلۆگی درامی تاقیکردۆتەوە. (رۆبەرت لانگبۆمی)ی رەخنەگر وای دەبینێ کە مۆنۆلۆگی درامی بریتییە لە ((کۆبوونەوەی شیعری لیریکی و توخمەکانی دراما بەیەکەوە)) (Langbaum: 34) ئەمەش نوێنەرایەتی ئەفراندنەکانی شاعیر دەکا کە گەلێك جار راستەوخۆ ئامادەیی لەناو شیعرەکە هەیە و ئەمە ئەوە کە هەموو حاڵەتە درامییەکانی بەسەردا هاتوون و ئەزموونی کردوون و پاشان کاریگەریشی لەسەر شاعیرانی دوای خۆی دەبێ.

ئەوە راستە کە مۆنۆلۆگی درامی لەژێر کاریگەریی شیعری رۆمانتیکی بووە، بەڵام دەکرێ لەهەمان کاتدا ئەوەش بە راست بزانین کە مۆنۆلۆگی درامی کاریگەریی تەواوی خۆی لەسەر شیعری نوێ بەجێهێشتووە.

### ١-٩ وێکچوون و جیاوازیی نێوان مۆنۆلۆگی درامی و خۆدواندن (موناجات):

فۆرمێکی دیکە کە لە دراما و تەواوی دەقە چیرۆکئامێزەکان بەکارهاتووە و لە مۆنۆلۆگی درامی زۆر نزیکە بریتییە لە (خۆدواندن٫Soliloquy). لە هەردووکیاندا تەنیا یەك قسەکەر هەیە. قسەکەر لە مۆنۆلۆگی درامیدا بیردەکاتەوە و ئەوەی بیریشی لێ دەکاتەوە بە دەنگێکی بەرز دەری دەبڕێ. دەربڕینی بیرکەرەوە بە شێوەیێکی ئازاد و نا هاوسەنگ بەردەوام دەبێ و پەیوەندی بە خودی خۆیەوە هەیە وەکو تاك. بە پێچەوانەی ئەمە مۆنۆلۆگی درامی پتر لەژێر کاریگەری کەسێتیی گوێگردایە. کەواتە ئەوەی خۆدواندن و مۆنۆلۆگی درامی لەیەك جودا دەکاتەوە بریتییە لەوەی لە مۆنۆلۆگی درامیدا گوێگر هەیە و ئاماژەشی پێ

دەکرێ، بەڵام قسە ناکا. هەرچی لە خۆدواندنە نە گوێگر هەیە و نە ئاماژەشی پێ دەکرێ.

(خۆدواندن) بریتییە لە ((قسەکردن لەبەرخۆ جا چ بە دەنگی بەرز بێ، یان بەدەنگی نزم)) (M.H. Abrams: 335) و ناشبێ هیچ گوێگرێکی راستەوخۆ هەبێ. مەبەستمە بڵێم خوێنەر و بینەرانی دراما گوێگرن، بەڵام راستەوخۆ نین، چونکە قسەکان راستەوخۆ ئاڕاستەی ئەوان ناکرێ.

خۆدواندن بریتییە لە ((گوتارێك کە کەمێك درێژە و تاکە کارەکتەرێك لەسەر تەختی شانۆ و بەتەنیا لەبەرخۆی قسە دەکا)) (Cuddon: 343). لە خۆدواندا قسەکەر تەنیا هەست و سۆز و بیر و باوەڕ و تێڕوانینەکانی خۆی دەخاتە روو و بێ لایەنە لەوەی بڕیار بدا کێ راستە و کێ هەڵە، کێ پێویستە داوای لێبووردن لە کێ بکا، کێ مایەی خەمەکانە و کێش تەنیا خەم دەخوا؟ هەرچی مۆنۆلۆگی درامییە، ئەوا قسەکەر – هەندێك جار شاعیر– بێ لایەن نییە و هەمیشە هەست دەکا ئەو غەدر لێکراوە و کەسێك یان کەسانێکیش هەن غەدریان لێی کردووە.

### ١-١٠ توخمەکانی مۆنۆلۆگی درامی:

مۆنۆلۆگی درامی بەشێوەیێکی رێژەیی هەموو یان هەندێك لەم توخمانەی تێدایە، ئەوانیش: گوێگر و قسەکەرێکی خەیاڵی، شوێنکاتێکی سیمبولئامێز، پاڵپشتی سیحری، موبادەرەی درامی، تیشك خستنەسەر لایەنە خودییەکانی قسەکەر و هەروەها هەبوونی زەحمەتی لە تێگەیشتنی ئایرۆنی و ئەوەی کە پەیوەندی بە رۆڵی خوێنەر هەیە لە دەقەکەدا. (( Billy Marshall Stoneking: (www.ask.com))

گرنگترین خەسڵەتی مۆنۆلۆگی درامی بریتییە لەو هەڵوێستەی کە مێشکی قسەکەر دەینوێنێ. ئەو تەنیا بیروباوەڕەکانی خۆی ناخاتە روو، بەڵکو رەنگڕێژی دەکا بەو بیرکردنەوە و روانینانەی گوێگر هەیەتی. (ئەو پەیوەندییەی کە قسەکەر لە مۆنۆلۆگی درامییەوە بە گوێگر هەیەتی وا لە قسەکەر دەکات بەشێوەیێك کە مەبەستیشی نەبێ هاوسەنگییێك لەنێوان خۆی و گوێگرەکەی رابگرێت و هەموو ئەوەی کە باسی دەکا تێڕوانینی خۆی نەبێ، بەڵکو لەجیاتی ئەو جار نا جارێك بۆچوونی ئەویشمان بۆ دەخاتە روو) (George P. Landow: 4)

## تەوەری دووەم: مۆنۆلۆگی درامی لە قەسیدەی (هەولێر لە یەکی شوباتا):

قەسیدەی (هەولێر لە یەکی شوباتا) بەشێکی زۆری ئەو تایبەتمەندی و خەسڵەتانەی تێدایە کە لە هەر قەسیدەیێکی دیکەدا هەن لەسەر ئەو شێوازە نووسرابن. (پەشێو) ئەو تەکنیك و شێوازەی قۆستۆتەوە و دروست بەکاریهێناوە و کردوویەتییە کالاّ و بە بالاّی ئەو بابەتەوە بڕیویەتی کە خۆی ویستوویەتی بیگەیێنێتە خوێنەرانی.

### ٢-١ بەکارهێنانی جێناوی (قسەکەر: من، م):

یەکێك لە خەسڵەتە دیارەکانی مۆنۆلۆگی درامی ئەوەیە کە جێناوەکانی کەسی یەکەمی تاکی بە شێوەیێکی زۆر بەرچاو تێدا بەکاردەهێنرێ. قەسیدەی (هەولێر لەیەکی شوباتدا)ی عەبدوڵڵا پەشێویش بەدەر نییە لەم تایبەتمەندییە و قەسیدەکە پڕیەتی لەم جێناوانە:

**ئەوەندەی من**
**بە منارەی مێژووی تۆدا هەڵدەڕوانم،**
**ئەوەندەی من**
کتێبی زەرد و پەڕپووتی حوجرەکانت
**دەخوێنمەوە ل٣٧٤**

(پەشێو) درێژە بە شیعرە درامییەکەی دەدات و لەگەڵیشیدا درێژە بە بەکارهێنانی جێناوەکانی (من، م) دەدات. ئەمەش چ ئەو و چ هەر شاعیرێکی دیکە کە مۆنۆلۆگی درامی دەنووسێ، بۆ ئەوە ئەم کارە دەکات تا خوێنەر بەتەواوی هەست بە ئامادەیی شاعیر یان قسەکەر بکات، چونکە وەك پێشتر روونمان کردەوە لەپاڵ ئەو بابەتەی دەگێڕدرێتەوە شاعیر (قسەکەر) گرنگترین توخمە چونکە بێ ئەو دەقە درامییەکە نایێتە ئارا:

**بە پەساپۆرتە**
**سێکندهاندە شەرمنۆکە قەڵپەکانم**
**گەر ویستبم بۆ پەنایەك سەرهەڵگرم**
**گەر ویستبم**
**بۆ هەر سووچ و کەنارێکی دنیا بفڕم**
**قەت لەیادم نەکردووە ل٣٩٠**

لێرەدا شاعیر لەگەڵ شارەکەی (هەولێر) دەدوێت و دەردە دڵی خۆی بۆ باس دەکات و پێی دەڵێ کە چ پەیوەندییێك لە نێوان ئەو و (خەم)دا هەیە. وەك دەبینین لە شەش لەتە دێڕی کورتدا شەش جار جێناوی لکاو بۆ کەسی یەکەمی تاك بەکارهاتووە و چەندین جاری دیکەش بەهەردوو شێوەکەی جێناوی کەسی یەکەم ئەم کارە دووبارە کراوەتەوە.

٢-٢ هەبوونی گفتوگۆ:

گفتوگۆ یان دایەلۆگ توخمێکی سەرەکی هەر کارێکی درامییە بەشێوەیێکی گشتی. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەگەر تێکستێك نووسرابێتەوە و نووسەرەکەی ویستبێتی دواتر بە دەقێکی درامی ئامێز هەژمار بکرێ، بێگومان دەبێ حیسابی ئەوەی کردبێ کە دایەلۆگ لە دەقەکەیدا بەکاربێنێ:

**لەو پیاسە دوو قۆڵیانەدا،**
**کە من و تۆ بە ئاقاری رۆژگاراندا کردوومانن،**
**کوا چی ماوە بۆم باس نەکەی؟**
**نازانم لەبیرتە یا نا؟**
**ئێوارەیەك، لای گردەکەی قالیچاغا،**
**راتگرتم و دەستت لەسەر شانم دانا...**
**بە زمانێك**
**پڕ لە بۆنی هەزار ڕەنگی**
**تووتنی ناو قەلنەکەی مەم**
**باسی جەنگی دەستەوخەیەی**
**ئیسکەندەر و دارات بۆم کرد ل٣٧١**

ئەمەی سەرەوە کۆپلەیێکی درامی ناو قەسیدەکەی (پەشێو) ە کە بیری (هەولێر) ی دەخاتەوە کە پێشتر چۆن ئەو هەموو شتێکی بۆ شاعیر باسکردووە و چۆن لە هەموو بەسەرهات و وردەکارییەکان ئاگاداری کردۆتەوە. شاعیر لەم قەسیدەیەدا زۆر لێهاتووانە و شارەزایانە هاتووە ئەو زانیارییە وردانەی لەسەر کۆنە شارەکەی هەیەتی بۆ خوێنەرانی دەگوازێتەوە و خوێنەرانی لێ ئاگادار دەکاتەوە.

هەروەها لە چەندین شوێنی قەسیدەکەدا بەشێوەی پرسیار کە بناغەی گفتوگۆیە پرسیار لە شارەکەی دەکات و گەلێك جارانیش شارە پایتەختەکەی رووگیردەکا، بەتایبەتی کە دەڵێ:

**ئەرێ بەڕاست جگەرگۆشەم، تۆ پایتەختی؟**

**چما پایتەختی بێ تەخت و**

**شانشینی بێ تاج هەیە؟ ل ٣٧٩**

(پەشێو) کە تەمەنێکی کردووە و پایتەختی گەلێك لە وڵاتان گەڕاوە، نەیدیوە سەرۆك و پادشاکان دوور لە پایتەخت بڕیار بۆ پایتەخت دەربکەن، بۆیە (هەولێر)ەکەی رووگیرکردووە کە پرسیاری ئەم جۆرە پرسیارانەی لێدەکا.

**٢-٣ راناوی (تۆ) زۆر بەکاردێ:**

لە مۆنۆلۆگی درامیدا هەر تەنیا ئەوە (من/م)ی جێناوی لکاو نییە کە زۆر بەکاردێ، بەڵکو لەپاڵ ئەم دوو جێناوەدا هەردوو جێناوی (تۆ/ت) بەکاردێن. ئەمەش بۆئەوەیە شاعیر بیسەلمێنێ کە قسەکان بۆخۆی ناکات و کەسێك یان بوونێك هەیە گوێی لێ دەگرێ، ئەو لەگەڵ (هەولێر) دەدوێت و پێی دەڵێ:

**دەبینم تۆ، لەوەتەی هەی، یەك خوات هەبووە. ل٣٧٤**

یان پێی دەڵێ:

**لەبەرچاومە و دەزانم**

**بە چ دەردەسەرییەك تۆ تەعجیلت فرچك دا ل٣٦٩**

لەم کۆپلەیەی خوارەوەشدا هەر بەوە دڵی ئۆقرە ناگرێ بە شارەکەی بڵێ جگەرگۆشە، بەڵکو لە چەند شوێنێکیش هەردوو جێناوی (تۆ/ت) بەکاردێنێ و هەموو ئەم دووبارەکردنەوە و جەختکردنەوەیەش بۆ قەناعەتکردنە بە خوێنەر کە گوێگرێك هەیە:

**دەبا هەر پێت بڵێن پایتەخت!**

**تۆ بۆ من جگەرگۆشەیت و**

**هەر بەو ناوەش بانگت دەکەم ل٣٧٩**

بۆ هەر دایەلۆگێك ئێمە پێویستمان بە دووکەس هەیە کە دەبێ بەیەکەوە بدوێن. لەبەرئەوەی لە (مۆنۆلۆگی درامی)دا ئەو دایەلۆگەی کە دەکرێ

راستەوخۆیە و کاتەکەشی کاتی ئێستایە، بۆیە ئامادەیی هەردوو جێناوی (من/تـۆ) کارێکی حەتمییە.

**٢-٤ شاعیر یان لە یار دوورە، یان لەگەڵ شتێکی بەرجەستە دەدوێ وەك تابلۆ، مۆم، خاك...هتد:**

ئـــەوەی (پەشـــێو) لـــەم مۆنۆلۆگـــە درامییـــەدا لەگـــەڵی دەدوێ، ئەگـــەر خۆشەویستترین شتی نەبێ لەم گەردوونـەدا، ئـەوا گومـانی تێـدا نییـە یەکێکـە لـە خۆشەویستترین شتەکانی. (هەولێر) لای (پەشـێو) نـەك کـۆنترین شـاری دونیایـە، بگرە (هـەولێر) وایکـردووە هـەزاران شـاری دیکـە دروسـتبن و هـەر خۆشـی فێـری گاگۆڵکێی کردوون:

**خۆ دەزانم کە هەزاران شاری دنیا**
**بە ڕەوڕەوەی قەڵاکەی تۆ پێڕەوکە بوون**
**ئەدی ناڵێم گەردنبەرزیت هی سەفینە و**
**بەخشندەییشت هی قەراج؟!**
**ئەدی ناڵێم، وەتی تۆ هەی**
**هەر تاجبەخشی و**
**بۆ جارێکیش خۆت نەبوویتە خاوەنی تاج؟! ل٣٦٨**

**٢-٥ هەبوونی تەواوی تایبەتمەندییەکانی شیعری لیریکی لە شیعرەکەدا**

ئـــەو شـــاعیرەی هونـــەری (مۆنۆلـــۆگی درامـــی) بـــۆ هۆنینـــەوەی شـــیعرێك بەکاردێنێ، بێگومان بۆیە پەنا بۆ ئەم هونەرە دەهێنێت تـا شـیعرەکەی جـوانتر و رەوانتر بکات. بۆ ئەم کارەش نەك دەستبەرداری هونەرە جوانکارییـەکانی دیکـەی شیعر نابێ، بگرە وەك هەر شیعرێکی دیکە کەڵکیان لێ وەردەگرێ:

**هەرکە پەی بە هەڵکشانی بیابان و**
**داکشانی زۆزان دەبرد، لە هەژمەتان**
**هەندێ جاران جەزبەی دەبرد،**
**هەندێ جاریش،**

**کڕ و بێ دەنگ، سەری لەبن باڵی دەنا و**
**عەیامێك خەڵوەتی دەکێشا ل٣٧٦**

یەکێك لە جوانترین و هونەریترین وێنە و ڕەمزە شیعرییەکان لە دووتوێی ئەم کۆپلە شیعرەدا خراوەتە ڕوو. (هەڵکشانی بیابان) و (داکشانی زۆزان) دوو ڕەمزی زۆر جوانن کە یەکەمیان هێمایە بۆ داگیرکاری بەعسی و تەعریبکردن و دووەمینیشیان بۆ کەمبوونەوە و لەکورتیدانی خاکی کوردستان بەهۆی داگیرکاری و تەعریبەوە. هەروەها لەم کۆپلەیەی خوارەوەشدا دەڵێ:

**کچی خۆم، چما نازانیت،**
**تا هەنووکەش من هەر بەوێ**
**بێدەنگیم لێوڕێژی دەنگە و**
**بۆشاییم مووی پێوە ناچێ و**
**دیوەخانی گۆشەگیریم هەر جمەی دێ؟! ل٣٨٩**

خەمی دووره ولاتی، تاراوگە، تەنیایی و گۆشەگیری هەر هەموویان لەم کۆپلە شیعرەدا باسکراون و هەر هەمووشیان لەلایەن شاعیرەوە بەستراونەتەوە بە ولاتەوە. پەشێو لەم کۆپلەیەدا بەشێوەیێکی هونەری جوان چەند دژێکی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە لەوانە: (دەنگ × بێ دەنگی) و (گۆشەگیری × جمە هاتن).

ئەگەر تەواوی قەسیدەکەی تەی بکەین، ئەوا لەپاڵ بەکارهێنانی هونەری مۆنۆلۆگی درامی، شاعیر دەستبەرداری هیچ یەك لە هونەرەکانی هۆنینەوەی شیعر نەبووە و بەشێوەیێکی زۆر هونەرییانە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون.

**٢-٦ قسەکردنەکە هی کاتی ئێستایە:**

بەو پێیەی شاعیر لە زەینی خۆی ئێستا لەگەڵ (قسە بۆکراو) دەدوێ، بۆیە ئەو کاتەی بۆ گێڕانەوە یان داڕشتنی شیعرەکەی بەکاریدێنێ کاتی ئێستایە:

**دەبا هەر پێت بڵێن پایتەخت!**
**تۆ بۆ من جگەرگۆشەیت و**
**هەر بەو ناوەش بانگت دەکەم.**
**ئەرێ بەڕاست تۆ پایتەختی؟ ل٣٧٩**

ئەو قسە لەگەڵ هەولێرەکەی دەکات و داوای لێ دەکات چی بۆ بکات تا لەو نەهامەتییەی تێی کەوتووە رزگاری بکات، چاوەڕوانیش دەکات دەمودەست وەڵامەکە وەربگرێتەوە:

**چیت بۆ بکەم**

**تا نەهێڵم**

**نابیناکان تاریکاییت بخوێننەوە؟**

**تێرنەخۆرە پارووی دەمت کۆنتڕۆڵ بکەن،**

**مێردەزمە**

**خەونەکانت داگیرسێنن و بکوژێننەوە؟ ل٣٨٢**

بەکارهێنانی دەمکاتی ئێستا بۆ قسەکردن و چاوەڕوانی وەڵامدانەوەی دەمودەست لە (قسە بۆکراو) وا لە شاعیر یان قسەکەر دەکات ئامرازێکی باشی لەبەر دەست بێ تا قەناعەت بە خوێنەر بکات ئەوەی ئەو دەیڵێت راستە و بەسەرهاتێکی راستەقینەیە.

## ٢-٧ هەبوونی مەبەست و گەیاندنی:

ئەگەر جۆرەکانی دیکەی شیعر بواری ئەوەیان تێدا بێ کە بڵێین دەکرێ هەندێکیان پەیام و مەبەستێکیان هەبێت و هەندێکیشیان تەنیا بە مەبەستی جوانی و بزواندنی هەست و سۆز نووسرابن، ئەوا لەو شیعرانەی بە شێوەی (مۆنۆلۆگی درامی) دەنووسرێن هیچ بوارێك نییە کە شاعیر بێ مەبەست شیعرێك بهۆنێتەوە:

**ئەی پایتەختی خەمی دنیا،**

**ئەی بازاڕی**

**نانی لەنگە و ئاوی لەنگە و**

**هەوای لەنگە و شیعری لەنگە و حیزبی**

**لەنگە:**

**من نازانم،**

**چ لەو هەموو مەرەکەب و**

**میکرۆفۆن و شاشە و منارانە بکەم**
**کە بە دۆلار ئاوس بن و دەم واز نەکەن؟**
**چ لە داری سایەداری دارستان و پارکت بکەم،**
**کە دوو دڵدار،**
**دوو کارمامز**
**لە بنیا راز و نیاز نەکەن؟ ل٣٨١**

(هەولێر) کە زێدی شاعیرە و پایتەختی هەرێمەکەیەتی ئێستا بووە بە پایتەختی خەم لەم دونیایە و بەهۆی شەڕ و نەهامەتییەوە چ ناخۆشییەك لەم دونیایە هەیە بەسەر خۆی و دانیشتوانەکەی داهاتوون. جگە لەمەش بە درێژایی مێژووی ئەم شارە (بۆچوونی شاعیر وایە) هیچ پاشا و سەرکردە و کاربەدەستێك نەهاتووە تەخت و تەراجی خۆی لەم شارە دابنێت و هەمیشە دوور بەدووری حوکمڕانی شار و لەڕێی ئەویشەوە حوکمڕانی شارەکانی دیکەی سەر بە پایتەختیان کردووە.

شاعیر خەمەکانی بەوەندە کۆتایی نایێت و باسی گەندەڵی و بێ هەڵوێستی مەلا و قەڵەم بەدەستەکان دەکات کە پارە بووەتە هۆکاری بێ دەنگ بوونیان و دەم لەیەك ناکەنەوە. سەرەڕای هەموو ئەمانەش لەو شارەی کە زێدی شاعیرە بەیەکەوە بوونی کچێك و کوڕێك لە پارکێك یان لە هەر شوێنێکی گشتی بێ کارێکی نەکراوە و زۆر بەخراپی بەسەریاندا دەشکێتەوە و زۆرجاریش کارەساتی گەورەی بەدواداد‌ێت.

### ٢-٨ ساتی گلەیی ئامێزە و سکاڵای لە شتێك هەیە:

لە بنەڕەتدا یەکێك لەو مەبەستانەی کە مۆنۆلۆگی درامییان بۆ دەنووسرێ، بریتییە لە گلەییکردن هەبوونی گازاندە بەرانبەر شتێك یان کەسێك. (پەشێو) گلەیی گەورەی لە شارەکەی هەیە. ئەو پێی وایە لەکاتێکدا کە شارەکەی هەموو دەم چوار خودا دەیپارێزن، چۆن ئەم هەموو برینانە لە جەستەیدا هەن:

**لە بەد گومانیم ببوورە،**
**بەڵام هەرگیز باوەڕناکەم**
**ئەربائیللۆ ناوی تۆ بێ**

**نەخێر نابێ،**
**نەخێر ناشێ**
**تۆ بارەگای نووری عەرشی چوار خودا بیت**
**کەی ئەو هەموو برینانە،**
**جگەر گۆشەی شیرینی من،**
**بۆ بەدەنی شارێك دەشێن**
**کە چوار خودا چاودێری بن؟! ل٣٧٣-٣٧٤**

**٢-٩ بەکارهێنانی زمانی روون:**

ئەو زمانەی کە بۆ هۆنینەوەی مۆنۆلۆگی درامی بەکاردێ، زمانێکی سادەیە، بەلاّم پڕ وردەکارییە:

**دە پێم بڵێ، جگەر گۆشەم،**
**چیت بۆ بکەم،**
**تا نەهێڵم بتکەن بە گەراجی**
**ئوتۆمبێلێکی چەپرەکی دوو سووکانی بێ شفێر؟ ل٣٨٢**

ئەو بە زمانێکی سادە، بەلاّم وەك گوتم پڕ وردەکاری پێمان دەڵێ، ئەو خاوەنی پایتەختێکە دوو حیزب، دوو بنەماڵە، یان دووکەس بەرێیەوە دەبەن و ولاّتیان کاول کردووە و وەکو ئۆتۆمبێلێکی چەپرەکی شڕ و وڕی بێ سەروبەریان لێ کردووە و ئێستاش دەیانەوێ بەهەردووکیان بیهاژۆن.

**٢-١٠ هەبوونی سەرەتا، خاڵی وەرچەرخان، کۆتایی:**

سەرەتا بە گێڕانەوەی مێژوو دەستپێدەکا و ئەوەندەی لەبارەی مێژووی (هەولێر)ەوە دەیزانێ بە شیعر دەیهۆنێتەوە و لەڕێی قسەکردن و وەبیرهێنانەوەی شار ئێمەش لە بەسەرهاتەکان ئاگاداردەکاتەوە:

**لەبەر چاومە و دەزانم**
**چۆن شەوێك، دوای خەوزڕان،**
**شانی منارەی چۆلیت بە ئاستەم ڕاتەکاند و**
**لە شەکرە خەوت هەڵساند ل٣٦٩**

دواتر لەسەر گێڕانەوەی مێژوو بەردەوام دەبێ و ئەوەی خۆی باوەڕی پێی هەیە لەبارەی پاراستنی شار و منارە و لەقلەق و خانەقاکەیەوە بۆمانی دەگێڕێتەوە:

**هەموو ساڵێك،**
**لەگەڵ یەکەم هەورە تریشقەی بەهاریدا،**
**لەپڕ ئاسمان دادەقڵیشا،**
**فریشتەیێك،**
**وەك پارچەیێك نووری پەتی،**
**دادەپەڕییە سەر منارەکەی خانەقا و**
**دنیای هەموو**
**لە گەرمایی و ڕەنگ و سەدا هەڵدەکێشا ل٣٧٥**

خاڵی وەرچەرخانی ئەم دەقە شیعرە لەو کاتەوە روودەدا کە شاعیر لە گێڕانەوەی رووداوە مێژووییەکان و ئەو بەسەرهاتانە دەبێتەوە و دێتەسەر باسی بابەتێك کە ئەو دەم روویداوە ئەویش شەهید بوونی پۆلێك رۆڵەی ئەم خاکەن بە رووداوێکی دڵتەزێن. لە بنەڕەتیشدا وەك لە ناونیشانی شیعرەکە وەدیار دەکەوێ (هەولێر لە یەکی شوباتا)، کرۆکی بابەتی شیعرەکە بریتییە لەم رووداوە کارەساتبارە:

**نازانم بەم بەیانییە،**
**ئەو پۆلە قاز و قورینگە نوورپڕژێنە**
**بۆ کوێ دەچن؟**
**بۆچی گەردن و شاباڵیان هێندە سوورە؟**
**کۆتایی:**
**ئەم خەمە خەمی شاخێکە**
**بەیانییەك،**
**بەیەك چرکە، یەك چرکە و بەس،**

**پۆلێك ئاسكی گوڵبژێری**

**بكەوێتە بن پێی هەرەس.**

**بەیەك چركە یەك چركە و بەس ل٣٩٢**

(پەشێو) كۆتایی ئەم قەسیدەیە بە باسكردنی دوورەوڵاتی و خەمی دووری و خۆشەویستی وڵات دەهێنێت و بەمەش لەدوا دێڕەكانی قەسیدەكەی گومان و خەمەكانی قووڵ دەكاتەوە و ترسێكی زۆر و بەردەوامیشی بۆ خاك و وڵات هەیە:

**ئەم خەمە خەمی شاخێكە،**

**بەیانییەك،**

**بە یەك چركە، یەك چركە و بەس،**

**پۆلێك ئاسكی گوڵبژێری**

**بكەوێتە بن پێی هەرەس.**

**بە یەك چركە، یەك چركە و بەس.**

## ئەنجام

١- مۆنۆلۆگی درامی گفتوگۆیە لە نێوان دوو کەسدا، بەلاَم یەکێکیان هەر قسە دەکا و ئەوەی دیکە بە هیچ شێوەیێك وەلاَم ناداتەوە.

٢- شاعیر کاتێك پەنا دەباتە بەر مۆنۆلۆگی درامی کە لە یارەکەی، شارەکەی یان هەر شتێك کە بەلای ئەوەوە گرنگە دووربێت و نەتوانێت لەگەڵی بدوێ، یان هەر لە بنەڕەتدا توانای وەلاَمدانەوەی نەبێت.

٣- گرنگترین خەسڵەتی مۆنۆلۆگی درامی بریتییە لەو هەڵوێستەی کە مێشکی قسەکەر دەینوێنێ. ئەو تەنیا بیروباوەڕەکانی خۆی ناخاتە روو، بەڵکو رەنگرێژی دەکا بەو بیرکردنەوە و روانینانەی گوێگر هەیەتی.

٤- قسەکەر لەم مۆنۆلۆگە درامییە خودی شاعیرە و قسەبۆکراو یان گوێگر شارەکەیەتی کە (هەولێر) ە.

٥- پەشێو بۆ درێژکردنەوەی قەسیدەکەی و گەیاندنی پەیامی زیاتر ئەم هونەرەی هەڵبژاردووە و لەمەشدا زۆرباش پێکاویەتی.

٦- زمانی شیعرەکە زمانێکی سادە و رەوانە و لەپاڵیشیدا هەموو ئەو هونەرە جوانکاری و رەوانبێژییانەی لە شیعرێکی لیریکی چاوەڕاوان دەکرێ ببینرێن، تێیدا هەن.

## سەرچاوەکان:

- دیوانەکان:

١- عەبدوڵلا پەشێو، هەسپم هەورە و رکێفم چیا (شیعری ١٩٨٠–٢٠٠٥)، چاپی سێیەم، کوردستان، هەولێر–٢٠٠٨.

1. Addyb , Dramatic Monologue: This essay spells out the salient features of the dramatic monologue, with examples. University, Bachelor's, October 2007.
2. -Anjeli, etal, three ways to write dramatic monologue, www.ask.com
3. - Houghton Mifflin Company, Dictionary of the English Language, Fourth Edition copyright ©2000 by -. 2009.
4. Landow, George, Professor of English and Art History.Dramatic Monologue: An Introduction.
5. -Robert Browning and Mick Imlah: Forming and Collecting the Dramatic Monologue John Morton
6. -Random House Kernerman Webster's College Dictionary, © 2010 K Dictionaries Ltd. Copyright 2005, 1997, 1991 by Random House, Inc.
7. 8 -Sally Wehmeier, Oxford Advanced Lerners Dictionary, 7th edition, Oxford University Press.
8. J.A. Caddon, A Dictionary of literary Terms, revised Eddition, UK, 1979.
9. M.H. Abrams, A Glossary of literary Terms,ninth Edition,

**ملخص البحث**

المونولوج الدرامي أحد الموضوعات المهمة التي طالما كان موضع اهتمام النقاد في عالم الأدب، وذلك لجمعه بين نوعين من الأعمال الادبية، و هما: (الدراما و الشعر).

اختار الباحث هذا الموضوع استشعارا بأهميته في حقل الدراسات النقدية، ولما تمعنا في ابعاد الموضوع اخترنا له عنوانا، هو (المونولوج الدرامي في قصيدة هەولێر لە یەکی شوباتدا – أربيل في أوئل شباط). وقمنا بتوزيعه على مقدمة وتمهيد وفصلين.

يتكون الفصل الاول – الذي جاء بعنوان (مميزات المنلوج الدرامي) – من ستة محاور تتناول على نحو عام تعريف المنلوج الدرامي، وأنواعه ومميزاته.

أما الفصل الثاني فقد خصصه الباحث للجانب التطبيقي من البحث.

توج الباحث عمله بخاتمة مخصصة للنتائج التي تمخضت عن مشروع العمل.

## Abstract

Dramatic monologue is a very important and interesting subject because it is combines to different literary types (Drama) and (Poetry).

This research talks about Dramatic Monologue in Abdulla peshews long poem (Hewler le Yekishubat- Erbil in February, 1). Dramatic monologue has a long history in literature, and writing and/or finding such pieces and preparing them for performance can be both instructive and gratifying. Monologues can be a dramatic rendering of published literature. Monologues can also be written and based upon personal experiences or imagined circumstances.

In this research we talk about the elements of (Dramatic Monologue). Also we focused on dramatic monologues characterization. In chapter two we analyzed Erbil in February which is Abdulla Peshewslon poem.

At the end of research we wrote the conclusion of our research and references.

# لێکەوتەی ئاخاوتەیی لە تەنزدا

## (تەنزەکانی د.شێرکۆ عەبدوڵڵا بەنموونە)

**د. نەوزاد ئەنوەر عومەر**

فاکەڵتی پەروەردە - زانکۆی کۆیە

### ١/١- ١) پێشەکی:

ئەرکی ڕۆژنامەگەری لەناو کۆمەڵدا، بریتییە لە دروستکردنی هۆشیاریی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری، هەروەها ڕۆڵی گەورە لە بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی مرۆڤایەتی و نەتەوایەتیدا هەیە. ڕۆژنامەگەری بەشێوەیەکی سەرەکی ئەم ئەرکانەی هەیە، کە بریتین لە:

یەکەم: چاودێریکردنی ژینگەی دەوروبەر لەئەستۆ دەگرێت.

دووەم: کارکردن لەسەر یەکخستنی توانای کۆمەڵگا لە ڕووبەڕووبوونەوەی ژینگە.

سێیەم: گرینگیدان بەگواستنەوەی کەلەپووری ڕۆشنبیری لەڕێگای نەوە یەک لەدوای یەکەکانەوە. (محمود علم الدین٢٠٠٩: ٧٠)

ڕۆژنامەگەری چەند ئەرکێک لەخۆ دەگرێت، کە بریتین لە: ئەرکی ڕاگەیاندن، ئەرکی ڕۆشنبیری، ئەرکی ڕامیاری، ئەرکی ڕای گشتی، ئەرکی ئابووری، ئەرکی کۆمەڵایەتی، ئەرکی ڕاڤەکردن، ئەرکی ڕوونکردنەوە و شیکردنەوە، ئەرکی دیبلۆماسی، ئەرکی بەسەربردن و خۆشی و ڕابواردن.

### ١/١- ٢) چەمک و پێناسەی تەنز :

شێوازی تەنز زیاتر ئەو بابەتانە دەگرێتە خۆی، کە دەسەڵات یان داب و نەریت دەرفەتی دەربڕینی ڕاستەوخۆیان پێنادات، تەنزنووس لەپەردەدا ناڕاستەوخۆ دەیاندرکێنێت و لە تەنگژەدا دەربازبوون بۆخۆی دێڵێتەوە، هەربۆیە ئەو کۆمەڵگایانەی لەبارەی داب و نەریتەوە داخراوترن، بەو مانایەی کە عەیب و عار و ڕووبینی لەواندا پترە، مەیدانی تەنزنووسان ئاواڵاترە، هەروەها لەو وڵاتانەی ئازادیی بیروڕا دەربڕین کەمە، تەنزنووس دەتوانێت بەشێک لەو بابەتانەی سنووری سووریان لەدەور کێشراوە وەک هەوێنی تەنزەکان بەکاریان بهێنێت و لە پەردەدا بیانخاتە بەر ڕەخنە و تەنزی بەتامیان لێ بخولقێنێت. (شاخەوان ٥٩: ٢٠١٤).

تەنز: بەو بەرهەمە ئەدەبییە دەوترێت، کە لەهەڵە و کەموکوڕیی دیاردە گەندەڵ و ناپەسندەکانی کۆمەڵگە لەڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و کەلتووری و ژینگە و بوارە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی پێکەنیناوی باس دەکات. تەنز پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی هەیە و خوێنەر دەهێنێتە پێکەنین، هەروەها ئامانجێکی بەرزتری هەیە و مەبەستی مرۆڤ لەقووڵایی ناتەواوی و گەندەڵی و خراپەکارییەکان ئاگادار بکاتەوە، کەواتە ئەو پێکەنینەی تەنز بەرهەمی دەهێنێت پێکەنینێکی تاڵ و نائاساییە. (شێرکۆ عبدالله ٢٠١٢: ژ٣٠٢ ڕ: رەخنەی چاودێر). تەنز قاقای گریان و زیرەوهۆڕی پێکەنینە، هونەرێکە بەناوی تەوس و توانج و تەشەر لەژێر حوکمە زۆردارەکاندا، بۆ ڕووناککردنەوەی چرای زانست و بەدەستهێنانی ئاوات و هیوای گەلان. تەنز بەیەکێک لە شێوازەکانی دەربڕینی مەبەست دەگوترێت، کە قسەکەر بەزمانێکی شیرین و بزاوی بەمەبەستی چاکسازی دەیدرکێنێت.

### ٣-١/١) خاسیەت و شێوازی تەنز :

((یەکەم/ مانەوەی لای وەرگر: لەبەرئەوەی بە زمانێکی شیرین و پاراو دەنووسرێت، بۆماوەیەکی درێژ لە زەیندا دەمێنێتەوە، شارەزایی لە کەلتوور و فۆلکلۆر و ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵک لە بواری تەنز مەرجی گرینگن بۆ مانەوەی لە زەینی خوێنەردا.

دووەم/ کورتی لە دەربڕیندا: کورتبێژی و بەکارهێنانی زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵک و سادە نووسین.

سێیەم/ ئارام بەخشین: شێوەی تەنز پێکەنینە و، وەک شێوازی ئاسایی وشک نییە، خوێنەر لەخوێندنەوەی ماندوو نابێت، بەڵکو خوێنەر دەحەسێتەوە و هەست بەئارامی دەکات.

چوارەم/ کاریگەری: ڕۆژنامەگەریی تەنز کاریگەریی زۆری لە قۆناغی دیاریکراو بۆ وروژاندن و دروستکردنی ڕای خەڵکی هەیە.

پێنجەم/ دەربڕینی تایبەت: هەندێک بابەتی سیاسی و کلتووری هەن، کە لەدەربڕینی ئاسایی ئەستەمە کاریگەری دروستبکات، بەڵام دەکرێت بەزمانی تەوس و تانە هەمان پەیام وەک ڕەخنە بخرێتە ڕوو)). (شاخەوان ٢٠١٤:٧٩).

### ١/١-٤) ئەدەبی پێکەنین :

بەلای فرۆیدەوە ئەدەبی پێکەنین دوو جۆرە: یەکەمیان پۆزەتیڤە، کە گاڵتە و شۆخی و قسەی خۆش و ئەو جۆرانە لەخۆ دەگرێت، کە تەنیا بۆ مەبەستی پێکەنین بەکاردێن و هیچ مەبەستێکی تری گوماناوی لەپشتەوە نییە. دووەمیان نێگەتیڤە، کە رەخنە و پلار و داشۆرین و سەرزەنشتکردن و ئەم شێوانە تێیدا کۆدەبنەوە، کە تیایاندا پێکەنین ئامرازێکە بۆ گەیشتن بەئامانجێکی تری گوماناوی (جەبار ئەحمەد٤٣:٢٠١٢). جۆرەکانی ئەدەبی پێکەنین زۆرن وەک ((هومۆر، هومۆری سوریالی، دژەهومۆر، ساتیرا، ئایرۆنی، کۆمیدی، ناکۆک، جنێودان...)) بەڵام لەبەرئەوەی بوار نابێت لەم لێکۆڵینەوەیە باسی هەریەکێکیان بکەین، لەبەر درێژبوونەوەی لێکۆڵینەوەکە، تەنها باسێکی کورتی ساتیرا دەکەین، چونکە پەیوەندیی راستەوخۆی بە لێکۆڵینەوەکەمانەوە هەیە.

ساتیرا: زاراوەیەکە بەهەر کارێکی ئەدەبی یان هونەری دەوترێت، کە ئامانجی گاڵتەپێکردن بێت. (یان جاک) دەڵێت: (ساتیرا زادەی غەریزەی گازەندەیە، گازەندەیەک کە بۆ هونەر گۆڕاوە، کەواتە رەخنەگرتن لە کەموکورتییەکانی تایبەت بەمرۆڤ لەپێناوی راستکردنەوەیاندا لە سەرەکیترین ئامانجەکانی ساتیرایە، بەڵام مەرجی سەرەکی ئەم رەخنەگرتنەش ئەوەیە هونەری تێدابێت. لەپاڵ ئەمەشدا وەک هونەرێکی تری پێکەنین، ساتیرا هۆکارێکە بۆ وچاندانی دەروونی، کە پێویستە بۆ بەتوانابوونی مرۆڤ لە بەرهەڵستکردنی کێشە و گرفتەکانی ژیاندا. ( جەبار ئەحمەد ٢٠١٢: ٤٧).

ساتیرا بە باڵی تەوس و لاقرتێ دەفرێت، بێ سڵکردنەوە، راستی دەڵێت، تیرێکە رووی لە سینگی جەلادە و دەستێکە تەوقە لەگەڵ دیکتاتۆردا ناکات. ساتیرخوێن شیرنانە باس لەلایەنە تاڵەکانی ژیان دەکات و گاڵتە ئامێزانە ئاوڕ لە کارەسات دەداتەوە و خوازیارە لێوی خوێنەر بە زەردەخەنەیەکی تەوساوی بگەشێنێتەوە. (حەمە سەعید ٦:٢٠١١).

### ١/ ٢-١) توانستی پراگماتیکی :

رێزمان و واتاسازی بەتەنها یاسا حوکمکەرن و توانستی زمان دیاریدەکەن، بەڵام بەهۆی دەوروبەرەوە توانستی پراگماتیکی لەمێشکدا دەچەسپێت و لەدەق یان کۆدەقی وتاردا تواناکە لە دەستەبەرکردنی مەبەستی پراگماتیکیدا دەردەکەوێت،

بەمەش دەسەڵاتشکانەوە بەسەر بەکارهێنانی زماندا بریتی دەبێت لە (ڕەوانبێژی و میتافۆڕ)، کە لە دەوروبەردا واتاکەی دەناسرێتەوە، پڕاگماتیک بەهۆی توانای مرۆڤەوە لە دەوروبەرێکی دیاریکراودا بە بەرهەمدێت.

دەوروبەر هۆکاری فراوانکردنی توانای دەربڕاوێکە، مەودای دەوروبەر پتر لە ژینگەی کۆمەڵایەتی و فیزیکیدا دەردەکەوێت و بەگشتیش زانیاری دەگرێتەوە، کە هەموو ئەمانە ڕۆڵی سەرەکی لەلێکدانەوەی دەق یان دەربڕاودا دەبینن. دەوروبەر، هەر زانیارییەکی پێشینە کە مەزەندە دەکرێت هاوبەشبێت لەنێوان قسەکەر و گوێگردا کە یارمەتی گوێگر دەدات بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانی قسەکەر لەهەر گوتنێکی دیاریکراودا. (Leech 1983:13).

( (بەلای (زانا بون)ەوە دەوروبەر بریتییە لە:

١-بوونی زانیاری دەربارەی یاساکان و هەڵوێستەکان، ئەو یاسایانەی دەستدەگرن بەسەر قسەکردندا و، ئەو یاسا کۆمەڵایەتییانەش کە لە کۆمەڵگاکەدا هەیە.
٢- زانین دەربارەی ئاستی شێوازبەندی.
٣-بوونی زانیاری دەربارەی ئەو شوێنانەی کاتین و لەپڕدا پەیدادەبن.
٤- ئاگاداربوون لە کاروباری خەڵکی و مامەڵەکانیان.
٥- بەئاگابوون لە ڕاگەیاندن و میدیاکان.
٦- بوونی زانیاری دەربارەی هەرێمەکان ودەوروبەر. )). (ئاڤێستا کمال ٢٠٠٦: ٦).

### ١/٢-٢) لێکەوتەی ئاخاوتەیی و بنەماکانی هاریکاری :

لێکەوتەی ئاخاوتەیی یەکێکە لە بابەتە سەرەکییەکانی پڕاگماتیک ، گرایس و سبربر و ولسن جەخت لەوە دەکەنەوە، ئەگەر زانیارییەک بەلێکەوتەی ئاخاوتەیی داندرا، پێویستە ئەو زانیارییە بەئاشکرایی لە ڕستەدا نەگوترابێت. لێکەوتەی ئاخاوتەیی بریتییە لەو زانیارییانەی ناڕاستەوخۆ لەگوتندا هەڵدەهێنجرێن، ئەمەش بەپشت بەستن بەڕێگای پڕاگماتیک بەدەستدێت، نەوەک بەڕێگای ئەو واتایەی بۆ وشەکان دانراون. (محمد محمد ٢٠٠٤: ٤٨). کە خەسڵەتی کورتبڕی تێدایە، واتە ئەوەی کە وتراوە زۆر کەمترە لەوەی کە مەبەستە، قسەکەر و نووسەر لە ئاخاوتن و نووسینەکانیاندا بۆ گەیاندنی مەبەستەکانیان گرینگییەکی زۆر بەم بابەتەی پراگماتیک دەدەن، گرینگی لێکەوتەی ئاخاوتەیی لەدەربڕینی چۆنیەتی گونجاوی واتا و مەبەستەکاندایە، کە تاچەند گوێگر و خوێنەر پەی بە واتا شاراوەکان دەبەن. (نەوزاد ئەنوەر ٢٠١٤: ٦٢). قسەکەر کاتێک مەبەستێک یان پەیامێکی هەبێت،

لەڕێگەی ئاخاوتنەوە دەیگەیەنێتە گوێگر، بەڵام زۆرجار قسەکەر وتەیەک دەردەبڕێت زۆر زیاتر دەگەیەنێت لەوەی کە دەیڵێت، گوێگریش کە وتەکە دەبیستێت گریمانەی ئەوە دەکات کە قسەکەر هاریکارە و دەیەوێت شتێک بگەیەنێت، ئەو شتەیش دەبێت زیاتربێت لەوەی کە گوتنەکە نیشانی دەدات، ئەو واتا زیادەیە پێی دەگوترێت لێکەوتە. (Yule2011:35). لێکەوتەکان شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئاخاوتنن، بەتایبەتی ئەو زانیارییانەی، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەرنەبڕاون، واتە دەرەنجامی ئەو شیکردنەوە و لێکدانەوانەن، کە گوێگر لە ئاخاوتنەکان بەدەستی دەهێنێت.

بەبۆچوونی گرایس بەکارهێنانی زمان چالاکییەکی هۆشەکییە و ئامانجی هاریکاریکردنە لەنێوان هاوبەشەکانیدا، بۆیە پێویست بوو ئەو بنەما و یاسایانەی کە مێشکی مرۆڤ ئاڕاستەیان دەکات بۆئەوەی ئاخاوتن کاریگەر و سەرکەوتوو بێت دەستنیشان بکرێت. (عومەر مەحمود ٢٠٠٩: ٥)، ئەم بیرۆکەیە لای گرایس شێوەی بنەمایەک وەردەگرێت و ناوی ناوە بنەمای هاریکاری، کە ئەمە دەقەکەیەتی ((با گوتنەکەت هێندە بێت و لەو کات و شوێنەدا بێت و بەو جۆرە بێت کەپێویستی تێگەیشتن دەیەوێت)). گرایس ئەم بنەما گشتییەی هاریکاری لەچەند بنەمای وردتردا Maxim دەبینێتەوە، کە بریتین لە: بنەمای چەندایەتی، بنەمای چۆنیەتی، بنەمای پەیوەندی، بنەمای شێواز. (Grice1975:45).

### ٢/١ -٣) گرینگی لێکەوتەی ئاخاوتەیی :

چەمکی لێکەوتە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە چۆن زمان بەکار دەهێنرێت، بەباوەڕی گرایس زمان چالاکییەکی هۆشەکییە و ئامانجی هاریکاریکردنە لەنێوان هاوبەشەکاندا، هەروەها دەڵێ ئێمە لەئاخاوتندا لەڕێگەی بنەمای هاریکارییەوە بەواتای هاوبەش دەگەین، کە هەموو قسەکەرێک لەهەر کۆمەڵگایەکدا بێت پەیڕەوی دەکات. (محمد معروف ٢٠١٠: ٤٢٤)

گرینگی لێکەوتە لەم خاڵانەدا دەردەکەوێت:

١- گرینگی لێکەوتە لەوەدایە، کە ڕاڤەی توانای قسەکەر دەکات، بەوەی کە ئەو واتا و چەمکەی دەیگەیەنێت زۆر لەوە زیاترە کە دەیڵێت.

٢- دەتوانێت ئاسانکاری لە وەسفی بونیادی واتاییدا بکات.

٣- پشتبەستن بەژمارەیەکی کەم لە بنەما دەتوانێت وتەی زۆر و جۆراوجۆر ڕاڤە بکات. .(عومەر مەحمود ٢٠٠٩: ٤)

**٢/١ -٤) خەسڵەتەکانی لێکەوتەی ئاخاوتەیی:**

١- توانـای پاشـگەزبوونەوە (سـڕینەوە): دەتوانرێـت لـێکەوتەی ئاخـاوتەیی بسڕدرێتەوە و هەڵبوەشێتەوە، ئەمەش بەپێشکەشکردنی زانیاریی زیاتر دەبێت.

٢- توانای جیاکردنەوە: لەبەرئەوەی لێکەوتەی ئاخـاوتەیی پەیوەسـتە بەواتـای گەیەنـراو، نەک بەشـێوەی زمـانی، بـۆیە بەهـیچ شـێوەیەک ناکرێـت لـێکەوتە لە وتە جیـابکرێتەوە، لـێکەوتە لە ڕۆنـانی سـەرەوەی وتەیەک بەدەسـت دێـت، کە ڕوون نەکراوەتەوە و پەیوەندی بەمەرجی ڕاستییەوە نییە.

٣- توانـای ئەژمـارکردن: دەتوانرێـت بەڵـگەیەک یـان بەهـانەیەک بـۆ لـێکەوتە بهێنرێتەوە، ئەمەش بەگواستنەوەی لە واتای ئاسایی وتەکان بـۆ ئەو لـێکەوتەیەی کە مەبەستە.

٤- لـێکەوتەی ئاخـاوتەیی نـانەریتییە: واتە بەشـێک نیـیە لە واتـای نەریتـی وشـەکان و بەگەڕخسـتنی زانیـاری دەربـارەی دەوروبەری گـوتنەکە و بەئاگـابوون لە بنەمای هاریکاری ئینجا بەدەستدێت.

٥- توانـای هەڵواسـین: قسـەکەر دەتوانێـت بە بەکارهێنـانی گوزارشـتی وەک ((بەلانیکەم)) لێکەوتەی ئاخاوتەیی بەهەڵواسراوی بهێڵێتەوە.

٦- بۆ هەڵهێنجانی لـێکەوتەی ئاخـاوتەیی پێویسـتمان بە ڕامـان و بیرکـردنەوە هەیە.

**١/ ٢ - ٥) جۆرەکانی لێکەوتەی ئاخاوتەیی :**

گرایس چەند جۆرێکی لە لێکەوتەی ئاخاوتەیی دیاریکردووە بریتین لە:

١- لـێکەوتەی ئاخـاوتەیی گشـتی: ئەم جـۆرە لـێکەوتەیە پێویسـتی بەهێنـانە ناوەوەی زانیاریی تـایبەت بەدەوروبەری ئاخـاوتنەکەوە نیـیە، ئەم جـۆرەی لـێکەوتەیە پەیوەستە بەو وشە و مۆڕفیمانەی لە ڕستەکەدا بەکار دەهێنـرێن، واتە ئەو کـردەیەی مەبەستی گەیاندنەکە جێبەجێدەکات، لەڕێگای ئەو واتا سنووردارییەوەیە کە مۆڕفیم و فرێزی ناو ڕستەکە لەخۆ دەگرێت.

٢- لـێکەوتەی ئاخـاوتەیی تـایبەتی: ئەم جۆرەیـان پەیوەسـتە بەدەوروبەرێکـی دیاریکراوەوە.

ا- هەمیشە لەناو گوتندا دەبینرێت.

ب- بۆ لێکدانەوەی پێویستمان بەزانیارییەکی زۆری دەوروبەر هەیە.

ت — لە وشەکانەوە زانیاری بەدەست نایەت. (محمد معروف ٢٠١١: ٢١٧).

٣- لێکەوتەی ئاخاوتەیی ستاندار: ئەم جۆرە لێکەوتەیە پەیڕەوی بنەماکانی هاریکاری دەکات و نایانبەزێنێت.

٤- لێکەوتەی ئاخاوتەیی ناستاندەر: ئەم جۆرە لێکەوتەیە پەیڕەوی بنەماکانی هاریکاری ناکات و دەیانبەزێنێت.

**٢/١ -٦) بەزاندن و لادان :**

بەزاندن کاتێک ڕوودەدات کە قسەکەر بەئارەزوو لە بنەما وردەکانی هاریکاری دەردەچێت، بەلادان و بەزاندنی هەریەکێک لە بنەماکانی هاریکاری لێکەوتەی ئاخاوتەیی لێدەکەوێتەوە. بەزاندن بەچەند شێوەیەک ڕوودەدات:

((١- پێکدادانی بنەماکان: ئەم جۆرە بەزاندنە لەئەنجامی پێکدادانی دوو بنەما دێتە کایەوە.

٢- فەرامۆشکردنی بنەماکان: ئەمەش بەچەند ڕێگایەک دروستدەبێت:

ا- بە شکاندنی بنەماکان، ئەمە گوێ نەدانێکی ئاشکرایە بەیەکێک یان زیاتر لە بنەماکان.

ب- بەزاندن بەناچاری، لەم جۆرەدا قسەکەر بنەمایەک دەشکێنێ بێئەوەی مەبەستی بێت، واتە لە ناچاریدا لەبەر نەبوونی توانای زمانیدا یان لەبەر هەڵچوون و نەخۆشی.

ت- بەدەستکێشانەوە لە بنەماکان، ئەمە کاتێک دروست دەبێت، کە قسەکەر بیەوێت هاریکاری نەکات و بنەماکان بەئارەزوو جێبەجێ نەکات.

ث- لەکارخستنی بنەماکان، لە هەندێک باردا بنەماکان لەکار دەکەون واتا قسەکەر بەتەمای ئەوە نییە کە بنەماکان جێبەجێبکات.)). (محمد معروف٢٠١١: ٢١٩).

**بەشی دووەم:**

**١/٢) لێکەوتەی ئاخاوتەیی لەم تەنزانەی خوارەوەدا:**

وشە و ڕستە لە دەوروبەری ئەدەبیدا لێکدانەوەی جیاواز لە واتای سیمانتیکی هەڵدەگرێت، دەوروبەری ئەدەبی ئاماژەدانە بە بەزاندنی بنەماکانی گرایس، نووسەر مەبەستەکانی بەئاشکرا دەرنابڕێت، بەڵکو لەژێر پەردەی کەرەسە زمانییەکانەوە بیری خوێنەر سەرقاڵ دەکات. هەروەها کەسێتی نووسەر لە ڕاڤەکردن و دیاریکردنی مەبەستی دەربڕاو لەدەقدا ڕۆڵی کارا دەبینێت، خوێنەر بەئاشنابوونی کەسایەتیی نووسەر دەتوانێت توانستی پراگماتیکی لە دەقەکەدا دەستنیشان بکات.

خوێندنەوەی دەق و لێکدانەوەی واتاکەی لە خوێنەرێکەوە بۆ خوێنەرێکی تر بەپێی ئاستی پێشینەی ڕۆشنبیرییان زانیاریی هاوبەش و زانیاریی دنیایی دەگۆڕێت، لێرەدا بەگوێرەی لێکەوتەی ئاخاوتەیی و پەیوەندی و پێکداچوونی خوێنەر لەگەڵ دەقدا، سێ جۆر خوێنەر دیاریدەکەین:

( (یەکەم: خوێنەری کەمپێشینە: پێکداچوونی ئەم جۆرە لەگەڵ دەقدا بەئاڕاستەیەکی نێگەتیڤە خوێنەر لەگەڵ هێماکاندا وەکو خۆی ڕەفتار دەکات و ناتوانێت پەی بەهەڵوێست و زەمینەی بەرهەمهێنانی دەقەکە بەرێت، لەبەرئەوەی پرۆسەی پەیوەندیی نێوان مەبەستی نووسەر و خوێنەر سەرکەوتوو نابێت.

دووەم: خوێنەری ئاسایی: ئەم جۆرە بەهۆی بوونی کەمێک زانیاریی گشتی سەبارەت بەدەقەکە، پێکداچوونەکە بەئاڕاستەیەکی گونجاو لەپێکانی واتای دەقدا دروست دەبێت، بەڵام لە شیکردنەوە و پەیبردن بەمەبەستی نووسەر شکست دێنێت، چونکە تەنها هێماکان مەبەستی نووسەر دەرناخەن.

سێیەم: خوێنەری کارامە: توانستی پراگماتیکی ئەم جۆرە خوێنەرە وادەکات پێکداچوونی خوێنەر لەگەڵ مەبەستەکانی وتاردا بێت، بەشێوەیەک کە تەواوکارانە دەق بەدەرەوەی دەق دەبەسترێتەوە و مەبەستەکە لێکدەدرێتەوە. (تریفە عمر ٦٢: ٢٠٠٨).

بەلادان لە بنەماکانی هاریکاری و بەزاندنەکان ئەم لێکەوتانە لەم دەقانە دەکەونەوە:

## ڕێ.......زمان[1]

د. شێرکۆ عبدالله

- کوردایەتی: ئاوڵفرمانی کاتییە، دەمێکە کاتی نەماوە.
- عەدالەت: ئامرازی سەرسوڕمانە، لەهەر شوێنێک بینیت واقت وڕئەمێنێ.
- نەوت: ئامرازی پەیوەندییە، ئەتوانێ قابیل و هابیل ببەسێ بەیەکەوە.
- مەسئول: فرمانە، تەشریف بەرێتە هەر جێگەیەک شتێک ڕوودەدات.
- تەکەتول: ڕاناوی لکاوە دایم و دەرهەم بەحیزبەوە نووساوە.
- ڕێککەوتن: نیشانەی پرسیارە ئەکەوێتە کۆتایی هەموو شەڕێکی خۆتڕێنەوە.
- مەسـڵەحەت: فرمـانە، چـونکە هەم ڕابـردووی هەیە هەم داهـاتوو، هەم ئەتوانێ ئەمریش بکات.
- سامان: ئامرازی ناساندنە، بچێتە سەر هەر ناوێک مەشهووری دەکات.
- سیتەک: بەحیساب ئامرازی لێکدراوە، بەڵام کەس بۆی لێکنادرێتەوە.
- مەکـتەب سیاسـی: ڕانـاوە لەبەرئەوەی هەم سـەربەخۆیە و هەم لەحیمـیش کراوە بە سەرۆکی حیزبەوە.
- تەلەفزیۆن: ئاوڵفرمانە، وەسفی کێشە قۆڕەکان ئەکات.
- کوردایەتی: ئاوڵفرمانی کاتییە، دەمێکە کاتی نەماوە.

<+[2] زۆرێک لە مەسئولین و کاربەدەستان کە پێشتر خەباتیان کردووە لەپێنـاو بەدەستهێنانی ئازادی و پاراستنی خـاک و نەتەوە، بەڵام کە گەیشـتنە دەسـەڵات ئەم خەباتەیان ناشـیرین کـردووە و تەنهـا بیـر لە بەرژەوەنـدی کەسـیی خۆیـان دەکەنەوە خەریکـی خـۆ دەوڵەمەنـدکردنن، وایـان لەخەڵکـی کـردووە بەچـاوێکی خـراپ سـەیری کوردایەتی بکەن...

عەدالەت: ئامرازی سەرسوڕمانە، لەهەر شوێنێک بینیت واقت وڕئەمێنێ.

<+ لەم وڵاتەدا یاسا و عەدالەت بوونیان نییە، نایەکسانی و پێشێلکردنی یاسا و بەرژەوەندیی تاکەکەسی ڕەشبینی باڵی بەسەر وڵاتـدا کێشـاوە یاسـا تەنهـا لەسـەر هەژار و بێدەسەڵاتەکان واتە چینی خوارەوە جێبەجێدەکرێت.

---

١ شـێوەی نووسـینی تەنزەکـان لە ڕۆژنامەکـان چـۆن بـووە وەکـو خـۆی نووسـیومانەتەوە بێدەستکاری.

٢ (<+ ): نیشانەی لێکەوتەی ئاخاوتەییە.

نەوت: ئامرازی پەیوەندییە، ئەتوانێ قابیل و هابیل ببەسێ بەیەکەوە.

<+ نەوت، سەرچاوەی سەرەکی داهاتی وڵاتە، هەرچەندە دوژمنایەتی و یەکترقبوڵ نەکردن لەنێوان پارتە سیاسییەکان و بەرپرسانی دەستڕۆیشتوو هەبێت، کە باسی نەوت و داهات دەکرێت، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان هەموو شتێک پشتگوێ دەخەن و دەبن بە برای یەکتری، بۆ بەشکردنی سامانی وڵات لەنێوان خۆیان گوێ بەهیچ ناکۆکییەک و دوژمنایەتییەک نادەن.

مەسئول: فرمانە، تەشریف بەرێتە هەر جێگەیەک شتێک ڕووئەدات.

<+ مەسئولینی حیزبی لەم وڵاتەدا لە سەرووی یاساوەن، بچنە هەر جێگەیەک شتێک ئەکەن، ئەم شتەش هەر لەبەرژەوەندیی خۆیان دەبێت، بۆئەوەی خەڵک باسیان بکات و هەژموونی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا زیاد بکەن.

تەکەتول: ڕاناوی لکاوە دایم و دەرهەم بەحیزبەوە نووساوە.

<+ حیزبەکانی ئەم وڵاتە بە بەردەوامی لەناو خۆیاندا لەسەر بەرژەوەندیی کەسی و دەسەڵات هەر خەریکی پیلانگێڕانن لەیەکتری شکاندنی بەرامبەر و خۆ بەرزکردنەوەیان، هەر یەکە و بۆخۆی کۆمەڵێک کەس لەدەوری خۆی کۆ دەکاتەوە و کوتلەک دروستدەکات و چاو لەوانیتر سوور دەکاتەوە و، هەموو ئامانجەکەشیان بۆ زیاترکردنی دەسەڵاتیانە بەسەریەکتردا.

ڕێککەوتن: نیشانەی پرسیارە ئەکەوێتە کۆتایی هەموو شەڕێکی خۆترێنەوە.

<+ ئەم حیزبانە بەدرێژایی تەمەنیان هەر خەریکی شەڕی ناوخۆ و دوژمنایەتی و کوشتن و تۆمەتبارکردن و شکاندنی یەکترین، دوای ئەوەی لە شەڕەکان لەگەڵ یەکتری کۆمەڵێک گەنجی بێتاوان دەبن بەقوربانی و منداڵیان هەتیو و ژنیان بێوەژن دەبن بۆخۆشیان وەک بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن لەسەر مێزی گفتوگۆ دادەنیشن و ڕێککەوتن دەکەن خۆیان بەبێتاوان لەقەڵەم دەدەن.

مەسڵەحەت: فرمانە، چونکە هەم ڕابردووی هەیە هەم داهاتوو، هەم ئەتوانێ ئەمریش بکات.

<+ حیزبەکان هەرکاتێک مەسڵەحەت بکەوێتە نێوانیان گوێ بەهیچ شتێک نادەن، تەماشای مەسڵەحەتی خۆیان دەکەن، لەگەڵ دوژمنی نەتەوەکەشیان هەموو شتێک لەپێناوی بەرژەوەندیی خۆیان لەژێرپێ دەنێن.

**سامان: ئامرازی ناساندنە، بچێتە سەر هەر ناوێک مەشهووری دەکات.**

<+ لەم وڵاتەدا لەبەرئەوەی حیــزب باڵادەســتە، بــۆیە هەرکەســێکی نــاو ئەو حیزبانە، کە حیـزبەکە ئـارەزوو بکـات بەشـێوەیەکی نایاسـایی و لەمـاوەیەکی کورتـدا سامانیکی زۆر کۆدەکاتەوە لەسەر حیسابی خەڵکی سادە و هەژار ناوداری دەکەن.

سیتەک: بەحیساب ئامرازی لێکدراوە، بەڵام کەس بۆی لێکنادرێتەوە.

<+ ئەم وڵاتە وەکـو شـاری بـێ حـاکم وایە، هەر دەسـەڵاتدارە و، بەئـارەزووی خۆی هەندێک زەوی پاوان دەکات و سیم بەنـدی دەکـات و ئەیکـات بەمـوڵکی خـۆی، داگیرکردنی موڵکی گشتی لەلایان وەکو ئاوخواردنەوە وایە، هەرچی دەسەڵاتی هەبێت زەوییەک بۆخۆی سیم بەند دەکات، وای لێهاتووە سەیرانگاکان و شـوێنە گشـتییەکان بوون بەموڵکی تاکەکەس و کەس نازانێت هی کێیە.

مەکتەب سیاسی: ڕاناوە لەبەرئەوەی هەم سـەربەخۆیە و هەم لەحیمـیش کـراوە بە سەرۆکی حیزبەوە.

<+ مەکتەب سیاسی حیزبەکـانی ئەم وڵاتە بەنـاو سـەربەخۆ و بڕیاربەدەسـتن، بەڵام سـەرۆکی حیـزب هەمـوو شـتێکە تـاکو دەمرێـت دەبێـت هەر سـەرۆک بێـت و ئەندامانی خێزانەکەی جێگـای دەگرنەوە، هەربـۆیە سـەرۆک پـێش مردنـی ئەنـدامانی خێزانەکەی دەکات بەئەندامی مەکتەبی سیاسی.

تەلەفزیۆن: ئاوڵفرمانە، وەسفی کێشە قۆڕەکان ئەکات.

<+ تەلەفزیۆنەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن، چونکە سـەربەحیزبەکانن و لە ژێـر سێبەری حیزبدان، ناتوانن ڕاشکاوانە کێشەکانی خەڵکی باسبکەن و دەستبخەنە سەر برینەکـان، بەڵکـو لە بەرژەوەنـدیی حیزبەکانیـان قسـە دەکەن و خەڵکـی چەواشـە دەکەن، باسی شتی زۆر لاوەکی دەکەن.

# بانقی بیست و یەک

**د. شێرکۆ عبدالله ٢٤/٦/ ٢٠١٤**

منداڵ ماوەیەکی باش فێری گاگۆڵکێ ئەبێ ئینجا ئەتوانێ بە پێ بڕوات. ئەمە قسەی عیلمە، مەنتیقیش بۆی ئەسەلمێنێ ئەڵێ ئەشهەدوبیلا ڕاست ئەکەی. بەڵام کوردە حەیاتەکە نەوعێکی ترە. شتی وای لێ مولاحەزە ئەکرێ نە (عیلم) سەری لێ دەردەکات و نە (مەنتقیش) ئەتوانێ لە قووتووی هیچ عەتارێکا جێی بکاتەوە، مەسەلەن بۆنموونە:

- **تازەترین کامێرای مروورمان پێدابین ئەکرێ، کەچی پاکەتێک دەرمانی دووپشکمان پێنایەت.**
- **ئاگامان لە هەموو چپەچپەکانی ناو کۆشکی سپییە، بەڵام نازانین لە مەکتەب سیاسییەکاندا چی ئەگوزەرێت.**
- **پاپۆڕە نەوت ئەگەیەنینە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی، کەچی تانکەرێکمان بۆ نابرێ بۆ قەرەتەپە.**
- **دەیان ڕاقیصەی ئۆکرانیمان پێدێت، کەچی ناتوانین دوو پسپۆڕی ئابووری لە ژاپۆنەوە بهێنین.**
- **بەقەد دنیایەک حەزمان لە شەڕە، کەچی شاری یاریمان هەیە.**
- **ئەتوانین هەموو نەوعە ئینتیخابێک بکەین، بەڵام نەتیجەکەیمان پێ قبوڵ ناکرێت.**
- **شارۆچکەی وامان هەیە کۆلێجی تیایە، کەچی قوتابخانە سەرەتاییەکەی داخراوە.**
- **دەوڵەتمان پێ ئیعلان ئەکرێ، کەچی، بانقێکمان پێ بەڕێوە نابرێ، تەنانەت بانقی بیست و یەکیش.**

<+ لەم پەڕەگرافەی سەرەوە نووسەر بەشێوەیەکی تەنزئامێز هاتووە شتێکی ڕاست و دروستی باسکردووە، بەڵام ڕەخنەیەکی زۆر توند لە میللەتەکەی دەگرێ بەوەی کە ئەو شتانەی دەیکات نەعیلم و نەمەنتیق قبوڵی ناکات و شتەکانمان هەمووی بەپێچەوانەی داواکارییەکانە.

**- تازەترین کامێرای مروورمان پێدابین ئەکرێ، کەچی پاکەتێک دەرمانی دووپشکمان پێنایەت.**

<+ ئـێمەی کـورد هەمـوو شـتێک لە دەرەوە هـاوردە دەکەیـن، خۆمـان هـیچ شـتێکمان پێدروسـت ناکرێـت و میللەتێکـی بەکـاربەرین، لەگەڵ ئەوەشـدا ئەوەی کە هاوردەی دەکەین، بازرگان و دەسەڵاتداران لە بەرژەوەنـدیی خۆیـان شـتەکان هـاوردە دەکەن و تەنها بیـر لەوە دەکەنەوە چـۆن خۆیـان دەوڵەمەنـد بـکەن لەسـەر حیسـابی خەڵکی هەژار، کامێراکانی مروور، چونکە بۆ پارە پەیداکردنە باشترین جـۆری کـامێرا دێنن، بەڵام خەڵکی فەقیرو هەژار لە شارو لادێکاندا دووپشکی پێوەدەدات و دەمرێت، دەرمانی بۆ دابین ناکەن و بۆیان نارشێنن، بەهیچ شێوەیەک لە خەمی هاوڵاتیاندانین.

**- ئاگامان لە هەموو چپەچپەکانی ناو کۆشکی سپییە، بەڵام نـازانین لە مەکتەب سیاسییەکاندا چی ئەگوزەرێت.**

<+ مەکـتەب سیاسـییەکانی حیزبەکـان، لە ژوورە تاریکەکانـدا بڕیـار دەدەن و لەبەرژەوەنـدیی خۆیـان و نـاهێڵن ئەندامەکانیشـیان بـزانن، بەبۆچـوونی خۆیـان و لەبەرژەوەندیی خۆیان بڕیار دەدەن بێگوێدانە خەڵکی و ئەندامەکانیشیان.

**- پاپۆرە نەوت ئەگەیەنینە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی، کەچـی تانکەرێکمـان بۆ نابرێ بۆ قەرەتەپە.**

<+ ئـێمەی کـورد خـاوەنی بەحـری نەوتـین، بەڵام لەبەر دزی و نـاڕوونی لە مەلەفی نەوت، لە وەرزی سەرمادا خەڵکی بەدەست بـێ نەوتییەوە دەنـاڵێنێ و نەوت نییە بیسووتێنێ و خۆپیشاندان ئەکەن و بەناچاری سەرچاوەی تر بۆ خۆگەرمکردنەوە بەکارئەهێنن وەکو کارەبا و داری دارستانەکان.

**- دەیـان ڕاقیصـەی ئۆکرانیمـان پێـدێت، کەچـی نـاتوانین دوو پسـپۆڕی ئابووری لە ژاپۆنەوە بهێنین.**

<+ حکـومەت لە خەمـی خەڵـک و وڵاتـدانین و نایانەوێـت ژێرخـانی وڵات ببـووژێتەوە، بەڵکـو هەرخەریکـی بڵاوکـردنەوەی شـتە خـراپ و خەڵـک سـەرقاڵکردنن بەشـتی لاوەکـی، ژێرخـانی وڵات کـاول دەکەن و بەهەر هۆکارێـک بێـت دەیانەوێـت سامانی وڵات بە تاڵان بەرن.

**- بەقەد دنیایەک حەزمان لە شەڕە، کەچی شاری یاریمان هەیە.**

<+ لەسـەر بچـووکترین تێکنەگەیشـتن شـەڕی گەورە دروسـت دەکەن و هەر حیزبە و خاوەنی چەکداری خۆیەتی و خۆی بەدەمڕاست و گەورەی میللەت دەزانێت و کەسی پـێ قبـوڵ نیـیە، زمـانی گفتوگـۆ و بیـروڕای جیـاواز شـتێکی نـامۆیە، لەکـاتی قسەکردنیش باسی ئاشتی و پێکەوەژیان دەکەن.

**- ئەتوانین هەموو نەوعە ئینتیخابێک بکەین، بەڵام نەتیجەکەیمان پێ قبوڵ ناکرێت.**

<+ لەم هەرێمەی ئێمەدا هەموو جۆرە هەڵبژاردنێک دەکرێت، بۆ هەموو دەستە و ڕێکخراوێک هەڵبژاردن دەکرێت، بەڵام لە هەمووشیاندا فرتوفێڵی زۆر ئەنجام دەدرێت، هەر حیزبێک دەنگی کەم بهێنێت ئەنجامەکەی قبوڵ نییە، لەلای ئێمە هەڵبژاردن تەنها بۆ ڕای گشتی و شەرعیەتدانە بەپرۆسەکە و لە ڕاگەیاندنەکان باسی دەکەن و بۆ ڕازاندنەوەی ڕووە ناشیرینەکەی خۆیانە وای پێشاندەدەن کە دیموکراتین، بەڵام لە ناوەڕۆکدا ئەنجامەکەی قبوڵناکەن.

**- شارۆچکەی وامان هەیە کۆلێجی تیایە، کەچی قوتابخانە سەرەتاییەکەی داخراوە.**

<+ کردنەوەی زانکۆ و کۆلێج و پەیمانگا لەم هەرێمەدا بەپێی میزاج و رکابەرەکی و بۆ بانگەشەی هەڵبژاردن و بەبێ هیچ ئامادەکارییەک و دیراسەکردنێک بڕیار لەسەر کردنەوەیان دەدەن، تەنها بۆ دڵ ڕازیکردنێکی کاتیی خەڵکی، ئەمەش بێ پلانی حکومەت دەگەیەنێت.

**- دەوڵەتمان پێ ئیعلان ئەکرێ، کەچی، بانقێکمان پێ بەڕێوە نابرێ، تەنانەت بانقی بیست و یەکیش.**

<+ چوار شارت پێ بەڕێوە ناچێت و ئیدارەیەکی باشی ناکەیت، ناتوانی پێداویستییە سەرەتاییەکانی بۆ دابین بکەیت چۆن داوای دەوڵەتی سەربەخۆ دەکەیت و چۆنی بەڕێوە دەبەیت.

## ڕۆژێ دادێ

**د. شێرکۆ عبدالله ٢٠١٥/٥/٥**

شتە سروشتییەکانی جاران ئەوەندە بەخێرایی لەناوئەچن و باویان نامێنێ، پیاو (هەروەها ژنیش) تەصەور ئەکات: پێنج شەش ساڵی تر گوێی بەم دایەلۆگە دراماتیکییانە بزرینگێتەوە.

- **وەی توخوا عەمرم نەمێنێ، ئەو مەسئولە فەقیرە خەباتی کۆنی هەیە.**
- **دووربێ لەڕووتان ئەمرۆ ژنێکم بینی بەبێ عەمەلیات منالّی بووبوو.**
- **ئەیەڕۆ کۆلانەکەی ئەوبەرمان کرێچی تیایە عەرەب نیین.**
- **یەعنی چی لێی نازانی هەتیو؟! کورد هەیە ڕۆژنامەنووس نەبێت.**
- **ئێ ئێ..ئەزانم کێ ئەڵێ..ئەوە وەختی خۆی خوشکێکی هەبوو عەیبو شوورەیی بەبێ میقنەعە ئەچوو بۆ دەوام.**
- **کاکە مەعقول نییە بەقورعان، ئەوە مانگێ زیاترە فێری گاگۆلکێ بووە کەچی ئەمری تەعیناتەکەی دەرنەچووە.**
- **بەڵێ بەڕێزان ئەم گەراج و کافتریایەی کە ئێستا ئەیبینن وەختی خۆی پێیان ئەگو بەردەرکی سەرا.**
- **درۆ ئەکا وەڵڵا خەریجی چی! ئەگەر خەریج بوایە ئەیانکرد بەحیمایەی مەسئولێک.**
- **قەناعەتم بەوە نییە، چۆن ئێوە سێ سەر خێزانن و تەنیا دوو سەیارەتان هەیە.**

– وەی توخوا عەمرم نەمێنێ، ئەو مەسئولە فەقیرە خەباتی کۆنی هەیە.

<+ لەکاتی ئێستادا زۆرێک لەو مەسئول و کاربەدەستانەی کە ڕۆژانێک خەباتیان دەکرد بۆ سەربەخۆیی و ئازادیی گەل، ئێستا هەموو شتێک لەدەست خۆیانە و بەتەواوی باڵیان بەسەر هەموو جومگەکانی کۆمەڵگادا کێشاوە و ئیشی نایاسایی دەکەن و لە یاسا لادەدەن و سامانی میللەت بەتاڵان دەبەن، کە داوای لێپرسینەوەیان لێ ئەکرێت ئەڵێن خەباتی کۆنمان هەیە، ئەم خەباتەیان وا ناشیرین کردووە بەتێپەڕبوونی کات خەڵکی پێی شەرمە باسی خەباتی کۆن بکات.

- **دووربێ لەڕووتان ئەمرۆ ژنێکم بینی بەبێ عەمەلیات منالّی بووبوو.**

<+ ژنانی دووگیان لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا بەهۆی ئەو پێشکەوتنە تەکنۆلۆجیایەی هەیە، دەزانن وەزعی کۆرپەکەیان چۆنە و لە چ بارێکی تەندروستیدایە، لەژێر

چاودێری پزیشکدان، ژانی منداڵبوون بەئازارترین ژانە، ژنانی ئێستا بۆئەوەی ئەم ژانە نەچێـژن، ئەچـن بەنەشـتەرگەری منـداڵەکانیان دەرئەهێـنن، کە لەڕووی زانسـتیی پزیشکییەوە کارێکی هەڵەیە، نەشتەرگەری تەنها لەکاتی زۆر پێویست نەبێت لایەنی سلبی زۆر زیاترە، ئەم جۆرە لە نەشتەرگەری لەلایەن ژنان بووە بەدیاردە.

- ئەیەڕۆ کۆڵانەکەی ئەوبەرمان کرێچی تیایە عەرەب نیین.

<+ ڕژێمی لەناوچوو و دڕندەی بەعس، لەکاتی خۆی هەموو هەوڵێکی ئەدا بۆ ئەوەی لە هەموو شار و شارۆچکەیەک ژمارەی عەرەب بەسەر کورددا زاڵ بکات و وای نیشانبدات ئەم شارە شارێکی عەرەبییە (تعریب)ی دەکرد، بەڵام دوای لەناوچوونی ئەم ڕژێمە دڕندەیە وا چاوەڕوان دەکرا ئەم دیارەیە نەمێنێ، کەچی ئێستا بەهۆی شەڕ و گرژییەکانی ناو وڵات عەرەبێکی زۆر هاتوونەتە کوردستان، ناچن بۆ شارە عەرەبییەکانی خۆیان، کوردیش لەبەر لایەنی مرۆڤایەتی باوەشی بۆ کردوونەتەوە شوێنی نیشتەجێی بۆ دابین کردوون، وای لێهاتووە لەهەندێک شاردا ژمارەیان گەیشتۆتە ژمارەی دانیشتوانی شارەکە و لە هەندێک شاردا ژمارەیان زیاتریشە، گەڕەک نییە لە هیچ شارێکی کوردستان کرێچی عەرەبی تیا نەبێت، کرێی خانوویان لەسەر خەڵکی خۆمان گران کردووە و خەڵکیان هەراسانکردووە، کە ئەمەش زەنگێکی ترسناکە بۆ گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان و ناوچەکە، کاربەدەستە ڕەگەزپەرستەکانی عەرەب (شۆڤینی) لە بەغدا ئەم هەلەیان قۆستۆتەوە و داوادەکەن ئەو عەرەبە ئاوارانە نفوس و فۆرمی خۆراکیان بگوێزنەوە ئەم شارانەی لێی نیشتەجێن بە مەبەستی تەعریبکردنیان.

**- یەعنی چی لێی نازانی هەتیو؟! کورد هەیە ڕۆژنامەنووس نەبێت.**

<+ بەهۆی ئەو بارە ڕامیارییەی کوردی تێکەوتووە، گەورە و بچووک لەناو کورددا، لێکدانەوەی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و... بۆ ڕووداوەکانی دەرەوە و ناوەوە دەکەن، هەمووی بووە بەشرۆڤەکاری سیاسی، دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش ئەوەندە زۆربوون، زۆرینەی خەڵکی بووە بە ڕۆژنامەنووس، سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارەیەکی بێشوماری لە ئەندام هەیە.

**- ئێ ئێ..ئەزانم کێ ئەڵێ..ئەوە وەختی خۆی خوشکێکی هەبوو عەیبو شوورەیی بەبێ میقنەعە ئەچوو بۆ دەوام.**

<+ نیقاب، ئەو قوماشەیە کە ئافرەتی موسڵمان ئەیدا بەسەر سەریدا و دەموچاو و شانی دادەپۆشێت هیچ شوێنێکی بەدەرەوە نابێت، بەڵام لەڕۆژگاری

ئەمڕۆدا ئەمە نەماوە و کەم بۆتەوە، ئافرەتان تەنها لەچک دەکەن واتە تەنها پرچیان دادەپۆشن و دەموچاویان بەدەرەوەیە، بەڵام لەئێستادا بەهـۆی زۆربـوونی ئەم هەمـوو حیزبە ئیسلامییانە و دروستبوونی کۆمەڵە و گرووپـانەوە هەریەکە و جـۆرە فتـوایەک ئەدات، نیقابیش پەیدابۆتەوە.

**- کاکە مەعقول نییە بەقورعان، ئەوە مانگێ زیاترە فێری گاگۆلکێ بـووە کەچی ئەمری تەعیناتەکەی دەرنەچووە.**

<+ لەم وڵاتەدا یاسا سەروەر نییە و یاسا تەنها بۆ هەژار و بێ دەسەڵاتەکانە، کاربەدەستان و دەسترۆیشتووانی ناو حیزب و حکومەت لەدەرەوەی یاسـان و ئیشـی نایاسایی زۆر دەکەن، منـداڵی خۆیـان و نزیکەکانیـان لە هەر تەمەن و قۆناغێکـدابێت دایدەمەزرێنن و ئیشی بۆ دەبیننەوە، بۆیە دەبینـین منـداڵەکانیان ئێسـتا قۆناغەکـانی خوێنـدنیان تەواو نەکـردووە دامەزراون و مووچەیـان هەیە، هەر بەهـۆی بـوونی ئەم گەندەڵی و بێ پلانییەی حکومەتەوەیە لە هەرێمێکـی پێـنج ملیـۆنی ملیـۆن و نیوێـک مووچەخۆر و بندیواری هەیە، هەر ئەمەش بوو وای لە خەڵکی کرد واز لە کشتوکاڵ و ئاژەڵـداری و پیشەسـازی بێنێـت، کە بـووە هـۆی دارمـانی ئـابووریی وڵات و هەمـوو شـتێک لەدەرەوە هـاوردە بکرێـت، ئەگەر یەک هەفـتە سـنوورەکان دابخـرێن خەڵـک تووشی هیلاکەت و برسییەتی دەبێتەوە.

**- بەڵێ بەڕێزان ئەم گەراج و کافتریایەی کە ئێستا ئەیبینن وەختی خۆی پێیان ئەگو بەردەرکی سەرا.**

<+ بەهۆی سەروەرنەبوونی یاساوە، کاربەدەسـتە حکـومی و حیزبییەکـان هەر پارچە زەوییەکی باش لەهەر شوێنێک ببینن، بێگوێـدانە هـیچ یاسـا و ڕێسـایەک، جـا ئەو زەوییە شوێنەواری دێرین بێت، شوێنی تەرخانکراوبێت بـۆ بـاخچە و قوتابخـانە و نەخۆشـخانە و ...داگیریـدەکەن و ئەیـکەن بە باڵەخـانەو گەراج و پـارەی پـێ پەیـدا دەکەن.

**- درۆ ئەکا وەڵڵا خەریجی چی! ئەگەر خەریج بوایە ئەیانکرد بەحیمایەی مەسئولێک.**

<+ خەڵکی دەرچووی زانکۆ و پەیمانگاکان، کە خەڵکانی ئەکادیمی و لێهـاتوو و خاوەن زانست و زانیارین، لە هەموو دنیادا ئەوانە پێشەنگن و دەوڵەت پێشـدەخەن و گۆڕانکارییەکان لەسەردەستی ئەوان دەبن، بەڵام لای خۆمان کەسی شیاو لەشوێنی شیاو دانانرێت، بەزۆری لەسەر بنەمای حیزبی دادەنرێت، دەرچـووانیش بەشـێوەیەکی

گشتی پەراوێزخراون، بۆیە بۆ بژێویی ژیان بەناچاری پەنا بۆ چەکداری و پاسەوانی مەسئولێکی نەخوێندەوار دەبەن.

**- قەناعەتم بەوە نییە، چۆن ئێوە سێ سەر خێزانن و تەنیا دوو سەیارەتان هەیە.**

<+ لەبەر بێ پلانی حکومەت، و فەرامۆشکردنی هەموو کەرتەکانی وەک پیشەسازی و بازرگانی و ئاژەڵداری و...، حکومەت بۆ پڕکردنی گیرفانی هەندێک مەسئولی حیزبی، بۆوەرگرتنی باجێکی زۆر سەیارە و شتی گرانبەهای خراپمان بۆ هاوردە دەکات، هەرماڵێک چەند کەسن ئەوەندە سەیارەیان هەیە، زۆر هاوردەکردنی سەیارە زۆر قەیرانی لە وڵاتدا دروستکردووە، وەکو قەرەباڵغیی ڕێگاکان و زۆربوونی پێکدادان و ڕێژەی مردنی هاوڵاتییان، کە ئەمانە هەموویان دەبنە هۆی بەهەدەردانی سامانی گشتیی وڵات و داڕمانی ژێرخانی ئابووری.

## بودجەی ٢٠١٥

**د. شێرکۆ عبداللە**

دکتۆری سۆنەر ئەڵێ بەتەمای دەوڵەتی کوردی مەبن بەم زووانە بڵێ ئنگا. کەواتە چی بکەین باشە؟ ئافەرم جلوبەرگە عێراقچییەکەی جاران لە کانتۆرەکە دەربهێنین و لەم ڕاگوزەرە دیموکراسییە بێچەرداخەدا قسەی خێر بۆ خاڵە عەبادی بکەین. موهیمترین قسەی خێریش چییە؟ ئەوەیە فێری بکەیت بودجەی (٢٠١٥) خەسار نەکات و تەرخانی بکات بۆ شتە زەرورەکانی خاک و نەتەوە، بۆ نموونە کڕین و هاوردەکردنی:

١- فاست: بۆ پاککردنەوەی فایل و پاشەڵی برادەرانی فایلدار.

٢- ئەنتی فرێز: بۆئەوەی کە بەدیار خوتبە و تەحلیلی مەسئولەکانەوە دانیشتین، مێشکمان نەیبەستێ.

٣- سلیکۆن: بۆ جوانکردنی وەزعەکە و پڕکردنەوەی چرچ و لۆچی دەموچاوی هەندێک کەسایەتی.

٤- سەدادە: ئەمە زۆر پێویستە بۆ قەپاتکردنی کونە درۆکان، بەتایبەتی ئەوانەی لە موناسەباتەکاندا ئیستۆپی چەناگەیان ئەپچڕێت.

٥- دۆمینە و کاغەزی قومار: لەپێناوی سەرقاڵکردنی برایان و هەڤاڵانی سەرەوە.

٦- چەسپی دووقلو: لەپێناوی تەکەتولە جۆراوجۆرەکان.

٧- عەترو بۆنبرە: بۆئەوەی برادەرانی خوارەوە تەحەمولی ئەم وەزعە بۆگەنە بکەن.

٨- کەپر: بۆدروستکردنی سێبەر، چونکە حازر خۆرەکان رۆژبەرۆژ زیاتر ئەبێ.

٩- ڤیاگرا: بۆ هەستاندنەوەی مەعنەویاتی شۆڕشگێڕیمان.

١٠- میحوەر: نازانم لەکوێ ئەیفرۆشن، بەڵام لەبازاڕی ڕەشیش بێ موشکیلە نییە، چونکە حالییەن مەسئولمان هەیە بێ میحوەرن.

١١- ئایزۆگام: بۆڕێگرتن لەدزەکردنی زانیاری ناو کۆبوونەوەکان.

١٢- شەن: چونکە (کا)یەکی زۆر هەیە پێویستە بە بای بکەین.

١٣- دەنکە کوولەکە: بۆ ئەوانەی کرمیان هەیە.

١٤- تـرێلە و دووتەنـی: بـۆ گواسـتنەوەی سـەنگەر کە ئەوەنـدە زۆر ئەبێـت لەوانەیە ئۆتۆمبیلە بار هەڵگرەکانی خۆمان فریانەکەون.

<+ لە پەڕەگـرافەکەی سـەرەوە دەردەکەوێـت، هەنـدێک لە سـەرکردەکان دروسـتبوونی دەوڵەتـی کوردییـان نزیـک خسـتبۆوە، بەڵام ئەمریکـا هۆشـداری دا کە جـارێ کـاتی مـاوە و لەگەڵ دروسـتبوونی نـیـە لەم کـاتەدا، بـۆیە هەر لە سـەرەتای دروستبوونی حکـومەتەکەی عەبـادی بەشـداری پێکـردن و چـوونەوە بـۆ بەغـدا بـوونە هاوبەشی حکومەتەکەی، داوای یەکپارچەیی خاکی عێراق دەکەن.

- فاست: بۆ پاککردنەوەی فایل و پاشەڵی برادەرانی فایلدار.

<+ هەنـدێک لە مەسـئول و ئەنـدامە پلەبەرزەکـانی نـاو حیزبەکـان لەدەرەوە خەباتیـان دەکـرد و پەیوەندیشـیان لەگەڵ رژێمـی دڕنـدەی بەعـس هەبـوو، پـێش ئاشکرابوونیشیان لافـی کوردایەتییـان بەسـەر خەڵکیـدا لێـدەدا، دوای ئاشـکرابوونیان لەلای خەڵک بەچاوی سووک تەماشا دەکران.

- ئەنتی فرێز: بۆئەوەی کە بەدیار خوتبە و تەحلیلی مەسئولەکانەوە دانیشتین، مێشکمان نەیبەستێ.

<+ مەسئولەکان کاتێـک لەسـەر تەلەفزیـۆن چاوپێکەوتنیـان لەگەڵ دەکرێـت و باسـی بـاری سیاسـی وڵات دەکەن بەهـار دەهێنـنە چۆکـان، ئەو قسـانەی لەسـەر تەلەفزیـۆن دەیـکەن زۆر جیـاوازە لەگەڵ کردارەکانیـان و بڕیارەکانیـان کە لە کۆبوونەوەی ژوورە داخراوەکان دەیدەن.

- سلیکۆن: بۆ جوانکردنی وەزعەکە و پڕکردنەوەی چرچ و لۆچی دەموچاوی هەندێک کەسایەتی.

<+ کاربەدەستان، کە باسی وەزعی وڵات دەکەن کەموکوڕیەکان دەشارنەوە و ڕاستییەکان بەخەڵکی ناڵێن باسی ئەو ئیشە کەمە دەکەن کە کردوویانە، خۆیان بەخزمەتکاری خەڵک دەزانن، کە پێچەوانەکەی ڕاستە.

- سەدادە: ئەمە زۆر پێویستە بۆقەپاتکردنی کونە درۆکان، بەتایبەتی ئەوانەی لە موناسەباتەکاندا ئیستۆپی چەناگەیان ئەپچڕێت.

<+ هەرکە بۆنەیەک دێتە پێشەوە مەسئولین دەکەونە خۆیان و سەردانی کردنی شارو شارۆچکەکان و قسەی گەورەگەورە بۆخەڵکی دەکەن وەعد بەخەڵکی دەدەن، بەتایبەتی کاتێک کە هەڵبژاردن دێتە پێشەوە ئەوەندە وەعد دەدەن تەنها چارەگێکیشیان پێجێبەجێ ناکرێت، خەڵک بێزاربووە لە درۆیەکانیان.

- دۆمینە و کاغەزی قومار: لەپێناوی سەرقاڵکردنی برایان و هەڤاڵانی سەرەوە.

<+ هەڤاڵان و برایانی سەرکردایەتیی حیزبەکان ئەوەندەیان سامانی ئەو وڵاتە بەتاڵان بردووە داهاتیان ئەوەندە زۆرە هەر خەریکی قومار و خواردنەوەن، بێئاگاشن لەچینی خوارەوە.

- چەسپی دووقلو: لەپێناوی تەکەتولە جۆراوجۆرەکان.

<+ تەکەتول لەناو حیزبەکاندا بووە بە شتێکی باو هەر مەسئولەو دەیەوێت خۆی بەهێز بکات و خەڵکی لەدەوری خۆی کۆئەکاتەوە لەوانی تر جیا دەبێتەوە، یان حیزب دروستدەکات یان هەیمەنەی خۆی لەناو ئەو حیزبە نیشاندەدات.

- عەترو بۆنبڕە: بۆئەوەی برادەرانی خوارەوە تەحەمولی ئەم وەزعە بۆگەنە بکەن.

<+ کاربەدەستان وەزعەکەیان وا تێکداوە خەڵکیان لەگەڵ یەکتر کردووە بەدوژمن بەهۆی حیزبایەتییەوە، دوو چینیان لەخەڵکی دروستکردووە یەکێکی زۆر دەوڵەمەند کە سەربە خۆیانە و یەکێکی زۆر هەژار کە زۆرینەی خەڵکەکە دەگرێتەوە، خەڵکیش هەتا سەر ئاوایان لێ قەبوڵ ناکات، چەندین جار خەڵک خۆپیشاندانی کردووە، بەخەڵک دەڵێن وەزعەکە ناسکە و دوژمن دەوری داوین لە قەیراندان، بەدرۆ قەناعەت بەخەڵکی دەکەن.

- کەپر: بۆ دروستکردنی سێبەر، چونکە حارر خۆرەکان ڕۆژبەڕۆژ زیاتر ئەبێ.

<+ مەسئولەکان هەرچی خزم و کەسوکاری خۆیان هەیە، کە ڕۆژێکیش بەرگرییان لەم نیشتمانە نەکردووە و ئارەقەیان بۆ نەڕشتووە، هەر لەدەرەوە خەریکی

رابواردن بوون، ئێستا دەیانهێننەوە و بۆ ماوەیەکی کەم دەیانکەن بە بەڕێوەبەری فەرمانگەیەک و دواتر بەپارەیەکی خەیاڵی خانەنشینیان دەکەن.

– ڤیاگرا: بۆ هەستاندنەوەی مەعنەویاتی شۆڕشگێڕیمان.

<+ بەهۆی ئەو هەموو گەندەڵی و ناداديەوەی لەم وڵاتەدا هەیە، لەلایەن بەرپرسە شۆڕشگێڕەکانی دوێنێوە، خەڵکی پێی شەرمە باسی شۆڕشگێڕی و نیشتمان پەروەری بکات، هەستی نیشتمانی و نەتەوەی لای خەڵک زۆر لاواز بووە.

– میحوەر: نازانم لە کوێ ئەیفرۆشن، بەڵام لەبازاڕی ڕەشیش بێ موشکیلە نییە، چونکە حالییەن مەسئولمان هەیە بێ میحوەرن.

<+ بەرپرسیاریەتی سەربازی پرسێکی زۆر هەستیارە ئەبێت خەڵکانی خاوەن ئەزموون و شارەزا لەو بوارە ئەم ئەرکە وەرگرن، نەک بەهۆی خزم خزمینە و واستە و ماستاوچێتی وەریبگرن، چونکە ئەمە پەیوەستە بە سەروماڵی خەڵکەوە، بۆیە نابێت بەو ئاسانییە بدرێت بەهەموو کەسێک.

– ئایزۆگام: بۆ ڕێگرتن لە دزەکردنی زانیاریی ناو کۆبوونەوەکان.

<+ لەم هەرێمەدا حیزب هەموو شتێکە و بڕیارەکان هەمووی لە حیزبەوە دەردەچن، کۆبوونەوەکانیش لە ژوورە داخراوەکاندا ئەنجام دەدرێن دوور لە ویستی خەڵک و لە بەرژەوەندیی خۆیان بڕیار دەردەکەن.

– شەن: چونکە (کا)یەکی زۆر هەیە پێویستە بە بای بکەین.

<+ شەن، کە ئامێرێکی زۆر سادە و ساکارە ناتوانین دروستی بکەین، ئێمە تەنها کشتوکاڵ و ئاژەڵداریمان هەیە، شەنیش بۆ ئەم کارانە زۆر پێویستە، ئینجا ناتوانین دروستی بکەین، لەسایەی سەری ئەم حکومەتەوە تەنانەت شەنیش لەدەرەوە هاوردە دەکەین، ئەمە ئەوپەڕی دارمانی ئابووریی وڵات دەگەیەنێت.

– دەنکە کوولەکە: بۆئەوانەی کرمیان هەیە.

<+ لەو هەموو خاک و ئاوە زۆرەی کوردستان، ئەگەر نەتوانین کوولەکەش بەرهەم بهێنین، کەواتە توانای هیچمان نییە و بووینە میللەتێکی بەکاربەر، ئەمەش نیشانەی ئەوپەڕی دواکەوتوویی وڵاتە.

– ترێلە و دووتەنی: بۆ گواستنەوەی سەنگەر کە ئەوەندە زۆر ئەبێت لەوانەیە ئۆتۆمبیلە بار هەڵگرەکانی خۆمان فریا نەکەون.

<+ زۆرێک لە مەسئولینی ئێستا هیچ مەبدەئێک و بەرنامەیەکیان نییە، بۆیە چ حیزبێک پارەی باش و شوێنی باشیانبداتێ دەبن بەو حیزبە و سەنگەریان دەگوازنەوە، بەدوای پلە و پایە و پارەوەن.

**ئەنجام**

١- تەنـز یەکـێکە لەو ڕەگەزە (جـۆرە) ئەدەبیـانەی، کە بەهـۆیەوە دەتـوانین بەشـێوەیەکی گاڵتەئـامێز و پێکەنینـاوی و ناڕاسـتەوخۆ ڕەخنەیەکـی بونیـادنەرانە لە دیاردە دزێو و خراپەکانی کۆمەڵگا بگرین بەمەبەستی بەرەوپێشبردن و باشترکردنی.

٢- بەهـۆی تەنـزەوە دەتـوانین ڕەخـنە لە دەسـەڵات و سیسـتەمی سیاسـی و کەسـایەتییەکان بەشـێوەیەکی پێکەنینـاوی بگـرین، چـونکە ئەم شـێوە ڕەخنەگـرتنە نـابێتە هـۆی گـرژی و ئـاڵۆزی لەنێـوان ڕەخنەگـر و ڕەخـنە لێگیـراو، واتە ڕێگـایەکی ئاشتییانە و بێ توندوتیژییە بۆ دەست خستنەسەر برینەکان و چارەسەرکردنیان.

٣- بەهۆی لێکەوتەی ئاخاوتەییەوە دەربڕاوێکی کەم، واتە چەند وشـەیەک یـان ڕستەیەک، دەتوانن واتـایەکی زۆر ببەخشـن. هەروەهـا لـێکەوتەی ئاخـاوتەیی دەبێـتە هۆی فراوانیی بیرکردنەوە و تێگەیشتن لە مانا شاراوەکانی دەربڕاو.

٤- بەبێ بـوونی زانیـاریی پێشـینە و ئاگـاداریی دەوروبەری (سـیاق) لـێکەوتەی ئاخاوتەیی نایەتە دی.

## سەرچاوەکان:

١- ئاڤێستا کمال محمود، پڕاگماتیکی ڕستەی پرسیار و فەرمان لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٦.
٢- تریفە عومەر ئەحمەد، مەبەستی پڕاگمایتکی لە وتاردا، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٨.
٣- جەبار ئەحمەد حسێن، بینای ساتیرا لە کورتە چیرۆکی کوردیدا، کوردستانی عێراق ١٩٧٠ – ١٩٩٠، چاپخانەی حاجی هاشم، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١٢.
٤- شاخەوان مەلا محمد، ڕۆژنامەگەریی تەنز لە هەرێمی کوردستاندا، گۆڤاری سیخورمە وەک نموونە، چاپخانەی حاجی هاشم، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١٤.
٥- شێرکۆ عبداللە، ڕۆژنامەی ڕەخنەی چاودێر، ژمارە ٣٠٢ ، ٢٠١٢.
٦- نەوزاد ئەنوەر عومەر، هەندێ لایەنی کۆمەڵایەتی پڕاگماتیک، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سلێمانی،٢٠١٤.
٧- حەمە سعید حسن، کاریکاتێر بە وشە – ساتیر، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١.
٨- محمد معروف فتاح، لێکۆڵینەوە زمانەوانیەکانم، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی شێروان حسێن حمد و شێروان میرزا قادر، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٠.
٩- محمد معروف فتاح، زمانەوانی، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١.
١٠- عومەر محمود کریم، سیمای پڕاگماتیکی و سیمانتیکی گریمانە پێشەکییەکان، نامەی دکتۆرا، زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٩.
11- Grice,H.P.(1975)Logic and conversation-in cole.
12- Leech,G,(1983),Principle of pragmatics,Londan:Lomgman.
١٣ – محمد علم الدين، اساسيات الصحافة في القرن الحادي والعشرين ،ط٢، قاهرة، ٢٠٠٩.
١٤ – محمد محمد يونس، مقدمة في علمي الدلالة والخطاب، الطبعة الاولى، دار الكتاب الجديد، بيروت، ٢٠٠٤.

سەرچاوەی نموونەکان:

- کوردستانی نوێ // د. شێرکۆ عبداللە.

## ملخص البحث

هذه الدراسة بعنوان (الاستلزام الحواري في السخرية). تعتبر السخرية نوعا من أنواع الأدب وتنتقد بشكل ساخر مجمل الظواهر القبيحة وغير المقبولة لجميع الطبقات الاجتماعية، وذلك بغرض تحسين وتقدم المجتمع من جميع النواحي ، دون التقليل من شخصيته أو جرح مشاعره. وهذا النوع من النقد، يتم بواسطة كلمات قليلة تحمل معاني كثيرة، ويفهم دلالات السخرية من له خلفية علمية ومن هو ذو إلمام ببيئة الحوار، أي من يعيش الواقع، وهذا نوع من المعنى يطلق عليه (الاستلزام الحواري).

## Abstract

This study is under name (conversation implicature in satire).satire is a kind of literature kinds, which criticize all sorts of negative attributes in various classes within society in a peaceful and hilarious way. This is to adjust and develop society. It is done in a method that criticized person is not hurt emotionally and personally. However, the afew words are used to the criticism, the words have wide meaning. Those people who have common ground and aware of conversational context, and those who live within the reality, they understand the satires. This kind of meaning is (conversational implication).

# ستراتیژییەتی گوتار
# لە دوو چامەکەی (نالی) و (سالم)دا
## (توێژینەوەیەکی پراگماتیکییە)

**م. ی. بەهار زایر محەمەد**
بەشی کوردی/ کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی/
زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر

**پێشەکی**:
گوتار یەکەیەکی کردەی گەیاندنە کە بۆچوونێکی دیاریکراو لە قسەکەرێک یان نووسەرێکەوە لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت بۆ ئەوەی کاریگەری لەسەر وەرگر دروست بکات، لەگەڵ ڕەچاوکردنی بارودۆخ و دەوروبەرەکەی، لە هەموو کایە مەعریفییەکاندا لە سەردەمە جیا جیاکاندا کۆمەڵە کەسێک گوتاری تایبەت بە خۆیان هەیە کە خۆی لە هەندێ چەمک و بیرکردنەوەدا دەبینێتەوە، بیرو بۆچوونەکان ئاڕاستە دەکات، بە ئاشکرا بێت یان بە پەنهانی لە زمانی قسەکردن و نووسینی کەسەکاندا خۆی دەردەخات. لێرەشەوە دەتوانین بڵێین لە هەموو گوتارێکدا نێرەرێک هەیە کە پەیامێکی پێیە ئاڕاستەی وەرگرێکی دەکات و لەم نێوەندەشدا سیاق ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە تێگەیشتن لە گوتار و مەبەستەکانی قسەکەر.

قسەکردن لەسەر ستراتیژییەتی گوتار، لە قووڵاییدا، قسەکردنە لەسەر ئەو بنچینانەی کە گوتارەکەی لەسەر بونیادنراوە. توێژەران گرنگییان بەو ستراتیژییەتانە داوە کە نێرەر دەیگرێتەبەر بۆ ئەوەی گوتارەکەی دابڕێژێت و ئاڕاستەی بکات، نێرە ر دەیەوێت لە ڕێگای ئەو ئامراز و میکانزمە زمانییانەوە مەبەست و ئامانجەکانی خۆی بپێکێت و وەرگر بە پەیامەکەی ڕازی بکات .

بەم جۆرە لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدراوە ئەو ستراتیژییەتانە بخرێنەڕوو کە (نالی) و (سالم) لە دوو چامەکەیاندا گرتوویانەتەبەر بۆ ئەوەی گوتار و مەبەستەکانیان بە وەرگر بگەیەنن.

لە تەوەری یەکەمدا، باسی چەمکی گوتار و یەکەکانی کراوە، پاشان ستراتیژییەتی گوتار خراوەتەڕوو، دواتر پەیوەندیی دەق و گوتار ڕوونکراوەتەوە و تیشک خراوەتە سەر گوتار لە دەقی شیعریدا، لە تەوەری دووەمدا، هەوڵدراوە جۆرەکانی ستراتیژییەتی گوتار لە دوو چامەکەی (نالی) و (سالم) باس بکرێت و ئەو میکانزم و کەرەستە زمانییانە باسکراوە کە شاعیران هەوڵیانداوە لە ڕێگایانەوە گوتارەکانیان ئاراستەبکەن .

**تەوەری یەکەم**: **چەمک و ستراتیژییەتی گوتار :**

**یەکەم: گوتار :**

یەکێک لەو چەمکانەیە کە لە لێکۆڵینەوەی زمانەوانیدا جێگای سەرنجدان و لێکۆڵینەوەیە، گوتار چەمکێکی نوێ نییە بەڵکو نوێکراوەیە، لەهەر قۆناغێکدا بەشێوەیەک خۆی دەنوێنێت، پێناسەکردنی گوتار بەپێی ئەو بابەتانەی گرنگی پێدەدرێت دەگۆڕێت.

لە زمانەوانیی نوێدا بە دوو شێوە دەربڕدراوە، یەکەم: ئەو چەمکەیە کە ئاراستەی بەرامبەر کراوە بۆ ئەوەی مەبەستێک بگەیەنێت، دووەم: ئەو شێوەی زمانە کە ڕستە تێدەپەڕێنێت، کەچی هەندێ کەس پێیانوایە گوتار لە سیاقی کۆمەڵایەتیدا خۆی دەبینێتەوە. ( یقطین: ١٩٨٩:٤٥) بە چاو پۆشی لەو پۆلێنکردانەی کە ڕێزماننووسەکان بۆ گوتار کردوویانە بەوەی کە ڕستەیەک بێت یان گەورەتر و بچووکتر، گوتار یەکەیەکە لە کردەی گەیاندندا کاردەکات، وەک کردەیەکی چالاک بۆ بەرهەمهێنانی گوتنێک لە دەوروبەرێکی دیاریکراودا. (الشهري ٢٠٠٤:٣٧:)

بەم جـۆرە گوتـار بـریتییە لە نووسـراو یـان گـوتراو یـان ڕا گۆڕینەوەیەک کە لە دۆخێکی دیاریکراو دێتە ئارا و چەمکەکانی لەسـەر بونیـاد یـان سیسـتمێکی هۆشـیارانە دامەزراوە و دۆخ و هەلـومەرجی گوتـار ڕۆڵێکـی کـاریگەر دەگێڕێـت و تەنیـا بەپێـی توانسـتی بەرهەمهێنانەوەیان کە، سیستمی گوتار شتەکان درک دەکات.

ئیمێل بێنفێست واتاکەی فراوانتر کرد و وتی گوتار هەموو ئەو گوتنانەیە کە گریمانەی نێرەرێک و وەرگرێک دەکات کە لایەنی یەکەم مەبەستی کاریگەری دروستکردنە لەسەر لایەنی دووەم، بێنفێست دەڵێت نابێت وەک یەکەیەکی زمانی بەتاڵ تەماشای گوتار بکەین لەبەر ئەوەی ئەم یەکەیە پەیوەستە بە کەلتوور و کۆمەڵگاوە. (الباردي : ٢٠٠٠: ٢٨) و بێنفێست بەم شـێوەیە پێناسـەی گوتـار دەکـات: ((هەر گوتنێـک یـان نووسینێک کە بۆچوونێکی دیاریکراو لە قسەکەرێک یان نووسەرێکەوە لەگەڵ خـۆی هەڵگرێـت، وای دابنێـت کە کـاریگەری لەسـەر گـوێگر و خـوێنەرەکە دروسـتکردووە، لەگەڵ ڕەچـاوکردنی بـارودۆخ و دەوروبەرەکەی.)) (بوداود:؟ : ١٤)

شارۆدۆ پێیوایە دەربڕینێکە دەبێت لە سیاقێکی دیاریکراودا دانرێت، لای ئەو گوتـار قسـەکردنە لە دەوروبەرێکـدا کە بەکـارهێنەرانی زمـان لەسەری ڕێککەوتوون. ( ابرير :٢٠٠١: ٧٦) شارۆدۆ بەتەواوی گوتار بە دەوروبەرەوە دەبەسـتێتەوە، دەبێـت ڕێککەوتـن هەبێـت لە نێـوان بەشـداربووواندا. وەهەر بـۆیە لێـرەدا دەردەکەوێـت کە دەشـێت گوتـار پەیوەست بێت بە تاکەکەسێک یان گرووپێک یان ڕێبازێکی فیکرییەوە.

لە ڕوانگەی زمانەوانی ئەرکییەوە گوتار بەکارهێنانی زمانە، لای ئەوان گوتـار ئەو وەسـفە فۆرمـالییە تێـدەپەڕێنێت و تەنهـا لەسـەر دەرخسـتنی پەیوەنـدییەکانی نێـو گوتـار و شـیکردنەوەیان ناوەسـتن، زیـاترگرنگی بە یەکەکـانی دەوروبەر دەدەن، چـۆن ئەم دەوروبەرە وای کردووە ئەم جۆرە گوتارە بەرهەم بێت، تەئویلکردنی، پەیوەندیی نێوان دوولایەنەکەی گوتـار، پـلە کۆمەڵایەتییەکەیـان، ئەو ڕێگایـانەی

گرتوویـانەتە بەر بۆ بەرهەمهێنـانی ئەم گوتارە......هتـد. (الشـهري:٢٠٠٤: ٣٨).

ئەم پێناسـەیە تیشک دەخـاتە سـەر ئەو ئەرکە زمانییـانەی کە نێرەر لە ڕێگـایەوە دەتوانێـت مەبەسـت و ئامانجەکـانی دەربڕێـت، کاتێـک پەیوەندییەکی دوولایەنە هەبێت لە نێوان سیستمی زمان و دەوروبەری بەکارهـاتوو، بەشـێوەیەک نێـرەر هەمـوو ئاسـتەکانی زمـان بەکاربێنێت فۆنۆلـۆجی، هێـز و ئـاوازە و سـینتاکس و پاشـان کـردە قسـەییەکانیش ئەنجام بدات.

لە ڕاستیدا چەمکی گوتار لەسەردەستی میشـێل فۆکۆ (١٩٨١) بە تەواوی دیاریکرا بە ڕای فۆکۆ تۆڕێکی ئاڵۆزی پەیوەندیی کۆمەلایەتی و سیاسی و کەلتوورییە کە قسەکردنی لێوە بەرهەمدێت. (یوسف: ؟ : ٦) گوتـار لەگەڵ خۆیـدا ئاڕاسـتە و بۆچـوون و بیرکـردنەوەی تـاک و کـۆ هەڵـدەگرێت، کە لە دەربڕینـی زارەکـی و نووسـیندا بەرجەسـتە دەبێت بگـرە لە ڕەوشـت و کردەکانیشـدا ڕەنـگ دەداتەوە بـۆ نمـوونە دەڵـێن گوتـاری سیاسـی کـوردی یـان گوتـاری فەلسـەفی لە سـەردەمێکدا یـان گوتاری ئەدەبی ..... هتد مەبەست لێی شتێکە کە لەو شتانەی دەیڵێن فراوانتـرە. ئەمە ئەو شـتەیە کە مـانگۆنۆ پێیـوایە بەوەی دەکرێـت وەک ڕەگەزێـک تەماشـای بکەیـن کە چەنـدین بەشـی بچـووکتر دادەپۆشـێت، بەشـە بچووکەکانیش لە چەندین دەقدا خۆیـان دەبیننەوە، واتـا هەمـوو دەقێـک دوو بونیـادی هەیە بونیـادێکی تـایبەتی لەگەڵ بونیـادێکی تـر کە لەگەڵ هاوڕەگەزەکـانی هاوبەشـە (برهونـة: ٢٠٠٧: ١٢٠) کەواتە گوتـار مادەیەکە شتەکانی لێوە دروست دەکرێت، دەزگایەکە پێشتر بیرۆکەکان دادەڕێژێت و لە دەقەکاندا ڕەنگ دەداتەوە.

گوتـــار چـــالاکی تـــاکە یەک لەدوای یەکەکـــانە لە دەوروبەرە دیاریکراوەکاندا، گوتار تەنها بابەتی زمانی ڕووت نییە بەڵکو بۆ بابەتە نازمانییەکانیش دەپەڕێتەوە، کۆمەڵە وشەیەکی ڕێزکراو نییە بە گوێرەی ڕێسـا و ڕێزمـانێکی تونـدوتۆڵ، ئەو پێویسـتی بەو پەیوەنـدییەیە کە لە

نێوان خودەکان دروستبووە، ئەو بوارە مەعریفیانە دەخاتە ڕوو کە لە ئاگایی تاکەکان بوونی هەیە، مەعریفەیەکیان پێ دەبەخشێت کە پێشتر ڕێکخراو و پلان بۆدانراو بووە. دەتوانین بڵێین لە هەموو کایە مەعریفییەکاندا لە سەردەمە جیاوازەکاندا کۆمەڵە کەسێک گوتاری تایبەت بە خۆیان هەیە کە خۆی لە هەندێ چەمک و بیرکردنەوەدا دەبینێتەوە و دەسەڵاتی هەیە بەسەر قسەکردن و نووسینی کەسەکانەوە.

**دووەم: یەکەکانی گوتار:**

هەر گوتارێک ئاڕاستەیەکی دیاریکراوی هەیە بۆ گەیاندنی ئامانج و مەبەستێک، لەسەر چەند بنەمایەک بەندە، بە کۆڵەگەی دروستبوونی دادەنرێت:

١- نێرەر: بەرهەمهێنەری گوتارە و بە سەنتەری کردەی گەیاندن دادەنرێت، ئەو خود سەنتەرە لە بەرهەمهێنانی گوتار، چونکە ئەو دەریدەبڕێت بۆ ئەوەی مەبەستەکانی بخاتە ڕوو، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە نێرەر پشت بە زمان دەبەستێت، گوتار بیرکردنەوەی نێرەر دەردەخات. ( مقبول: ٢٠١٤: ٦٠)

٢- وەرگر: کۆڵەگەی دووەمی گوتارە، نێرەر گوتارەکەی ئاڕاستەی ئەو دەکات. بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ، وەرگر دەکرێت تاک بێت یان کۆ، ڕازیکردنی وەرگر ئامانجی نێرەرە، زۆربەی کردەکانی لێکدانەوەی واتا دەکەونە لای وەرگر، بەم جۆرە وەرگر لێکدانەوە دەکات و بەدیهاتنی کردەی زمانی دەکەوێتە لای وەرگر. (کمال:٢٠٠٩: ١٢)

٣- دەوروبەر:(context) بریتییە لە هەر زانیارییەکی پێشینە کە مەزەندە دەکرێت هاوبەش بێت لە نێوان قسەکەر و گوێگردا کە یارمەتی گوێگر دەدات بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی قسەکەر لە هەر گوتنێکی دیاریکراودا. (معین: ٢٠٠٥: ٦٤) لە ڕاستیدا دانانی بنەما سەرەکییەکانی

تیۆری سیاقی (دەوروبەر) بۆ زانای ئەنترۆپۆلۆژی (مالینۆفسکی) دەگەڕێتەوە کورتەی بۆچوونی ئەم زانایە سەبارەت بە بابەتەکە ئەوەیە، کە واتای ڕستە لەو دەوروبەرە دیاریکراوەدا دەستنیشان دەکرێت، کە ڕستەکەی تێدا دەردەکەوێت، لێرەدا زیاتر مەبەستی لە ژینگەی سروشتی و واقعی ڕۆشنبیری ناو کۆمەڵگایە. (علی:٢٠١٤ :٤٤).

زمانی ئاسایی لە چوارچێوەی دەوروبەری ئاخاوتندا بەکاردێت بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەرکێکی یەکجار فراوان و هەمە جۆر لەناو کۆمەڵگادا، هەروەها فێرس ئاماژە بەوە دەکات کە هەر دەقێک بە پێکهێنەرێک لە پێکهێنەرەکانی دەوروبەری بارودۆخیش ئەو دەوروبەرەیە کە پرۆسەی تێگەیشتنی تێدا ئەنجام دەدرێت، کات و شوێنی ئاخاوتن پەیوەندیی نێوان ئاخێوەران و نەریتی هاوبەشی نێوانیان لەگەڵ ئەو قسانەی پێش ئاخاوتنەکە دەگرێتەوە .( هەمان سەرچاوە: ٢٠١٤: ٤٨).

دەوروبەر چەمکێکی فراوانە هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە کاریگەرییان لەسەر زمان هەیە لە ئێستا و ڕابردوو، لە هەر دەوروبەرێکدا بێت ئەوا جۆرە واتایەک دەدات. (دزەیی: ٢٠٠٩ :٢٤).

چەمکی سیاق لە پراگماتیکدا بە شێوەیەکی بەرچاو پەرەی سەندووە، ئێستا سیاق بریتییە لە هەموو ئەو بارودۆخانە کە پەیوەستن بە کردەی گەیاندنەوە، هەموو ئەو زانیارییە هاوبەشانە دەگرێتەوە کە لە نێوان (نێرەر) و (وەرگر)دا هەیە.

ڤان دایک پێیوایە چەمکی سیاق چەمکێکی دینامیکی و جووڵاوە بەپێی بارو دۆخی قسەکردن دەگۆڕێت و چەمکێکی دیاریکراو و چەق بەستوو نییە بەڵکو بەپێی ڕووداوەکان گۆڕانکاری بەسەرداديت، وشە و ڕستەکان واتایەکی دیاریکراویان نییە، واتاکان بەستراونەتەوە بە ژمارەی بەکارهێنانەکانی لە ژیانی ڕۆژانەدا لەگەڵ ئەو دەوروبەرەی کە تێیدا بەکار دێت. (ڤان دایک : ٢٠٠٠: ٢٥٨).

سیاق ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە تێگەیشتن لە گوتار و مەبەستەکانی قسەکەر، میشێل فۆکۆ پێیوایە (شوناسی دەستەواژەکان) لە ژێر ڕکێفی چەند مەرجێک و چەند سنوورێکی پراگماتیکیدایە کە کۆمەڵە دەربڕاوێکی تر بەسەریاندا سەپاندووە، جگە لەو مەیدانەی کە ئەو دەستەواژەیەی تێدا درکاوە لەگەڵ ئەو ڕۆڵانەی کە پێی سپێردراوە. (فۆکۆ : ٢٠٠٥: ٩٦) کەواتە بۆ تێگەیشتن لە گوتار و مەبەستەکانی گوتار پێویستە زانیاریمان دەربارەی سیاق و ژینگەی گوتارەکە هەبێت.

دۆمینیک مانگۆنۆ پێیوایە سیاق ئەگەرەکانی تەمومژیی گوتارمان بۆ کەم دەکاتەوە و وا لە وەرگرەکان دەکات واتا شاراوەکانی دەربڕاوەکان هەڵداتەوە و دەبێت وەرگر بە ئاگاو زیرەک بێت بۆ ئەوەی واتای ئاشکرای پشت گوتاری نێرەرەکە بدۆزێتەوە و واتاکانی پشت گوتارەکە بخوێنێتەوە. ( قسمیة: ٢٠١٢: ٤٤).

لێکۆڵەرە نوێ و کۆنەکان لەسەر گرنگیی سیاق بۆ گوتار ڕێککەوتوون، پێویستە گوتار بخرێتەوە سیاقەکەی ... لەبەر ئەوەی دەکرێت وەرگر گوتارێکی زۆر سادەی لە ڕووی زمانەوە لەبەرامبەر بێت، کەچی دەکرێت هەندێ شتی وەک (جێناو و ئاوەڵکار)ی وای تێدا بێت کە تەمومژی بۆ دروست کات، وەرگر نەتوانێت لێی تێبگات ئەگەر نەیخاتە سیاقی گوتنەکەیەوە، کەواتە سیاق ڕۆڵی کاریگەر دەگێڕێت لە پەیوەندیی کاری گوتار و بەیەکەوە بەستنی– گوتار بەبێ سیاق گوتارێکی واتا شاراوەیە و پەیوەندیی نێوان سیاق و گوتار پەیوەندییەکی تەواوکارییە.

**سێیەم: ستراتیژییەتی گوتار:**

ستراتیژییەت (الاستراتیجیة– strategy) هەموو هەوڵێک بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی گوتار پشت بە ستراتیژی گوتار دەبەستێت، چونکە ئەنجامی زنجیرەیەک کردەی هەڵبژێردراوە کە زیاتر لە زەیندا بڕیاری لەسەر دراوە، کە لە ڕێگای هەنگاو و هۆکارەکان دەگاتە ئامانجە گەیاندنییەکەی (هاینمان و فیهفنجر: ٢٠٠٤: ٢١٥)

کەواتە ستراتیژییەت بە شێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە پلاندانان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان و لێرەوە ئەم پلانە دوو ڕەهەندی هەیە:

یەکەم، ڕەهەندی پلاندانان لە ئاستی زەینی، دووەم، ڕەهەندی پلاندانان لە ئاستی ماددی کە ستراتیژییەتەکەی تێدا بەرجەستە دەبێت هەر دوو ڕەهەندەکە بۆ بکەرە سەرەکییەکە دەگەڕێتەوە و ئەو سیاقەکە شی دەکاتەوە و پلان بۆ بەدیهاتنی دادەڕێژێت، بۆ ئەوەی ئەو ئەگەرانە هەڵبژێرێت و ئەو شتەی کە دەیەوێت بە تەواوی بەدی بێت و گرەنتی بەدیهاتنی ئامانجەکانی بکات. (کریم: ؟: ٧) کەواتە ڕەهەندی پلاندانان سەرەکییە لەبەر ئەوەی پشت بە عەقڵ دەبەستێت دوای ئەویش ڕەهەندی ماددی دێت کە ڕەهەندی جێبەجێکردنی ستراتیژییەتەکەیە.

میشێل فۆکۆ پێیوایە ستراتیژییەت کارێکی زەینییە واتا ئامرازە بەکارهاتووەکان پشت بە بەکارهێنانی عەقڵ دەبەستن بۆیە هەڵبژاردنی ستراتیژییەت بە عەقڵانی بوون جیا دەکاتەوە . لە ستراتیژییەتی گوتاردا نێرەر هەندێ زاراوە و چەمکی گونجاو هەڵدەبژێرێت لەگەڵ دەوروبەرێکی گونجاو ئەو پێش درکاندنی گوتارەکە پلان بۆ چۆنییەتی دارشتنی دادەڕێژێت لەگەڵ چۆنییەتی گەیاندنی واتاکەی بە وەرگرەکە، نێرەر زۆر ئاگاداری ئەوەیە کە بەکارهێنانی زمانەکەی لەگەڵ دەوروبەرەکەی گونجاو بێت بۆ ئەمەش پێویستی بە توانستی زمانی و توانستی پراگماتیکی دەبێت.

بەم جۆرە ستراتیژییەتی گوتار هەمیشە پەیوەستە بە پێکهاتەی ئامانجەوە و بریتییە لە چالاککردنی سیستمێکی مەعریفی دیاریکراوی وەک نواندن- مۆدێلی عەقڵی، ئامادەکردنی بیروڕای تایبەت و سیماکانی ڕازیکردن و هەڵوێست و ئاگادارکردنەوە لە کۆتوبەندەکانی هەڵوێستی کردەی پەیوەندی کاری پلان بۆ داڕێژراو و بە شێوەیەکی تایبەتی ئاراستەکردنی بەردەوامی هەموو چالاکییەکی ئیدراکی، بەرەو ئەرکێک کە دەشێت چاوەڕوان بکرێت لە چوارچێوەی گوتاری پلان بۆ داڕێژراودا . (Vin Dij : 1983;44) .

ستراتیژییەتی گوتار بەڕێگایەکی گونجاو دادەنرێت بۆ ئەوەی نێرەر لە ڕێگایەوە گوتارەکەی بدرکێنێت ویستی خۆی بسەپێنێت و مەبەستەکانی بگەیەنێت لە ڕێگای میکانزم و کەرەستە زمانییەکانەوە لەگەڵ ڕەچاوکردنی دەوروبەردا .

**چوارەم: گوتار و دەق:**

جیاکردنەوەی گوتار و دەق کێشەیەکی زۆری ناوەتەوە، بە هۆی ئەو ڕا جیاوازانەی کە لەسەری دروست بووە، تەنانەت هەندێ کەس بە هاوواتای یەکتری دادەنێت، کەچی زۆریشیان پێیانوایە جیاوازن، ئەوانەی جەخت لەسەر جیاوازیی نێوانیان دەکەنەوە پێیانوایە دەق ڕووی نووسراوی گوتارە (پۆل ڕیکۆر) پێیوایە (دەق) گوتارێکی تۆمار کراوە پەیوەندیی نێوان دەق و گوتار نووسینە (فَضل:١٩٦١ :٣٠٤) بەڵام لێرەدا پرسیارێک دروست دەبێت چی تۆمارکراوە شتە ماددییەکانە یان زەینییەکانە؟

ئەم جیاکردنەوەیە زۆر ڕوون نەبۆتەوە چەمکی (گوتار) و (دەق) واتایەکی فراوانتر لە خۆ دەگرێت هەموو ئەو یەکە زمانییە دەگرێتەوە کە ئەرکێکی گەیاندنی دیاریکراوی هەیە جا ئەو یەکانە گوتراو بن یان نووسراو هەندێ لێکۆڵەر دەڵێن (گوتاری گوتراو نووسراو) و هەندێکی تریش دەڵێن (دەقی گوتراو و نووسراو). (الفقی: ٢٠٠٠ : ٣٥)

پێداگری لەسەر ئەوەی کە دەق دەبێت بۆ مەبەست و ئەرکەکانی بگێڕدرێتەوە وامان لێدەکات جیاکردنەوەیان بێ هوودە بێت، هەرچۆنێک بێت دەبێت بزانین کە ئەوانەی لێکیان جیا دەکەنەوە پێیان وایە کە:

١- بونیادەکانی دەق بەیەکەوە بەستراون بەجۆرێک یان بە ڕەنگێک کە وەک یەکەیەکی واتایی بن، کەچی گوتار لە دەق فراوانترە ئەو بارودۆخانەش دەگرێتەوە کە گوتارەکەی تێدا بەرهەم هاتووە.

٢- گوتار زۆرجار بە درێژی جیا دەکرێتەوە لەبەر ئەوەی گوتار لە جەوهەریدا گفتوگۆیەکە یان بیرو ڕایەکە کەچی دەق ڕەنگە کورت بێت

وەک (بێـدەنگی) و دەکرێـت زۆر درێژبێـت وەک چـامەکەی (نـالی) و (سالم)، زۆر جار لە گوتاردا دەبێت بە تەواوی بۆچوونەکانی تێدا ڕوون بێتەوە.

شـیکردنەوەی گوتـار سـنووری شـیکردنەوەی دەق دەبەزێنێـت، شیکردنەوەی دەق بریتییە لە شیکردنەوەی ناوەوە و لە چوارچێوەکەی تێپەڕناکـات، بەڵام شـیکرنەوەی گوتـار ئەو بـارودۆخە بـاس دەکـات، کە دەقەکەی تێدا ئەنجامدراوە، بەواتـایەکی تر شیکردنەوەی دەوروبەر کە تێیـدا بنەمـایەکی سـەرەکی شـیکردنەوەی گوتـارە. ( مشـیر: ٢٠١٤ :٨١) دیبۆگراند پێیوایە گوتار کۆمەڵێک دەقە کە پەیوەندییەکی هاوبەش کۆیان دەکـاتەوە. کریسـتاڵ پێیـوایە گوتـار بەرهەمێکـی زمـانی زارەکیـیە و لە بـــارودۆخێکی دیـــار هـــاتۆتە ئـــاراوە، کە دەوروبەر دەگـــرێتەوە، دەق بەرهەمێکی زمانی تۆمارکراوە لە ڕێی نووسین لێرەشدا دەق و گوتـار یەکـدەگرنەوە و دەقـیش بەهەمـان شـێوە زارەکـی دەگـرێتەوە. (هەمـان سەرچاوە:٨٠)

لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە ئەگەر دەق و گوتـار جیـاوازیش بـن واتـــای ئەوە نیـــیە ناکرێـــت بەیەکەوە کـــۆ بکـــرێنەوە لەبەر ئەوەی بـــۆ شیکردنەوەی هەر دەقێک دەبێت بیبەستینەوە بەو گوتارەی کە لە پشت بەرهەمهێنـانی دەقەکەوەیە لەبەرئەوەی لە بـارودۆخ و تـۆڕێکی ئـاڵۆزی پەیوەنـدیی کـۆمەڵایەتی و سیاســی و کەلتــوورییە و دەقەکەی لێــوە بەرهەمــدێت، دەکرێــت بڵێــین گوتـــار لە دەق فراوانتـــرە لەبەر ئەوەی کەسـێک کە دەقێـک دەنووسـێت پێشـتر گوتـارێکی هەیە کە ئاڕاسـتەی دەقەکەی دیـاری دەکـات، دەکرێت ئامـانج و مەبەسـتەکانی گوتـارەکە لە تەواوی دەقەکەدا شـاراوە بێـت و جـار جـار خـۆی دەرخـات و هەنـدێ جاریش تا کۆتایی دەقەکە ئاشکرا نەبێت.

**پێنجەم: گوتار و دەقی شیعری:**

ڕەنـگە بپرسـین ئایـا دەکرێـت مەبەسـتەکانی پشـت گوتـار لە دەقـی شیعریدا بەرجەسـتە بێـت؟ دەکرێت مەبەسـت و ئامانجەکـانی شـاعیر لە

دەقێکی شیعریدا دیاری بکەین ؟ ئایا  پێویستە شیعر بگەڕێنینەوە بۆ دەوروبەرەکەی بۆ ئەوەی واتاکەی دەرکەوێت؟ یان تەنها پێویستیمان بە شیکردنەوەی ناوەوەی دەقە شیعرییەکەیە؟

دەکرێت نێرەر گوتارەکەی دەقی شیعری بێت، ئەو هەر بە گوتار دادەنرێت ئەگەر سیماکانی گوتاری تێدا بەدی بکرێت وەکو هەر گوتارێکی تر، دەشێت بەشێک بێت لە گوتارێکی گشتگیرتر و بیرو بۆچوونێکی گشتی شاعیر یان گوتاری گشتی سەردەمێکی شاعیر لەو شیعرەدا دەرکەوێت. لەبەر  ئەوەی ئامانجەکە دیارە ئەویش ڕازیکردنی نێرەرە بە گوتارەکەی بۆیە نێرەر تەنها لەسەر دەقی پەخشان ناوەستێت، بەڵکو نێرەر دەتوانێت گوتارەکەی لە ڕێگای شیعرەوە بخاتە ڕوو. (شامة : ٢٠٠٩: ١٢)

لە شیکردنەوەی دەقی شیعریدا  دەبینین کە گوتارێک هەیە لە پشت بەرهەمهێنانی شیعرەکەوەیە لەبەرئەوەی  دەقە شیعرییەکە لە بارودۆخێکدا بەرهەمدێت کاریگەری بەسەر دەقە شیعرییەکەوە بەجێ دەهێڵێت ، دەکرێت بڵێین گوتار لە دەقی شیعری فراوانترە لەبەر ئەوەی کەسێک کە دەقێکی شیعری دەنووسێت پێشتر گوتارێکی هەیە کە ئاڕاستەی دەقە شیعرییەکەی دیاری دەکات، دەکرێت ئامانج و مەبەستەکانی گوتارەکە لە تەواوی دەقە شیعرییەکەدا پەنهان بێت و لە ڕێگای بەستنەوەی بە دەوروبەرەکەی واتا جیاوازەکانی ئاشکرا بێت.

**تەوەری دووەم:**

**جۆرەکانی ستراتیژییەتی گوتار لە دوو چامەکەی (نالی) و (سالم)دا:**

دوو چامەکەی (نالی) و (سالم) دوو قەسیدەی سەر بە شیعری کلاسیکی کوردین، بەڵام دەکرێت گوتاری پشت دروستبوونی ئەم دوو شیعرە دیاری بکەین یان ئەو مەبەستانە دیاری بکەین کە هەر دوو شاعیر ویستوویانە لە ڕێگای ئەم شیعرانە بیخەنە ڕوو، ڕەنگە بتوانرێت لە ڕێگای ئەم دوو چامەیەوە  بەشێکی گرنگی  گوتاری کوردی ئەو

سەردەمە بخرێتە ڕوو، ئەوەی لێرەدا دەخرێتە ڕوو ئەو ستراتیژییەتانەیە کە هەردوو شاعیر گرتوویانەتە بەر بۆ ئەوەی مەبەستەکەیان بپێکن. لەبەر ئەوەی لە کۆتاییدا نێرەر دەیەوێت مەبەستی خۆی بە وەرگرەکە بگەیەنێت دەمانەوێت باسی ئەو میکانزم و ئامرازانە بکەین کە بەکاریان هێناوە بۆ ئەوەی گوتارەکەیان بگەیەنن، بێگومان لە ڕێگای ئەو ستراتیژییەتانەوە دەبێت کە پێشتر پلانی بۆ دانراوە. هەردوو شاعیر لە دەقەکەیاندا هەوڵیان داوە دەستەواژە و وشەی گونجاو هەڵبژێرن لەگەڵ دەوروبەری گونجاودا بۆ ئەوەی گوتارەکەیان بخەنە ڕوو. شاعیران بەر لە درکاندنی گوتارەکەیان پلان بۆ بەرهەمهاتنی دادەڕێژن بۆ ئەوەی واتاکەی بە وەرگر بگەیەنن، نێرەر زۆر بە ئاگاییەوە زمان و دەوروبەر بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی ئەم کردانەش ئەنجام بدات پێویستی بە توانستی زمانی و توانستی پراگماتیکی هەیە (قسمية: ٢٠١٢: ٧١).

جۆرەکانی ستراتیژییەتی گوتار لە لێکۆڵینەوە پراگماتیکییەکان بەپێی دوو پێوەر پۆلێن کراوە: (مقبول:٢٠١٤ : ٥٤٣).

١- پێوەری کۆمەڵایەتی : کە ستراتیژییەتی هاو سۆزی و ئاراستەکردن دەگرێتەوە.

٢- پێوەری ئامانجی گوتار: کە ستراتیژییەتی ڕازیکردن دەگرێتەوە.

لێرەدا هەوڵ دەدەین  ئەم ستراتیژییەتانەی گوتار لە دوو چامەکەی (نالی) و(سالم) دا دیاری بکەین:

**یەکەم: ستراتیژییەتی هاوسۆزی:**

لە لێکۆڵینەوە پراگماتیکییەکاندا (التضامن) بەم شێوەیە پێناسە دەکرێت : ئەو ستراتیژییەتەیەی  کە نێرەرە هەوڵ دەدات پەیوەندی بە وەرگر و جۆری پەیوەندییەکە بەرجەستە بکات، پەرەی پێ بدات بۆ ئەوەی جیاوازی لە نێوانیان کەم بکاتەوە بە شێوەیەک لە پێویستییەکانی وەرگرەکان (Audiences needs) تێبگات، بە شێوەیەکی گستی هەوڵدانە بۆ

خـۆ نزیکخســتنەوە لە وەرگـر. ( مقبـول: ٢٠١٤ :٥٤٣) هەروەکـو لـیچ ئامـــاژەی بـــۆ ئەم بـــارە کـــردووە کە ((لە هەمـــوو پەیوەنـــدییە کۆمەڵایەتییەکانـدا بـۆ هێنانەکـایەی بـارێکی دەروونیـی هاوســەنگ و پەیوەندییەکی هاوڕێیانە لە نێوان بەشداربووانی ناو پەیوەندییەکاندایە)) و ویستی مرۆڤە بۆ دروستکردنی پەیوەندی و ڕێگە گرتن لە ڕوودانی ململانێ لە ناو پەیوەندییەکاندا. ( عبدالواحد: ٢٠١٣ : ٤٩)

زۆر جار ستراتیژییەتی هاوسۆزی لەگەڵ ستراتیژییەتی ڕێزگرتن تـێکەڵ دەکرێـت، بەڵام دوای لـێ وردبـوونەوە دەردەکەوێـت ئەمـانە جیـاوازن، لە ڕێزگرتنـدا هاوسـۆزی هەیە، بەڵام کەمتـرە لەبەر ئەوەی زیـاتر پارێزگـاری لە پەیوەنـدییەکە دەکـات و زۆر پابەنـدە بە مافەکـانی وەرگرەوە و ستراتیژیەتێکە وا ناکات توینێتی نێرەر بۆ دروستبوونی هاوسـۆزی لەگەڵ وەرگـر بشـکێنێت بەو شـێوەیەی کە مەبەسـتێتی. لە ستراتیژییەتی هاوسۆزیدا نێرەر بە لۆژیکی ئاراستەکردن و گەیاندنی ستوونی قسە ناکات بەڵکو مەبەستی خۆ نزیکخستنەوەیە لێی بەڕێزەوە. (linde:1988:380)

**ئامانجەکانی ستراتیژییەتی هاوسۆزی:**

هەروەک پیشـتر ئامـاژەی پێـدرا لە پشـت هەر سـتراتیژییەتێکەوە ئامانجی دیاریکراو هەیە لە هاوسۆزیشدا، جۆرێک لە پەیوەندی دروست دەبێت کە دەشێ بریتی بێت لە دابەزاندنی هێزی زاڵبوون بۆ نزمترین ئاست و بەم جۆرە پۆلێن دەکرێت: ( مقبول : ٢٠١٤ : ٥٤٣-٥٤٤)

١- دروستکردنی پەیوەندییەکی دۆستانە لە نێوان هەردوو لایەنی گوتار.

٢- جوانکردنی وێنەی نێرەر بەرامبەر وەرگر.

٣- وەگەڕخستنی هاوسۆزی لە نێوان نێرەر و وەرگر

٤- کەمکردنەوەی دەسەڵاتی نێرەر.

٥- بەدەستهێنانی خۆشەویستی و سۆزی بەرامبەر.

٦- نێـرەر ئامـادەیە خزمەتـی وەرگـر بکـات بـۆ ئەوەی پـلەی هاوڕێیەتییەکەیان زیاتر بکات.

ئەمەش وا دەکـات نێـرەر لە دەسـەڵاتەکانی کەم بکـاتەوە و خـۆی نزیک خاتەوە لە پلەی وەرگرەکە.

کەرەستە و میکانزمە زمانییەکانی ستراتیژییەتی هاوسۆزی :

**١- کەرەستە زمانییەکان**:

**أ- ناوی کەس و نازناو و خزمایەتی:**

نێـرەر لە کـاتی بـانگکردن یـان گفتوگـۆکردن لەگەڵ وەرگـردا بەکاری دەهێنێت، ئەگەر نێرەر لە پلەدا لە وەرگر نزمتر یان بەرزتر یان هـاوپلە بێـت، ئەوا بـۆ بەدیهێنـانی سـتراتیژییەتی هاوسـۆزی لەگەڵ وەرگردا بەکاری دەهێنێت. ( الشهري:٢٠٠٤: ٢٧٤)

(سالم) دوو جار ناوی (نالی) دەهێنێت:

بۆموڵکی شامە نامەیی من، سویی((نالی))یە
هەر حەرفی ئەو لەوەصفی ویلایەت دەدا خەبەر

(دیوانی سالم/٦٦)

ڕاسـتەوخۆ ناوهێنـانی وەرگـر بە نـاوی خـۆی هێمـایە بـۆ ئەوەی بیسەلمێنێت بۆ وەرگر لێیەوە نزیکە و لەیەک پلەدان و هـاوڕێی یەکتـرن. نـاوی یەکەمـی کەسـەکە، تەنیـا لەگەڵ هـاوڕێ نزیکەکانـدا بەکاردێـت. (عبدالواحد:٢٠١٣ :٢٣٥)

لە بەیتێکی تردا دەڵێت:

تو خودا بڵێ بەحەزرەتی (نالی) دەخیلی بم
بەم نەوعە قەط نەکا بەسولەیمانیا گوزەر

(دیوانی سالم/٦٧)

نـاوی پـایەبەرزکردنەوە بـۆ کەسـانێک بەکاردێـت کە لەخۆیـان بەگەورەتر بزانن، بۆ ئەوەی زیاتر هاوسۆزی دروستبکات.

بەڵام ئەوەی لەم دەقە شیعرییەدا تێبینی دەکەی ئەوەیە کە نالی لە چامەکەیدا ناوی سالم ناهێنێ و ئەمەش ئەوە دەردەخات کە هاوسۆزی سالم زۆر بەهێزترە.

**ب- نیشانکارەکان:**

نیشانکارەکان لەسنووری بۆچوونی ئاماژە کاردەکەن، ئەو کەرەستانە دەگرنەوە کە زمان و دەوروبەر بەیەکەوە دەبەستنەوە . کەس و کات و شوێن و پلەوپایە هاوبەشەکان دەستنیشان دەکەن. (دزەیی: ٢٠١١ :٩٥) بەکارهێنانی نیشانکارەکان لە ستراتیژییەتی هاوسۆزیدا سوودی زۆرە، دروستکردنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و بەشداریکردن لە پەرەپێدانی پەیوەندییەکان، نیشانەیە بۆ بوونی ئینتما لە نێوان گرووپێ یان کەسانێکی دیاریکراوا (الشهري:٢٠٠٤: ٢٨٧)

**١- نیشانە کەسییەکان:**

جێناوەکان : تەنها بۆ گەڕاندنەوە بەکارنایەت بەڵکو مەبەستی پراگماتیکیشی لێوە بەدی دێت بۆ نموونە (تۆ) هێمایە بۆ هاوکاری کاتێک (تۆ) (ت) (یت) بەکاردێت واتای ئەوەیە بەشداربووانی گوتار لە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتیی تۆکمەدان و پەیوەندیی بەردەوام لە نێوانیان هەیە.

کەسێک کە هاوشانی یان یەکسانی دوێنەر بێت، ئەوا جێناوی کەسی (تۆ) بەکار دەهێنێت. (محمد فرج:٢٠٠٠ :١٤٠ )

بۆ نموونە (سالم) بە (نالی) دەڵێت:

ئەو حەوضە پڕ دەبوو کە وەکو چاوەکانی تۆ
تەغییرە ئاوی وەک دڵی مەردانی پڕ کەدەر

(دیوانی سالم/ ٦٦)

**٢- نیشانەکانی شوێن:**

مەبەست لەو شوێنانەیە چۆنییەتی کارکردنییەتی وەک نیشانەیەکی پراگماتیکی، لە لایەن قسەکەرەوە و گەیاندنی واتای

ویستراو لێی بەهۆی دەوروبەرەوە، واتا زۆرجار واتای شوێنەکە بەپێی چوارچێوەی بارەکەی و ڕۆشنبیری و ژینگە و جوگرافیا ....هتد دەگات. (هۆگر محمد فرج : ٢٠٠٥: ٧٤)

(نالی) و (سالم) لە چامەکەیاندا ناوی چەندین شوێن دەهێنن کە نیشانەن بۆ شاری سلێمانی لە هەمانکاتدا هۆکارێکە بۆ دروستکردنی ستراتیژییەتێک کە هاوسۆزی دروست کات لە نێوانیان، لەبەر ئەوەی جۆرە هاوبەشییەک هەیە لە نێوانیان لە ناسینی ئەو شوێنانە و سۆزیان بۆیان هەیە.

شارەزوور، شیوە سوور، سەرچنار، بەکرەجۆ، سەرشەقام ، خانەقا....هتد

**٢-میکانزمەکانی ستراتیژییەتی هاوسۆزی :**

زۆر جار نێرەر بە ناڕاستەوخۆ لەڕێگای هەندێ میکانزم و شێوازەوە مەبەستەکانی خۆی دەپێکێت، دەکرێت لەم میکانزمانەی خوارەوە ستراتیژییاتی هاوسۆزی بەدی بکەین:

**أ- دەرخستن:**

قسەکردن بە ڕاستگۆیی لەگەڵ وەرگر هێمایە بۆ هاوسۆزی و متمانەبوون، جا بە ڕاستەوخۆ بێت یان بە شاراوەیی .

دەبینین (سالم) ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بارودۆخی ئەوکاتە بۆ (نالی) باس دەکات ئەمەش نیشانەی هاوسۆزی و هاوشانییەتی لەگەڵی:

لەوسایەوە کە حاکیمی بەبە گشت بەدەرکران
نەیدیتوە کەس لە چیهرەیی کەس جوهری هونەر (ناڕاستەوخۆ)

(دیوانی سالم/٦٦)

جێی تورکەکانی ڕۆمە دەور و ژووری خانەقا (ڕاستەوخۆ)

(دیوانی سالم/٦٦)

ئێستە لە دەنگ و ڕەنگی ڕۆمی پڕە لە کەر
تا دوزدی وەقتی نیمەشەبن تورکی بێ نیظام
دوزدەن هەموو لە خەرمەنی مونعیم وەکو شەرەر

(دیوانی سالم/ ٦٦)

ب- **ناوهێنانی خود**:

نموونەیە بۆ میکانزمی هاوسۆزی بە شێوەیەک باسی خۆی دەکات وەک ئەوەی باسی کەسێکی تر بکات، ناوی خۆی دەهێنێت لەبری ئەوەی جێناوی کەسی یەکەمی تاک (من) (م) بەکار بهێنێت ، نیشانەیە بۆ خۆ بە کەم زانین.

ئەم شێوازە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا زۆر دووبارە دەبێتەوە:

حاڵی بکە بە خوفییە: کە ئەی یاری سەنگ دڵ

(نالی) لە شەوقی تۆیە دەنێرێت سەلامی دوور

(دیوانی نالی/١٩٧)

(سالم) سیفەت لە بێکەسییا با نەبێ هیلاک

من کردم ئەو نەکات لە غەما خوێنی خۆی هەدەر

(دیوانی سالم/٦٧)

ت- **باسکردنی تایبەتییەکانی وەرگر**:

دەکرێت نێرەر باسی هەندێ تایبەتمەندیی وەرگر بکات کە دەیسەلمێنێت لێیەوە نزیکە و هاوشانە لەگەڵی و دەبێتە هۆکارێک بۆ دروستکردنی ستراتیژییەتی هاوسۆزی، (سالم) باسی حوجرەکەی (نالی) دەکات کە تایبەتە بە خۆی و ئەمە نیشانەیە بۆ هاوسۆزی لەگەڵی :

دڵ نایەڵی بڵێم چییە سامانی حوجرەکەت

هەر تاری عەنکەبووتە حیجابی بیرۆن و دەر

(دیوانی سالم/ ٦٧)

ج- **ئاخاوتنی ناڕاستەوخۆ**:

ڕێگایەکە بۆ دەربڕینی ڕێز بۆ بەرامبەر بریتییە لە بەکارهێنانی شێوازی ئاخاوتنی ناڕاستەوخۆ کە تێیدا ڕێژەی نیشاندانی ڕێز لەو ڕستەیە یان دەربڕینە زمانییانەدا پتر دەکات، (حمە رشید :٢٠١٣: ١٣٣) و ئەمەش هەندێجار لەبەر گرنگی و هەستیاریی بابەتەکە ناڕاستەوخۆ دەردەبڕدرێت.

لەم بەیتەدا (سالم) بە ناڕاستەوخۆیی بە (**نالی**) دەڵێت مەیەوە بۆ سلێمانی:

توخودا بڵێ بە حەضرەتی (نالی) دەخیلی بم
بەم نەوعە قەط نەکا بە سولەیمانیا گوزەر

(دیوانی سالم/ ٦٧)

**دووەم: ستراتیژییەتی ئاڕاستەکردن**

پێشووتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە نێرەر لە کاتی پێکهێنانی گوتارەکەیدا پێڕەوی هەموو هاوسۆزییەک دەکات لەگەڵ وەرگرەکەیدا یان هەوڵ دەدات دروستی بکات، بەڵام هەندێ جار بەبێ ئاگایی ئەم بارە پشتگوێ دەخات یان ناچار دەبێت پشت بە ستراتیژییەتێکی تر ببەستێت بۆ هاتنە دیی گوتارەکەی، ئەو ستراتیژییەتەش ستراتیژییەتی ئاڕاستەکردنە، لەبەر ئەوەی هەندێ سیاق هەیە پێویست دەکات نەرمی نەنوێنرێت، بۆیە لایەنی ڕێز و هاوسۆزی بەبێ ئاگایی یان بە ئەنقەست پشتگوێ دەخرێت. شارەزایان وەرگری ئەم جۆرە ستراتیژییەتە دەکەنە دوو بەشەوە وەرگری گریمانە بۆکراو، گوتار بۆ ئەم جۆرە وەرگرە گشتی و بەردەوامە بۆ هەموو کاتێک دەبێت، هەرچی جۆری دووەمە وەرگری ئامادەیە نێرەر لە کاتی درکاندنی گوتارەکەی و ئاڕاستەکردنەکەدا ڕووی لەئەوە .( قسمية:٢٠١٢ :٨٠).

توێژەران ئاڕاستەکردن تەنها بە کردەیەکی زمانی دانانێن، بەڵکو بە یەکێک لە ئەرکە بنچینەییەکانی زمانی دادەنێن. (هالیدای) پێیوایە زمان دەربڕی ڕەفتارەکانی نێرەرە لە هەمان کاتدا دەربڕی ئەو کاریگەرییانەی کە نێرەر لەسەر ئاڕاستەکردنی ڕەفتارەکانی وەرگر دەیکات هەروەها جاکوبسن ئەرکی ئاڕاستەکردن بە ئەرکی فەرماندان و بانگکردن ناو دەبات، (ڕۆبۆل)یش دەڵێت (دەکرێت ئێمە قسە بکەین و وا بکەین لە کەسی بەرامبەرمان لە حاڵەتی ئامۆژگاریکردن یان فەرماندان یان تکاکردن......هتددا بێت). نێرەر دەیەوێت وەرگر ئەم مەبەستانە جێبەجێ بکات، هەر ئەم ئەرکانەیە وا دەکات نێرەر بتوانێت گوتارێکی ئاڕاستەدار بەرهەم بێنێت (الشهري:٢٠٠٤: ٣٢٤)

کردەی ئاراستەکردن پشت بە سیستمێکی زمانی دەبەستێت بۆ ئەوەی بێتەدی، کەچی ئەم کردەیە تەنها بەم سیستمە نایەتە دی، بەڵکو پێویستی بە چەند یەکەیەکی تر هەیە بۆ ئەوەی کردەی ئاراستەکردن هێزی بەدیهاتنی لێ وەرگرێت و لە هەموویان گرنگتر دەسەلاتە. لە ڕاستیدا ستراتیژییەتی ئاراستەکردن لە دەسەلاتی نێرەرەوە سەرچاوە دەگرێت، جۆری دەسەلاتەکەش جۆراوجۆرە و هۆکاریشە بۆ سەرکەوتنی ستراتیژییەتەکە، ڕەنگە جۆرێکی ئاراستەکردن سەر نەگرێت نێرەر پەنا بۆ یەکێکی تر ببات. (هەمان سەرچاوە:٣٢٥).

**ئامانجەکانی ستراتیژییەتی ئاراستەکردن:**

لەم جۆرە ستراتیژییەتەدا هەندێ ئامانج هەیە پەیوەستن بە ویستی نێرەرەوە کە زیاتر پێیوایە حەقیقەت و مەعریفە و پێگە و دەسەلاتی زیاتری لایە و دەیەوێت بیسەپێنێت بەم جۆرە کورت دەکرێتەوە: (مقبول ٢٠١٤ :٣٦).

١- جیاوازی لە پلەدا جا پلەکە مەعریفی یان کۆمەلایەتی .....هتد بێت.

٢- حەزکردنی نێرەر لە دەسەلاتخوازی و بەرزێتی.

٣- سووربوونی نێرەر لەسەر جێبەجێکردنی گوتارەکەی.

**کەرەستە و میکانزمە زمانییەکانی ئاراستەکردن:**

لەم جۆرە ستراتیژییەتەدا کەرەستەی زمانی و میکانزمەکانی ئاراستەکرن تێکەڵ دەبێت بەشێوەیەک لەناو کەرەستە زمانییەکاندا میکانزمەکانیش دەردەکەون:

**أ- فەرماندان:**

فەرماندان بە یەکێ لە کردەکانی ئاراستەکردن دادەنرێت بەپێی تیۆری کردە قسەییەکان کە ئۆستین دایڕشتووە. ( شامة:٢٠٠٩ :٥٥). بەپێی کردەی واتای نافۆرمی دەکرێ لە زمانی کوردیدا ڕستەی فەرمانی بە جۆرەکانییەوە پۆلێن بکرێن کە (داواکردن، داخوازیکردن،

تکاکردن، دوعاکردن، دوعا لێکردن، ئیزنخواستن.....) بە ڕستەی فەرمانی دادەنێن، چونکە ئەو هۆکارانەی کە قسەکەر پەیوەست دەکات لەکاتی قسەکردندا وەک(دەسەڵات و ڕێزگرتن) وا دەکەن ئەم جۆرە کردانە بگەیەنن ، هەروەها لە جێبەجێکردنی ئەم کردانە زۆرێک لە فۆرمی ڕێزمانی ڕستەکانی (داواکردن، داخوازیکردن، تکاکردن، دوعاکردن، دوعا لێکردن،) حوکمیان دەکەن، هەرچەندە هەندێکیان لە شێوەی کردەی قسەیی ناڕاستەوخۆشدا دەردەکەون. (محمود:٢٠٠٩: ٥٩)، کەواتە فەرماندان بە زۆر ڕێگا بەدی دێت بەڵام مەرجی دەسەڵات و پلەی نێرەر بە مەرجی سەرەکی بەدیهاتنی ئاڕاستەکردنە بە فەرماندان.

لە زمانی کوردیدا ڕستەی فەرماندانی ڕاستەوخۆ بە هۆی کاری فەرماندانەوە بەدی دێت، (نالی) ڕاستەوخۆ فەرمان دەکات:

وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار
وەک ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی (شیوەسوور)

(دیوانی نالی/ ١٧٨)

بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کودوراتی سەرزەمین
شادبن بە وەصلی یەکدی، کە تۆی طاهیر، ئەو طەهوور.

(دیوانی نالی/ ١٧٨)

ئەمجا مەوەستە تا دەگەیە عەینی سەرچنار
ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوور

(دیوانی نالی/ ١٧٨)

سەیرێ بکە لە بەرد و لە داری مەحەلەکان
دەورێ بدە بە پرسش و تەفتیش و خوار و ژوور

(دیوانی نالی/ ١٨٤)

سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو خانەقا بکە
ئایا ڕەبیعی ئاهووە یا چایری ستوور

(دیوانی نالی/ ١٨٨)

مەیلیَ بکە لە سەبزە درەختانی مەدرەسە
ئەوراقیان موقەدیمەیی شینە یانە سوور

(دیوانی نالی/ ١٩١)

چاویَ بخە لە سەبزەو و سێرابی دائیرە
جێی جیلوەگاهی چاوەکەمە نەرمە یانە زوور

(دیوانی نالی/ ١٩٣)

واصیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم
چی ماوە، چی نەماوە، لە هەیوان و تاق و ژوور

(دیوای نالی/ ١٩٥)

حاڵی بکە بە خوفیە کە ئەی یاری سەنگ دڵ
(نالی) لە شەوقی تۆیە دەنێرێت سەلامی دوور

(دیوانی نالی/ ١٩٧)

(سالم) لە وەڵامەکەیدا تەنها لە دوو بەیت فەرمانی ڕاستەوخۆی داوە:

هیممەت بکە چاپوکانە بە ئیجرایی مەتلەبم
لەم سەر بڕۆ وەکو بەرید و لەویَ بێت وەکو تەتەر

(دیوانی سالم/٦٦)

توخوا بڵێ بە حەضرەتی (نالی) دەخیلی بم
بەم نەوعە قەط نەکا بە سولەیمانیا عبوور

(دیوانی سالم/ ٦٧)

هەرچەندە لەم بەیتەدا لە سەرەتا دەستەواژەیەکی بەکار هێناوە فەرمانەکەی بێ هێز کردووە (توخوا) دەستەواژەیەکە هێزی فەرماندانەکە کەم دەکاتەوە.

**ب- داخوازی:**

کەسی یەکەم قسەکەر یان نووسەر چ تاک بێت یان کۆ داوا لە هەر یەکێک بیەویَ، لەهەر شەش کەسەکە (تەنانەت خۆشی) دەکات، کە کارێکی بۆ جێبەجێ بکات لە کاتی داهاتوودا. (ڕەسول: ٢٠١٤: ٥٢)

کاتێک نێرەر پەنا دەباتە بەر ئەم جۆرە میکانزمە دەیەوێت لە داهاتوودا شتێکی بۆ جێبەجێ بکرێت، دەشێت کەسەکە بیەوێت فەرمانێک بکات، بەڵام بە ناڕاستەوخۆیی فەرمانەکەی دەرکات لەبەر پێگەکەی و هەندێ جاریش لەبەر ڕێزی بۆ بەرامبەرەکەی.

(نالی ) دەڵێت:

ئایا مەقامی ڕوخسەتە لەم بەینە بێمەوە
یان مەصلەحەت تەوەقوفە تا یەومی نەفخی صوور

(دیوانی نالی/١٩٧)

(سالم)یش دەڵێت:

توخوا بڵێ بە حەضرەتی ((نالی)) دەخیلی بم
بەم نەوعە قەط نەکا بە سولەیمانییا عبوور

(دیوانی سالم/ ٦٧)

(سالم) سیفەت لە بێ کەسیا با نەبێت هیلاک
من کردم ئەو نەکا لە غەما خوێنی خۆی هەدەر

(دیوانی سالم/٦٧)

ئەم موڵکە نەضمی نابێ بە بێ عدلی واریثی
بێ ئەو بە قەصدی ئەم طەرەفە با نەکا سەفەر

(دیوانی سالم/٦٧)

(سالم) داخوازی زیاتر بەکارهێناوە بۆ ئاڕاستەکردنەکە کەچی (نالی) زیاتر فەرمانی داوە، هەروەک دەردەکەوێت نالی لە چامەکەیدا هێزێکی زیاتری لە دەستە و ویستوویەتی دەسەڵاتی بەسەر گوتارەکەوە هەبێت.

ج- **بانگکردن** :

بە یەکێک لە میکانیزمەکانی ئاڕاستەکردن دادەنرێت لەبەر ئەوەی وا لە وەرگر دەکرێت کە کاردانەوەیەکی بەرامبەر نێرەر هەبێت.

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مرور
وەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور

(دیوانی نالی/ ١٧٤)

ئەی لوتفەکەت خەفییو هەوا خواه و هەمدەمە
وەی سروەکەت بەشارەتی سەر گۆشەی حوضور

(دیوانی نالی/١٧٥)

ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان
طوفانی دیدەو و شەرەرەی قەلبی وەک تەنوور

(دیوانی نالی / ١٧٦)

(سالم)یش دەڵێت:
جانم فیدای سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر
ئەی پەیکی شارەزا لە هەموو ڕاهی پڕ خەتەر

(دیوانی سالم/ ٦٦)

ئەی میروەحەی جەمالی مەهاسای دولبەران
وەی شانەزەن بە کاکۆڵی تورکانی سەردەم سیم بەر

(دیوانی سالم/ ٦٦)

**ت- پرسیارکردن** :

بە یەکێک لە میکانزمەکانی ئاڕاستەکردن دادەنرێت، لەبەر ئەوەی وەرگر بە شێوەیەک ئاڕاستە دەکات کە تەنها ڕێگایەکی لە بەردەم بمێنێتەوە ئەویش وەڵامدانەوەیەتی، بەم شێوەیە نێرەر دەسەڵاتی بەسەر بیرکردنەوەی وەرگردا دەبێت و گوتارەکە بە خواستی نێرەر ئاڕاستە وەردەگرێت، بە تایبەتی پرسیاری داخراو بە یەکێک لە میکانزمە گرنگەکانی ستراتیژییەتی ئاڕاستەکردن دادەنرێت، لێرەدا مەبەستمان ئەو جۆرە پرسیارانەیە کە کردەی داواکردن لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن.

قسەکەر داواکارییەکی هەیە لە ڕێی فۆرمی ڕستەکەیەوە ئاڕاستەی گوێگری دەکات، کە باوەڕی وایە هێشتا کردەکە نەکراوە و گوێگر توانای جێبەجێکردنی داواکارییەکەی هەیە . لەم جۆرە

پرسیارکردنەدا قسەکەر داوایەک ئاڕاستەی گوێگر دەکات بە مەبەستی جێبەجێکردنی (محمود: ٢٠٠٩ :٥١) واتا نێرەر نایەوێت لە پرسیارکردنەکەوە وەڵامێکی دەست کەوێت بەڵکو لەگەڵ مەرجی ڕستەی فەرمانیدا هاوکاری دەکات و نێرەر پێیوایە وەرگر دەتوانێت ئەو هەستێت بە ئەنجامدانی کارەکە.

(نالی) لە چامەکەیدا پرسیاری زۆری کردووە بە مەبەستی دەستخستنی وەڵام و ئاڕاستەکردنی نێرەر بۆ وەڵامدانەوەی، ڕەنگە پرسیارەکان لە شێوەی دەستخستنی وەڵامێکدا دەربکەون بەڵام لە واتایاندا شێوەیەک لە ئاڕاستەکردن و داخوازی دەردەکەوێت.

بۆ نموونە دەپرسێت:

داخۆ دەروونی شەق نەبووە (پردی سەرشەقام)؟

پیر و فوتادە تەن نەبووە (داری پیرمە سوور)؟

(دیوانی نالی/ ١٨٤)

مەبەستی لێرەوە ئەوەیە بڕۆ بپرسە و ئەو زانیارییانەم بۆ بێنەوە

یان دەڵێت:

سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو (خانەقا) بکە

ئایا ڕەبیعی ئاهووە، یا چایری ستوور؟

(دیوانی نالی/ ١٨٨)

هەروەها دەڵێت بڕۆ زانیاریم بۆ بێنە بزانە:

مەیلێ بکە لە سەبزە درەختانی مەدرەسە

ئەوراقیان موقەدیمەییی شینە یانە ستوور؟

(دیوانی نالی/١٩١)

بەم جۆرە زۆربەی بەیتەکانی پرسیارکردنە ئەمە خۆی ستراتیژییەتێکە بۆ ئاڕاستەکردنی وەرگرو بە دەسەڵاتی نێرەر بۆ ئەوەی وەڵامێکی چنگ کەوێت، کەچی هەموو بەیتەکانی (سالم) لە چامەکەیدا لە شێوەی وەڵامدانەوەدان تەنها لە یەک بەیت پرسیاری کردووە:

کەی دێتە خەندە غونچە، دەمی، بێ وەزیدەنت ؟
گەر تۆنەبی درە ختی چەمەن ناگرێ سەمەر

(دیوانی سالم/٦٦)

**سێیەم : ستراتیژییەتی ڕازیکردن:**

یەکێک لەو ئامانجانەی کە نێرەر دەیەوێت بەدی بێت لە ڕێگای گوتارەکەیەوە ڕازیکردنی وەرگرە بەو شێوەی کە خۆی دەیبینێت، ئەم جۆرە ستراتیژییەتە پراگماتیکییە پێیدەوترێت ستراتیژییەتی ڕازیکردن، کە لە ئامانجی گوتارەکەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەرگۆمێنت هێنانەوە بە بەهێزترین میکانزمی زمان دادەنرێت کە نێرەر بەکاری دەهێنێت بۆ ڕازیکردنی وەرگر. لە زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەر ڕازیکردن کراون، لەبری ڕازیکردن ئەرگۆمێنت هێنانەوە بەکاردەهێنن یان لەبری ستراتیژییەتی ڕازیکردن ستراتیژییەتی ئەرگـۆمێنتی بەکار دەهێنن. ڕازیکردن بە سیمایەکی گرنگی گوتار دادەنرێت تەنانەت هەندێ کەس پێیانوایە زمان لە کوێ بێت ئەرگۆمێنتیش لە وێیە. ( شامة : ٢٠٠٩: ١١).

هەندێ لە زمانناسان پێیانوابوو گوتار بەبێ ئەرگۆمێنت بوونی نییە، ئەرگۆمێنت بە سروشتی گوتار دادەنرێت، (بیرلمان ) پێناسەی ئەرگۆمێنت دەکات و تەرکیز لەسەر ئەرکی ئەرگۆمێنت دەکاتەوە و دەڵێت ((وەرگر ڕازی بکات بەو شتەی کە پێشکەشی دەکرێت یان قەبارەی ئەو ڕازیکردنە زیاتر بکات)) (هەمان سەرچاوە:٢٦٩) فلیپ بریتۆنیش بە کردەی گەیاندنی دەبەستێتەوە، (میشال ادم)یش ئەرکێکی تری خستە سەر ئەو ئەرکانەی کە یاکۆپسن بۆ زمانی داناوە ئەویش کردەی ڕازیکردنە. (هەمان سەرچاوە:٢٠٠٩ : ١٣) شارۆدۆ دەڵێت: ((ئەرگۆمێنت هێنانەوە بەرەنجامێکی دەقییە لە پێکهاتەی جۆراوجۆر مەبەستی ئەوەیە بە هۆی سیاقە جۆربەجۆرەکانەوە ئامانجی ڕازیکردن بپێکێت)). (شارۆدۆ:٢٠٠٩ : ١٦).

ئەوکەسەی ئەرگۆمێنت دەهێنێتەوە لەگەڵ ڕازیکردن دەیەوێت کاریگەریش دروست بکات، ئەگەر ئەو مەبەستەش سەری گرت ئەوا

گوتارەکەی بەتەواوی سەری گرتووە و لێرەوە سروشتی گوتارەکە دەستنیشان دەکات کە بریتییە لە فراوانکردنی مەودای ویستی هێزی نێرەر کە پاراوی و ڕەوانی زمان دەتوانێ پەیوەندییەکە تۆکمەتر بکات.

بیرلمان (١٩٥٨) چەمکی (ڕەوانبێژی نوێ) (the new rhetoric) بەستەوە بە لێکۆڵینەوەی ئەرگۆمێنتی، جەختی لەسەرئەوە کردەوە کە بەڵگە هێنانەوە لە زنجیرەیەک ئەرگۆمێنت پێکهاتووە کە لە کۆتاییدا جەخت لەسەر هەمان ئەنجام دەکاتەوە و دەقیش شێوازێکی ڕێکخراوە لە دەرخستنی ئەرگۆمێنتەکان بونیادەکەشی بەرەو ئامانجێک ئاراستە دەکرێت زۆربەی جار مەبەستی ڕازیکردن و کاریگەری دروستکردنە. (دفه : ٢٠١٤: ٤٩٦.) لە زمانی ئینگلیزیدا (Argue) واتا بوونی جیاوازی لە نێوان دوو لایەنی گوتاردا هەر لایەکیان دەیەوێت ئەوی تر ڕازی بکات بە بۆچوونەکانی بەهۆی پێشکەشکردنی (Reasons) (العلل) (بەڵگە) کە (argoment) پاڵپشتی ئەو بیرۆکەیە دەکات. (هەمان سەرچاوە:٤٩٦)

ئەرگۆمێنت هێنانەوە کردەیەکی گەیاندنکارییە بە ئەرگۆمێنتی لۆژیکی کەسانی تر ڕازی دەکرێن و کاریگەرییان لەسەر دروست دەکرێت، ئەرگۆمێنت بە ڕەگەزێکی گرنگی گوتار دادەنرێت لەبەر ئەوەی نێرەرلە ڕێگایەوە دەتوانێت بەڵگە بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی وەرگر لە گوتارەکەی بە تەواوی تێبگات و ڕازی بێت بە ناوەڕۆکەکەی و کاریگەر بێت پێی، بێگومان نێرەر پشت بە میکانزمی زمانی و نازمانی دەبەستێت بۆ ئەوەی ئامانجەکەی بپێکێت.

**ئامانجەکانی ستراتیژییەتی ڕازیکردن:**

بەدەستخستنی ڕازیبوون و کاریگەری دروستکردن ئامانجی هەموو گوتارێکە، دەکرێت ئامانجەکانی ئەم ستراتیژییەتە بەم شێوەیە کورت کەینەوە: (عبدالرحمن:٢٠٠٠ :٣٨)

١- کاریگەرییە پراگماتییەکانی زۆرە لەسەر وەرگر، بێ ئەوەی زۆری لێ بکات بە پەیامەکە ڕازی دەبێت.

٢- دەستخستنی ڕازیبوون کە ئەمە بە سیمایەکی گرنگی هەموو گوتارێک دادەنرێت.

٣- دەستکەوتنی دەسەڵات لە گوتارەکەدا، کاتێک وەرگر بە گوتارەکە ڕازی بوو، ئەوکات نێرەر دەسەڵاتێکی شیاوی دەبێت لە بەر ئەوەی ئەگەر وەرگر بە گوتارەکە ڕازی نەبێت، بێگومان نێرەر دەسەڵاتی لە گوتارەکە لە دەست دەدات.

٤- لەبەر ئەوەی لە ڕێگای عەقڵەوە وەرگر دەدوێنرێت بۆیە کاریگەری لەسەری زۆرتر دەبێت.

**کەرەستە و میکانزمە زمانییەکانی ستراتیژییەتی ڕازیکردن :**

**١- کەرەستە زمانییەکانی ڕازیکردن:**

دووبارەکردنەوە: دووبارەکردنەوەی وشەیەک لە شوێنێکدا بە دیارترین شێوازی زمانی ئەرگۆمێنت هێنانەوە دادەنرێت، نێرەر پشتی پێ دەبەستێت بۆ سەلماندنی گوتارەکەی یان پێی دەوترێت (الترديد، الترداد) واتای پێداگیری و سووربوونی کەسەکە دەگەیەنێت بۆ کاریگەری دروستکردن و ڕازیکردن.( قسمية ٢٠١٢ : ١٦٧)

لێرەش دووبارەکردنەوەی هەمان وشە بە مەبەستی جیا یان هاوواتای وشەکە دووبارە دەکرێتەوە هەروەک:

(نالی) لە چامەکەیدا ئەم دووبارەکردنەوانەی بەکار هێناوە:

وشەی (ئەی) سێ جار بەکار هێناوە لە بەیتی(١)(٢)(٣)یەم

لە بەیتی (٤)ەمدا وشەی (گاهێ) دوو جار هاتووە.

لە بەیتی (٧)ەم چوار جار وشەی (هەم) بەکار هاتووە.

لە بەیتی (٨) وشەی (وەک) دووبارە بۆتەوە.

لە بەیتی (٢٦) دا وشەی (ئاسکە) دووبارە بۆتەوە

لە بەیتی (٣٩) وشەی (غار) و (یار) چەند جارێک بە مەبەستی جیا بەکار هاتووە.

(سالم) لە چامەکەیدا:

وشەی (ئەی) دووبارە کردۆتەوە لە بەیتی (١) (٢)
دووجار وشەی ((نالی)) لە قەسیدەکە هاتووە.
لە چامەکەدا (٩) جار وشەی تورک و ڕۆمی بەکار هێناوە.
لە بەیتی (٩) یەمدا، (تورک) و (ڕۆم) کە هاو واتان بەکارهاتوون.
(سالم) لە وەڵامەکەیدا زۆر وشەی دووبارە کردۆتەوە کە لە سەرەتادا لە چامەکەی (نالی) هاتووە، بێگومان هەر بۆ مەبەستی ڕازیکردنی وەرگر ئەم کارەی کردووە. (سەیوان، خانەقا، پیرمە سوور.... هتد)
دەکرێت، ئاوەڵناو و ئاوەڵکاری هۆ و مەبەست و .... هتد، مەبەستی ڕازیکردن و کاریگەری دروستکردن بگەیەنن.

**٢- میکانزمەکانی ڕازیکردن:**

**أ-میکانزمە ڕەوانبێژییەکان:**

لێرەدا مەبەستمان لە واتا باوەکەی ڕەوانبێژی نییە، بەڵکو مەبەستمان ئەو ئەرکە ئەرگۆمێنتیانەیە کە وێنە ڕەوانبێژییەکان لە هێنانەوەی ئەرگۆمێنتدا دەیبینن.

شێوازە ڕەوانبێژییەکان لە سیاقە ڕەوانبێژییەکەیان دادەبڕێنرێن بۆ ئەوەی ئەرک ببینن نەک جوانی دابڕێژن، ئەرکی ڕازیکردن و بەڵگەهێنانەوە دەبینن، لێرەدا دەردەکەوێت کە بەشی هەرە زۆری شێوازە ڕەوانبێژییەکان دەتوانن ڕۆڵی کەرەستەی گەیاندن ببینن، دەکرێت بۆ مەبەستی ئەرگۆمێنت هێنانەوە بەکار بهێنرێن، جگە لەوە ڕەهەندی پراگماتیکیشیان تێدا بەدی دەکرێت. ( الحباشية : ٢٠٠٨، :٥٠)

١- دابەشکردنی گشت بەسەر بەشدا:

پرسێکی سەرەکیت هەیە، بەشەکانی تر هەمووی بەڵگەن بۆ پرسە سەرەکییەکە، واتا تۆ گوتارەکە بەش بەش دەکەیت بۆ ئەوەی بیکەی بە ئەرگۆمێنت بۆ پرسە سەرەکییەکەت (قسمية :٢٠١٢: ١٥٠)

لە چـامەکەی (نـالی)دا هەمـوو بەیتەکـانی قەسـیدەکە بەشـێکن لە پرسـێکی سـەرەکی، واتـا گوتـاری چامەکە بەش بەش کـراوە بۆ ئەوەی ببن بە ئەرگۆمێنت بۆ پرسێکی سەرەکی:

لە بەیتی (١) تا بەیتی (٤١) پرسەکە بەش کراوە بۆ بەیتی (٤٢)

ئایا مەقامی ڕوخسەتە لەم بەینە بێمەوە
یا مەصلەحەت تەوەقوفە تا یەومی نەفخی صور




بە هەمان شێوە، گوتـاری چامەکەی (سـالم)یش، هەمـوو بەیتەکـانی چامەکە بەشێکن لە پرسێکی سەرەکی واتـا گوتـاری چامەکە بەش بەش کراوە بۆ ئەوەی ببن بە ئەرگۆمێنت بۆ پرسـێکی سـەرەکی: لە بەیتی (١) تاکو بەیتی (٣٣) بەشێکن لە پرسی بەیتی (٣٥)


توخوا بڵێ بە حەضرەتی (نالی) : دەخیلی بم
بەم نەوعە قەط نەکا بە سولەیمانیا عبور



لەهەر دوو چامەکەدا ئەم میکانزمە بەکار هاتووە بۆ بەڵگە هێنانەوە و وەک ئەرگۆمێنتێک بەکار هاتووە بۆ ئەوەی وەرگری گوتار ڕازی بکەن بەو مەبەستانەی کە لە ناوەرۆکی گوتارەکەدا هاتووە و هەمووی پاڵپشتین بۆ پرسی سەرەکی، بەڵگەکان هەرچەندە زۆرتر بن پرسە سەرەکییەکە بەهێزتر دەبێت.

٢- خواستن:

بریتییە لە هەڵبژاردنی هێمایەک بەپێی لێکچوونی واتایی لە شوێنی هێمایەکی تر(نجم الدین:٢٠٠٧: ١١٥) لە خواستن بە هیچ جۆرێک لێکچوون دیار نابێ ئەگەر دیار بێت لە خواستن ئەکەوێت و ئەبێت بە لێکچواندن (گەردی :١٩٧٢ : ٧١) خواستن بە یەکێک لە میکانزمە ڕەوانبێژییەکانی ئەرگۆمێنت هێنانەوە دادەنرێت، نێرەر بەکاری دەهێنێت بۆ گەیشتن بە ئامانجە ئەرگۆمێنتییەکانی، بگرە بە میکانزمێک دادەنرێت کە زۆر پشتی پێ دەبەسترێت. پراگماتیک لەو لێکۆڵینەوانەی کە دەربارەی خواستن کردوویەتی ئەوەی سەلماندووە کە مەبەست لە دانانی گوتاری خواستن کاریگەری دروستکردنە لەسەر وەرگرەکان. (عبدالرحمن:١٩٩٨: ٢٣٠)

هێزی ئەرگۆمێنت هێنانەوە لە بەکارهێنانی وشە بۆ خواستن زۆر بەهێزترە لە هەمان وشە ئەگەر بە واتای ڕاستەقینەی خۆی بەکاری بهێنین، سیفەتی ئەرگۆمێنتی سیفەتێکی چەسپاوە لە خواستندا لەبەر ئەوەی هەندێ سیمای واتایی لە خۆیدا حەشار دەدات کە بە سیمای بەنرخ دادەنرێن لە بەڵگە هێنانەوە و چەسپاندنی بیرو ڕادا. (الشهري: ٢٠٠٤: ٤٩٥).

بۆنموونە نالی دەڵێت:

یەعنی ریاضی رەوضەکە تێدا بەچەن دەمێ
موشکین دەبێ بەکاکۆڵی غیلمان و زوڵفی حور

(دیوانی نالی/ ١٨١)

لێرەدا ( روض) ی بۆ سلێمانی خواستووە، غیلمان و حۆریشی بۆ کچ و کوڕەکانی ئەو شارە خواستووە.

٣- لێکچوواندن:

لێکچوواندن بەستن و پەیداکردنی وێچوونێکە لە نێوان دوو شتا بە هۆی هاوبەشبوونیان لە یەک سیفەتا یا زیاتر بۆ مەبەستێک یان چەند مەبەستێکی دیار. (عەزیز گەردی:١٩٧٢ :٢٢) ئەم پرۆسەیەش چوار ڕەگەزی پێویستە(لێچوو، لەوچوو، ئامراز، ڕووی لێکچوون) (نجم الدین: ٢٠٠٧ : ١١٤)

شاعیر لە شیعرەکانیدا دوو وێنە بەکار دەهێنێت وێنەیەکی بۆ جوانکردنی گوتارەکەیە، لێرەدا ڕەوانبێژی مەبەستی چێژبەخشین و جوانی دەگەیەنێت، لە لایەکی ترەوە وێنەکە گوتارەکە لە وەرگرەکە نزیک دەخاتەوە و کاریگەری دروست دەکات ڕەوانبێژی لێرەدا ڕەوانبێژی ڕازیکردنە.

بۆ نموونە نالی دەڵێت:

وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار
وەک ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی (شیوە سوور)

(دیوانی نالی/ ١٧٨)

ئامراز: وەک
لێچوو: ئاە، ئەشک
لەوچوو: (با)
ڕووی لێکچوون: خێرایی، جاری بوون

هەروەها لە بەیتی ( ٤) ، ( ٨) ،(١١)،(١٢)،(١٤)،(٣٠)،(٤٠) دا لێکچوواندن هەیە.

یان سالم دەڵێت:

وەک پیری ساڵ خوردە، خەمە، داری پیرمە سوور
مەشغوڵی لەغزشە هەمە جا، پایی تا بەسەر

(دیوانی سالم/ ٦٦)

ئامراز: وەک
لێچوو: پیری ساڵ خوردە
لەوچوو: داری پیرمە سوور
ڕووی لێکچوون: خەمە (خوارە)

**ب- میکانزمە لۆژیکییەکان**:

ئەو پەیوەندییە لۆژیکییەی کە گوتاری ئەرگۆمێنتی پشتی پێ دەبەستێت لەسەر، تێز و ئەنجام بەندە، بە مەرجێ ئەنجامەکە بە پێشەکییەکانەوە بەسترابێت، ئەوانیش بە پێوانەکانەوە بەندن. لەبەر ئەوەی ئەو پێشەکییانە بە زەروورەت ئەو ئەنجامانەیان لێ دەکەوێتەوە ئەمەش پەیوەندی بەتینی نێوان پێشەکییەکان و ئەنجامەکان دەخاتە ڕوو. (سمیە: ٢٠١٢ : ١٦٢) لە جۆرەکانی پێوانەکانیش (پێوانی لۆژیکی تەواو) ئەو جۆرە پێوانەیە کە بە بونیادێکی سەرەکی هەموو گوتارێک دادەنرێت دەبێت پێوانەکە پێشەکی هەبێت پێوانەکەش هەر لەسەر ئەو بونیاد دەنرێت. بۆ نموونە (سالم) لە بەیتی کۆتاییدا دەڵێت:

ئەم موڵکە نەظمی نابێت بە بێ ضەبطی واریثی
بێ ئەو بە قەصدی ئەم طەرەفە با نەکا سەفەر

(دیوانی سالم/٦٧)

تێز یان پێشەکی: ئەم موڵکە نەظمی نابێت
ئەنجام: بە بێ ضەبطی واریثی

پێوانێکی لۆژیکی تەواو لەم بەیتەدا دەبینین، سەرەتا پرسێک خراوەتەڕوو پاشان ئەنجامێکی بەدەستەوە داوە، هەر ئەمەش دەبێتە ئەرگۆمێنتێک بۆ گەیاندنی مەبەستەکە و چەسپاندنی بیروڕاکانی لەبەر ئەوەی بە لۆژیک ڕاکەی سەلماندووە.

**ئەنجامەکان:**

١- گوتار خۆی لە هەندێ چەمک و بیرکردنەوەدا دەبینێتەوە و دەسەڵاتی هەیە بەسەر قسەکردن و نووسینی کەسەکانەوە، تۆڕێکی ئاڵۆزی پەیوەندییە دەقەکانی لێوە بەرهەم دێت.

٢- ستراتیژییەتی گوتار بەڕێگایەکی گونجاو دادەنرێت بۆ ئەوەی نێرەر لە ڕێگایەوە گوتارەکەی بدرکێنێت و ویستی خۆی بسەپێنێت و مەبەستەکانی بگەیەنێت. نێرەر دەیەوێت لە ڕێگای ئەو ئامراز و میکانزمە زمانییانەی کە بەکاری هێناوە کاریگەری لەسەر وەرگر دروست بکات.

٣- کەسێک کە دەقێکی شیعری دەنووسێت پێشتر گوتارێکی هەیە کە ئاڕاستەی دەقە شیعرییەکەی دیاری دەکات دەکرێت ئامانج و مەبەستەکانی گوتارەکە لە تەواوی دەقە شیعرییەکەدا شاراوە بێت و جار جار خۆی دەرخات و هەندێ جاریش تا کۆتایی شیعرەکە ئاشکرا نەبێت..

٤- سالم زیاتر پشتی بەستراتیژییەتی هاوسۆزی بەستووە بۆ گەیاندنی مەبەستەکانی پشت گوتارەکەی.

٥- نالی زیاتر پشتی بە ستراتیژییەتی ئاڕاستەکردن بەستووە بۆ گەیاندنی مەبەستەکانی، جڵەوی گوتارەکە زیاتر بە دەستی نالییەوەیە.

٦- لە ستراتیژییەتی ڕازیکردندا، نالی زیاتر پشتی بە ڕەوانبێژی بەستووە کەچی لە بەیتەکانی سالمدا کەمترە و لە بەیتەکانی سالمدا پێوانی لۆژیکی تەواومان بەرچاو دەکەوێت.

## سەرچاوەکان:

**بە کوردی:**


١. عەلـی، تالّیـب حوسـێن، ٢٠١٤ ، زانسـتی زمـان و زمـانی کـوردی، چاپخـانەی ڕۆژهەلات، هەولێر.
٢. کمال دیار علی ، ٢٠١٠، گوتاری سیاسی کوردی لە ڕوانگەی پێشگریمانەکانەوە، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی پەروەردە، زانکۆی سەلاحەدین هەولێر.
٣. معین سازان ڕەزا، ٢٠٠٥، واتا و دەوروبەر، نامەی ماجستێر، کۆلێژی پەروەردە بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر.
٤. دزەیی، عبدالواحد مشیر، ٢٠١١ زانستی پراگماتیک، چاپخانەی پاک، هەولێر.
٥. دزەیی ، عبدالواحد مشیر، ٢٠٠٩، واتاسازی، چەند لێکۆڵینەوەیەکی سیمانتیکی و پراگماتیکییە، دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی.
٦. سـاحب قـڕان ،عبـدالرحمن بەگـی، ١٩٧٢، دیـوانی سـالم، چاپخـانەی کوردسـتان، چاپی دووەم، هەولێر.
٧. نجـــم الـــدین، عبدالســـلام، ٢٠٠٧، شـــیکردنەوەی دەقـــی شـــیعری لەڕووی زمانەوانییەوە، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سەلاحەدین هەولێر.
٨. دزەیی، عبدالواحد مشـیر،٢٠١٤، پراگمـاتیکی دەق و گوتـار، زانکـۆی سـەلاحەدین، کۆلێژی زمان، بەشی کوردی.
٩. ڕەسول، عەبدوڵا حسێن، ٢٠٠٦، پوختەیەکی وردی ڕستەسـازی کوردی، چاپی دووەم، هەولێر.
١٠.گەردی، عەزیز، ڕەوانبێژی، ١٩٧٩، چاپخانەی ڕۆشنبیری، بەغدا.
١١.مدرس، مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، هەتـاوی ١٣٨٠، دیـوانی نـالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی، بلاوکراوەی (انتشارات) چاپی یەکەم ، سنە.
١٢.فـرج ، هـۆگر محمـود، ٢٠٠٠، پراگماتیـک و واتـای نیشـانەکان، زانکـۆی سـلێمانی، بلاو نەکراوە.
١٣.ڕەشید، ئارام عبدالواحد حمە، ٢٠١٣، ڕێزگرتن لە زمانی کوردیدا، لێکۆڵینەوەیەکە لە بواری زانستی زمانی کۆمەلایەتیدا، چاپخانەی لاریا، سلێمانی.
١٤.محمـود، ئاڤێسـتا کمـال، ٢٠٠٩، پراگمـاتیکی ڕسـتەی پرسـیار و فەرمانـدان لە کرمانجی خواروودا، دەزگای کوردۆلۆجی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی.


**بە عەرەبی:**


١. ابریر بشیر ،٢٠٠١، في تعلیمیة الخطاب العلمي، مجلة التواصل، جامعة باجي مختار، عنابة، ع ٨ ، جوان .

٢. الباردي ، محمد، ٢٠٠٠، إنشائية الخطاب في الرواية العربية الحديثة، مركز النشر الجامعي، تونس.
٣. برهونة ، عيسى عودة ،٢٠٠٧، تمثلات اللغة في الخطاب السياسي، عالم الفكر، المجلد ٣، سبتمبر.
٤. بوداود، لامية، ٢٠١٠، تحليل الخطاب الميني الروائي في الجزائر، (رواية اوشام بربرية) لجميلة زنير نموذجا، رسالة ماجستير.
٥. الحباشية ، صابر ، ٢٠٠٨، التداولية والحجاج مداخل ونصوص، صفحات الدراسات والنشر.
٦. الخطابي، محمد،١٩٩١، لسانيات النص مدخل الى انسجام الخطاب، ط١، مركز الثقافة العربي، بيروت.
٧. دايک ، فان ، ٢٠٠٠، النص والسياق استقصاء والبحث في الخطاب الدلالي والتداولية، ت،عبد القادر القنيني، افريقا الشرق.
٨. دفة ، بلقاسم، ٢٠١٤، (استراتيجية الخطاب الحجاجي – دراسة التداولية في الارسالية الاشهارية العربية، جامعة باتنة- جزائر، مجلة مخبر، العدد العاشر.
٩. شارودو، باتريک، الحجاج بين النظرية والاسلوب، ت: احمد الود، دار الكتب الجديد، ط١.
١٠.شامة، مكلي، ٢٠٠٢، الحجاج في شعر النقائض، دراسة التداولية، جامعة مولود تيزي وزو، كلية الآداب والعلوم الانسانية، قسم الادب العربي.
١١.الشهري ، عبدالهادي بن ظافر، ٢٠٠٤، استراتيجيات الخطاب، مقاربة اللغوية التداولية، دار الكتاب الجديد، بنغازي/ ليبيا.
١٢.عبدالرحمن، طه، ١٩٩٨، اللسان والميزان او تكوثر العقلي، المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء.
١٣.عبدالرحمن، طه، ٢٠٠٠، في اصول الحوار والتجديد علم الكلام، المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء.
١٤.فضل، صلاح، ١٩٦١، بلاغة الخطاب وعلم النص ، الشركة المصرية العالمية للنشر والتوزيع، ط ١، لونجمان.
١٥.الفقي ، صبحي ابراهيم، ٢٠٠٠، علم اللغة النصي بين النظرية والتطبيق: دار القبا القاهرة.
١٦.فوكو، ميشال، ٢٠٠٥، حفريات المعرفة، ترجمة: سالم يفوت، المركز الثقافي العربي، الطبعة الثالثة، الدار البيضاء – مغرب.
١٧.فيهفنجر ، فؤلفانج هاينمان ديتر، ٢٠٠٤، مدخل الى علم لغة النص ترجمة: سعيد حسن بحيري، مكتبة زهاء الشرق.

١٨.قسمية، دليلة ، ٢٠١٢، استراتيجيات الخطاب في الحديث النبوي، جامعة الحاج خضر، كلية الاداب واللغات، قسم اللغة العربية وآدابها.
١٩.مقبول ، ادريس،٢٠١٤ الاستراتيجيات التخاطبية في السنة النبوية، مجلة كلية علوم الاسلامية، المجلد الثامن، العدد (٢/١٥).
٢٠.يقطين، سعيد،١٩٨٩، تحليل الخطاب الروائي، الزمن والسرد، التبئير، المركز الثقافي العربي.

**ئینتەرنێت:**

٢١.كريم، جمعان، الاستراتيجية وعلاقتها بالنص والخطاب

**22.** http://www.startimes.com/f.aspx?t=9009954

٢٣. يوسف، علي حسن ، المعنى اللغوي والمفهوم الاصطلاحي لخطاب، http://www.kitabat.com/ar/page/12/03/2014/24449**/**

بە ئینگلیزی:

1-Vin Dijk,Kintisch,w1-Strategies of Discourse Comprehension, New York ,London, 1983.

2- Ch. Linde , The quantitative study of communicative success: Politeness and accidents in aviation discourse . Language in Society 17 (1988 )

## ملخص البحث

الخطاب وحدة من وحدات عملية التواصل، يحمل رؤيا متكلمٍ أو كاتبٍ معين لكي يؤثر على المخاطب، مع الأخذ بعين الاعتبار السياق والبيئة المحيطة به. لكل مجموعة في كافة الحقول المعرفية وفي كل الأزمنة خطابها الخاص الذي يتمثل في منظومة مفاهيم وأفكار تمارس هيمنتها على كلامها وكتاباتها، وهكذا في جميع الخطابات هناك مرسل لديه رسالة يوجهها إلى مرسل إليه، ومن هنا فللسياق أهمية كبيرة لفهم الخطاب ومقاصد المرسل. لا شك أن الحديث عن قضية استراتيجيات الخطاب هو حديث عن الأساس الذي يبنى عليه هذا الخطاب بمختلف أنواعه ومقاصده وأبعاده، ومن هنا أيضاً نبعت (ظهرت) لدى الدارسين فكرة الاهتمام بهذه الاستراتيجيات التي يتوخاها المرسل في خطابه تبعا لغرضه من صياغة هذا الخطاب وتوجيهه. وقد اخترت الاشتغال على استخراج الاستراتيجيات التي ينبني عليها الخطاب في قصيدتي (رسالتي نالي وسالم) لكونهما نصين من النصوص القيمة في الأدب الكردي، وحاولت أن أوضح الآليات والأدوات اللغوية التي أوصل الشاعران عن طريقهما مقاصدَهما من خلال خطابهما في القصيدتين.

## Abstract

Discourse strategies, of the two poems
by Nali and Salem as the sample

Discourse is the unit of the process of communication. It carries the vision of a particular author or speaker. In order to affect the addressee, it is taking into consideration the context and the surrounding environment. Each group in all cognitive fields and at all times has got their private rhetoric of concepts and ideas which practice its dominance in their words and writings. Thus, in all the speech system there, the sender has a message directing to the addressee and from here to the context of great importance to understand speech and purposes of the sender. There is no doubt that the talk about the issue of discourse strategies is in depth a talk about the basis on which built upon the speech of various kinds and purposes of its dimensions, and originated with the students the idea of interest in these strategies envisaged by the sender in his speech.

Thus, the study intends to exhibit the discourse strategies adopted in the two poems of Nali and Salem to deliver what they purposed their readers to receive.

# رۆڵی جەنگی دەروونیی مەغۆل
# لە گرتنی قەڵا و شارە کوردنشینەکاندا

**پ.ی.د.قادر محەمەد حەسەن** کۆلێژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر
**م.ی.رەسوڵ ئیبراهیم رەسوڵ** کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەت/ زانکۆی ڕاپەڕین

**پێشەکی:**

مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی فرە ڕەهەند، هەر لەکۆنەوە بەپێی قۆناغەکانی گەشەی زانست هەوڵدراوە لە دەروونی بکۆڵرێتەوە، پەی بە نهێنیی پاڵنەرە دەروونییەکانی ببرێت، کە زۆرجار لە ژێر کاریگەری دەرەکیدان، کاردەکەنە سەر گۆڕینی ڕەفتار و چالاکییەکانی، ئەمەش پەیوەندی بە ڕەهەندە جیاوازەکانی ژیانەوە هەیە، کە هەندێك جار ئەو کارتێکردنە بە شێوەیەکی خراپ ڕەنگی لە ژیانیدا داوەتەوە، هەربۆیە هێزە شەڕکەرەکان لە چوارچێوەی هونەرە سەربازییەکانیاندا بە شێوازی جیاجیا کاریان لەسەر دەروونی هێزی بەرامبەر کردووە، تا وای لێهات بووە بە شێوە جەنگێکی نوێ، کە ئەمڕۆ بە جەنگی دەروونی دەناسرێت، کە هەرچەندە بە زاراوە نوێیە، بەڵام قووڵاییەکی مێژوویی زۆری هەیە، کە بە پێچەوانەی جەنگی سەربازی لەبری چەك بە شێوازی جیاجیا سوود لە لاوازکردن و رووخاندنی باری دەروونیی بەرامبەر وەردەگیرێت، بۆ بەدیهێنانی ستراتیژی سەربازیی سەرکەوتوو، هەندێ جاریش لەپاڵ بەیەکدادانی سەربازیدا هۆکاری یارمەتیدەرە، لە مێژووی کوردا تائێستا وەك پێویست ئاوڕ لەم بابەتانە نەدراوەتەوە، بەتایبەت سوود وەرگرتنی هێزە داگیرکەرەکانی کوردستان لەم جەنگە، زۆر جار، بۆ تێکدانی ورەی جەنگاوەرانی کورد، کاری خۆی کردووە، لە وانەش مەغۆلەکان، کە هێرشەکانیان لە مێژوودا بە یەکێك لە توندوتیژترین هەڵمەتە سەربازییەکان ناسراون، لە پاڵ جەنگی مەیدانیدا بۆ گرتنی قەڵا و شارە کوردییەکان پەنایان بۆ ئەم جەنگەش بردووە.

ئاشنابوون بە شێوازەکانی جەنگی دەروونیی مەغۆل بەرامبەر بە کورد و ڕادەی کاریگەری لە داگیرکردنی قەڵا و شارە کوردییەکاندا، هەر لە سەرەتای ساڵانی (٦١٨ك/١٢٢١ز)وە بۆ دوای داگیرکردنی بەغدا ساڵی (٦٥٦ك/ ١٢٦٠ز) ش پیادەی ئەم جۆرە جەنگەیان کردووە، ئەمەش ئەوە هەڵدەگرن توێژینەوەی تایبەتییان لەسەر بکرێت، هەرچەندە لەسەر مێژووی سیاسی و لایەنەکانی تر زۆر باسی مەغۆل و هێرشەکانیان کراوە، بەڵام ئەم بابەتە وەك پێویست چ وەکو بەش و بابەت لە نێو کتێب و نامە زانستییەکاندا و چ وەکو توێژینەوەی تایبەت و سەربەخۆ لە پەیوەندی لەگەڵ دیرۆکی مەغۆلان لای لێ نەکراوەتەوە، نەخاسمە لە پەیوەندی بەکورد و کاریگەری جەنگی دەروونی لەسەریان.، لەلایەکی دیکە تائێستاش ئەم جۆرە جەنگانە بەرامبەر بەکورد ئەنجام دەدرێن، بۆیە پەیبردن بە خاڵە لاوازەکان و پەرەدان بە لایەنە بەهێزەکانی ئەم بوارە بە سوود وەرگرتن لە ئەزموونی ڕابردوومان، ئامانجی سەرەکی توێژینەوەکەیە، هەرچەندە لاکردنەوە لەم لایەنە لە مێژووی کورد پێویستی بە توێژینەوەی زیاترە، بۆیە ئومێد دەکەین دەروازەیەك بێت بۆ لێکۆڵینەوەی تێروتەسەلتر لەم بارەیەوە.

توێژینەوەکەش لەم پێشەکییە و دوو تەوەری سەرەکی پێکهاتووە، تەوەری یەکەم تایبەتە بەسەرەتایەك لەبارەی هونەرەکانی جەنگی مەغۆل و جەنگی دەروونی ، هەرچی تەوەری دووەمیش بۆ ڕۆڵی جەنگی دەروونیی مەغۆل لە گرتنی قەڵا و شارە کوردییەکان تەرخانکراوە، توێژینەوەکە لە کۆتاییدا ئەنجامەکانی تێدا خراوەتە ڕوو.

ئەم توێژینەوەیە بە پشتبەستن بە میتۆدی مێژوویی نووسراوە کە لێگەڕان و شیکاری لەخۆگرتووە، بۆ ئەمەش بەپلەی یەکەم پشت بەستراوە بە ئەو سەرچاوە ڕەسەنانەی کە هاوچەرخی سەردەمی شاڵاوەکانی مەغۆلن بۆ کوردستان یان کەمێك دواتر نووسراون ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو جەنگە دەروونییەی کە مەغۆلەکان بەهۆی میکانزمی لەگوێن وێرانکاری، کوشتن، ئەتککردن، ترس و تۆقاندن و ئەشکەنجەدان و گەمارۆ و...هتد دەکاریان خستبوو، بەباشترین شێوە وێنا بکرێت لەسەر زاری هاوسەردەمەکان، لەپێش هەموویان ئەوەی لە کتێبی (الكامل في التاريخ) ی ابن الأثير(م٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز) کە ئاوێنەیەکی باڵانمای دەرخەری ئەو

تــرس و بیمەیــە کــە مەغۆڵــەکان لەســەرەتای شــاڵاوەکانیان پــەرەیان پێــدابوو، هەروەکو کە سوود لە کتێبی (وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان )ی إبن خلكان (م ٦٨١ ك/ ١٢٨٢ز ) وەرگیراوە لە وێناکردنی بەشێکی دۆخــە مێژووییەکــە، هەرچــی کتێبی (تاريخ الزمـان) إبـن العـبري (م ٦٨٥ك/١٢٨٦ز) ئـەوا زانیـاریی نـاوازەی لـە خۆگرتووە لەســەر شـاڵاوی مـەغۆڵ بـۆ هەنـدێك لـە ناوچـە کوردنشـینەکان، بـەڵام کتێبی (جامع التواريخ )ی رشـيدالدين فضـل الله الهمـذاني (م ٧١٨ك/١٣١٨ز) ئـەوا بایەخەکەی لەوەدایە لە دیدگای مەغۆڵـەکان خۆیانـەوە نووسـراوە و گوزارشـت لـە تێڕوانین و تێگەیشتنیان دەکات بۆ ڕووداوەکانی سەردەمەکە و وەکـو مێژوویـەکی فەرمییە، بەڵام زانیاریی بایەخداری لەسەر بابەتی توێژینەوەکە لەخۆگرتووە .

جگە لە سەرچاوە ڕەسەنەکان  توێژینەوەکە بەهرەمەند بـووە لـە زانیـاری و لێکدانەوە و بۆچوونی نێو چەند ژێدەرێکیش (المراجع) کە کۆمـەکێکی باشـیان بـە دەرخستن و لێکدانەوەی زانیارییە مێژووییەکان کردووە کە لە لیستی ژێـدەرەکان ئاماژەیان پێکـراوە لەوانـە چـەند ژێـدەرێك بـەزمانی ئینگلیـزی کـە بەشـێکیان بـە پشتبەستن بە سەرچـاوەی دیرۆکـی بنەماڵـە فـەرمانڕەواکانی چـین نووسـراون بـۆ ئاگاداربوون لە مێژووی مەغۆڵەکان بۆ هەموو توێژەرێك پێویستن.

**تەوەری یەکەم/**

**سەرەتایەك لەبارەی هونەرەکانی جەنگی مەغۆڵ و جەنگی دەروونی:**

**أ– هونەرەکانی جەنگی مەغۆڵ:**

ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی لە نیوەی یەکەمی سەدەی (٧ك/ ١٣ز) ڕووبەڕووی چەند شاڵاوێکی یەك لەدوای یەکی هێزێکی خێڵەکی کە بە مەغۆل یان تتار[١] ناسرابوون[٢] بۆوە، ئەو نەهامەتییەی بەسەر ناوچەکەیاندا هێنا کارەساتێکی بێ وێنەبوو، بێگومان قسەکردن لەسەر بارودۆخی ناوچەکە و دواساتەکانی خەلافەتی عەبباسی زۆر هەڵدەگرێت، کە جێگای باسی ئێمە نییە[٣]، ئەوی کە لێرە دەمانەوێت قسەی لەسەر بکەین هونەرەکانی جەنگی مەغۆل و شێوازەکانی شەڕە، کە هۆکارێکی کاریگەر بوون بۆ سەرکەوتنی شاڵاوەکانیان، لەڕاستیدا هۆکاری جیاوازیش لەم بارەوە باسی لێوەکراوە، لە گرتنی ئەو رووبەرە بەرفراوانەی زەوی هەر لە چین و مەنغۆلیاوە بۆ شام، جەنگیزخان دوای سەرکەوتنی بەسەر هۆزەکانی مەغۆل و تتاردا دەستی بە ڕێکخستنی کارگێڕی و سەربازی کرد، کاروبارەکانی بەسەر چەند یەکەیەکدا دابەشکرد، لەوانەش هێزە سەربازییەکەی[٤]، کە هەرچەندە هێزی سەربازی مەغۆل سادە بوو، بەڵام کاریگەر و کارا بوو، پشتی بە سیستەمێکی ڕێكوپێك بەستبوو، گرووپە سەربازییەکان لە دەستەی جیاجیا پێکهاتبوون، لە دەستەی (دە) جەنگاوەری کە بە (ئەربان)و (سەد) جەنگاوەری بە (یاگۆن) و ( هەزار) بە (مەنگان) و (دە هەزار) کە بە (تومان) ناسرابوون[٥]، کە هەریەکەیان ملکەچی فەرماندەی لەخۆی بەرزتر بوو، بۆ هەر ئیش و کارێك کۆمەڵێك جەنگاوەر دانرابوون، مەرج بوو ئەو ئەرکانەی پێیان دەسپێررێت بە گورجوگۆڵی ئەنجامی بدەن، لە کاتی ئەگەری هەر سەرپێچی و دواکەوتنێکدا بەپێی تاوانەکەی و بێ ڕەچاوکردنی پلەوپایەی سزای توند دەدرا[٦]، هەموو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتەکەش بەپێی یاسایەك کە بە (یاسق) ناسرابوو بەڕێوەدەبرا[٧]، بۆیە مەغۆلەکان وا وێناکراون کە زۆر پابەندی بوون و هەروەها بە تەواوی ڕەچاوی دیسپلین و یاسا سەربازییەکانیان دەکرد و لەگەڵ ئەرکەکانیان هەروەتر سەرکردەکانیشیان ڕاستگۆ بوون[٨]، هەربۆیە ئەو دیسپلینە سەختەش توانای ڕێکخستن و توندوتۆڵی ناوخۆی بۆتە هۆی پاراستن و بەردەوامیدان بە ئیمپراتۆریەتەکەیان.

مەغۆلەکان پەیڕەویان لە یاسای بەزۆرخزمەتی سەربازی دەکرد، بۆ هەرکەسێك کە تەمەنی لەنێوان (١٤– ٦٠)ساڵی بووایە، لە مەشقە سەخت و جۆربەجۆرەکاندا دەربچوایە دەکرا بەسەرباز[٩]، پێدەچێت گەلی مەغۆل هەموویان لە ریزی سوپادا بووبن، بەمەبەستی بەدەستهێنانی خۆراك و شمەکی پێویست[١٠]، بەم هۆیەشەوە سوپایەکی زۆرو لەبن نەهاتوویان بنیاتنابوو، هەر لە منداڵیشەوە دەست بە ڕاهێنانیان دەکرا، بەتایبەت لە کاتی ڕاودا فێری هونەرەکانی جەنگ و بەکارهێنانی چەند جۆرێك لە چەك دەکران[١١]، بەجۆرێك ڕاوکردن بە یەکێك لەکارە هەرە پیرۆزەکان سەیر دەکرا[١٢]، بەمەش لەگەڵ ژینگەی سەختی ناوچەکە ڕادەهێنران، ئەو شێوازە سەختەی پێشی ڕاهاتبوون، کاریگەری زۆری لەسەر هونەرەکانی شەڕ و جەربەزەیی و خۆگری لە بارودۆخە سەختەکاندا بە جێهێشبوو، کارامەیی و ئامادەباشی سەربازیش ئەوەیە کە توانای بەرگەگرتن و ورە و تۆکمەیی بخەیتە ناو هێزەکانتەوە[١٣]، ئەمەش خەسڵەتێکی گرنگی سوپای مەغۆل بوو، کە دەیانتوانی لە سەختترین سەرما و کرێوەدا بەربلاوترین ڕووبەری زەوی ببڕن و لە ڕووبارەکان بپەڕنەوە و ئامانجەکانیان بەدەست بهێنن[١٤]، هەر لەم بارەیەشەوە جەنگیزخان زۆر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە دەبێت سەرجەم ڕۆڵەکانی مەغۆل فێری هونەرەکانی جەنگ بکرێن و متمانەی تەواویان بەخۆیان هەبێت لەکاتی هێرشبردندا[١٥]، هەرچەندە ئەوان سوپایەکی بە ژمارە زۆریان پێکهێنابوو، هەروەك (ابن ألاثیر) دەڵێ: (لا تحصی)[١٦]، بەڵام بنەمای بە هێزییان تەنها لەسەر ژمارە نەبوو، بەڵکو بەهێزی بەیەکەوە بەستنەوەیان و هەڵبژاردنی شارەزاترین و ئازاترترین کەس بۆ سەرکردایەتیکردنی یەکەکانی سوپاش، خەسڵەتێکی گرنگی سوپاکەیان بوو، کە هەمیشە بە پەیوەستبوون بە یاساکانی مەغۆلەوە لە کاتی بەرێکردنیان بۆ جەنگ ئامۆژگاری دەکران[١٧]، ئەو ڕێکخستن و هاودەنگییەش بۆ بەربەستی هێرشی دوژمن و بەرگری و پەلاماردان و تێکشکاندنی دوژمن زۆر پێویستە، ئەوەی کە لە هونەری ڕێکخستنی سەربازیی مەغۆل بەدی دەکرێت، دیاریکردنی ئەرك و پلەوپایەو بەرپرسیاریەتی و کارو فەرمانە[١٨]، چونکە شێوازو چۆنیەتی بەکارهێنانی جەنگاوەران لە مەیدانی شەڕدا، هونەرێکی گرنگی جەنگە، کە هەمیشە چارەنووسی شەڕ دیاریدەکات، لەم بارەیەشەوە مەغۆلەکان لێهاتوویی و کارامەیی زۆریان پیشانداوە.

هەرچی تایبەتیشە بە پێکهاتەی هێزی سەربازی و شێواز و ئامرازەکانی جەنگ، کە تارادەکی زۆر کاریگەری دەکەنە سەر ئایندەی شەڕ، بۆیە ئەم لایەنەشیان فەرامۆش نەکردووە[١٩]، بەگشتی پێکهاتەی هێزی سەربازییان بەپێی خەسڵەت و جۆری چەك و ئەرك و شوێنی شەڕیان بەسەر دوو تایفەگەلی جیاوازدا دابەشکرابوون، کە بریتی بوون لە هێزی سوارە و پیادە[٢٠]، دووری ڕێگاکان و بەرفراوانی سنووری قەڵەمڕەوییان سەرباری ئەنجامە کاریگەرەکانیان لە شەڕەکاندا، ئەمەی خواستووە، کە هێزی سوارە شادەماری هێزی مەغۆل پێکبهێنێت، ئەمانە سوارچاکی بە ئەزموون و شارەزا بوون، لە پێکهاتەی ئەم هێزانەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکرایەوە، کە دەبوایە جەنگاوەر لەشێکی جیری پتەوی هەبێت و وەرزشکار بێت و لەدەستەویەخەی دوژمندا لێزان و خاوەن هونەر بێت، نیشانە شکێن و تیر ئەنداز بێت، لەسەر پشتی ئەسپەوە ئامانجەکانی بپێکێت، هەموو ئەمانەش لە کەسایەتییەکدا بەرجەستە دەبن، کە خۆی لەگەڵ ژیانی سەختی بیاباننشین و ڕاودا ڕاهێنابێت[٢١]، کە پیشەیەکی سەرەکیی مەغۆل بووە، هەربۆیەشە بە ئازایەتی و بوێری و توانای بەرگری و سوارچاکی و تیر ئەندازی ناوبانگییان دەرکردبوو[٢٢]، بۆیە لە شەڕەکاندا رۆڵی گرنگیان دەگێڕاو ژمارەیان یەکجار زۆر بوو[٢٣]، نهێنییەکی سەرکەوتنیشیان بۆ خێرایی لە هەڵکوتانە سەر دوژمن و خێرایی لە تیر هاویشتن و توندوتۆڵیی جەنگیان بووە[٢٤].

ئەمەش بەو مانایە نییە، کە هێزی پیادەیان فەرامۆش کردبێت، بەتایبەت لە مەیدانی شەڕدا ئەمانە ئەرکی کوشتارو قورسایی شەڕو جەنگیان لەسەر شان بوو، لەکاتی تەنگانەو پێویستدا یارمەتی هێزی سوارەیان دەدا، دەبوونە پارێزەری پاشکۆی هێزو دوژمنیان لە خەندەق و سەنگەرەکان وەدەردەنا، ئەرکی پاراستنی خاروبارو ئازووقەشیان لە ئەستۆ بوو[٢٥]، ژنیش لەناو سوپای مەغۆلەکاندا وەك جەنگاوەر رۆڵی زۆری گێڕاوە، وەك پیاوان دەجەنگان و ئازایییەکی زۆریان نواندووە[٢٦]، هەر ئەمەش وایکردووە شالاوی مەغۆلەکان تۆقێنەرتر بێت و کاریگەریی زیاتر لەسەر دەروونی دوژمنەکانیان بکات، چونکە پێگەی ئافرەتەکانیان وەکو پیاوەکان بوو لە ئەرکە قورسەکانیشدا بەشداربوون بەتایبەتی لە شەڕەکاندا[٢٧] ئەوەتا (ابن الاثیر) کە هاوسەردەمی بەشێك لە ڕووداوەکانە

ئاماژەی بۆ ئـەوە کـردووە، کـە جـەنگاوەرێکی ژنـی تەتـەرەکان چـەندین کەسـی کوشتووە و خەڵك وایان زانیوە هەر پیاوە[28]، یاسـای مـەغۆلیش (یاسـق) لەسـەر ژنـانی مــەغۆلی پێویســت کردبــوو، کــە دەبێــت ئــەرك و فەرمانــە ســەختەکانی مێردەکانیان لە کاتی پێویستدا ئەنجام بدەن[29].

هەرچی شێواز و جـۆر و ئـامرازی چەکیشـە، ئـەوا بـەپێی شـوێن و جیـاوازی جەنگاوەران دەگۆڕا، لە ئابلۆقەدان و پەلامار و سەراسوێ کردن، بەگشـتی یـەکێك لەم شێوازە باوانەی کە لەسەری ڕاهـاتبوون، بـریتی بـوو لـە سیسـتەمی سـێ یـان پێنج هێزەکی، کە لە ژمارەی بەشەکانی لەشکرەوە هـاتووە، کـە بـریتی بـوون لـە ڕاست و چەپ و ناوەڕاست (دڵ– بەرسنگی سوپا)، بەرسـنگی سوپاشـیان بەسـەر پێشەکی و پاشکۆدا دابەش کردبوو[30]، دەستەی ڕاست و چەپ لـەکاتی پـەلاماردا کارسازیی زۆریان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد و لە ڕووی تواناوە یەکسان بوون و بەیەك ئاست و لـە یـەك کاتـدا پـەلاماریان بـۆ سـەر دوژمـن دەسـت پێدەکرد، بەرسـنگی سوپاش چاوەڕوانی فەرمان بوون، لەکاتی ئەگەری لاوازی هەریـەك لـە دەسـتەکان بۆ یارمەتیدانیان، هەندێ جاریش بەپێی شەڕەکان خۆشیان ڕووبـەڕووی قورسـایی شەڕ دەبوونەوە[31].

هەرچەندە یەکلاکردنەوە و سەرکەوتن و سەرنەکەوتنیش لە شەڕدا، بەشێکی زۆری پەیوەنـدی بــە هونــەری جەنگــەوە هەیــە، بــەڵام چــەك و ئامرازەکانیشــی بنچـینەیەکی گرنگـی جـەنگن، کـە ڕادەی سـوود لـێ بینینیـان پەیوەنـدی بـە چەندایەتی چلۆنایەتیەوە هەیە، وەك نەریت و سروشتی هێزەکانی سەردەمەکەیان چەکەکانی مەغۆلەکانیش بریتی بوون لە شمشێری نووك تیژو تیری نووکی پـۆڵاین و کەوان و ڕم و چەقۆو قەڵغانو چەند ئامرازیکی تری جەنگی[32]، جـەنگاوەرانیش دەستبەندی ئاسنینیان لە مەچەك دەکردو کڵاوی ئاسنینیان لە سـەر دەنـاو زرێـی ئەڵقەئەڵقـەیان لەبـەر دەکـرد بـۆ خۆپاراسـتن، زینـی ئاسـنین و چەرمیشـیان لـە ئەسـپەکانیان دەکـرد بـۆ پاراسـتنیان لـە زەبـری شمشـێر و تـیری دوژمـن[33]، جەنگاوەران جگە لەمانە توورەکەیـەکی لـە چـەرم دروسـتکراویان یـان سـندووقێك وەك کۆڵەپشت هەڵدەگرت، کە پێویسـتییەکانی وەك خـواردنی پێویسـت و چـەکی سووك و تـیرو داو و خێـت و سـووژن و چـەقۆی تێـدا بـوو، تـا لـەکاتی پێویسـتدا

بەکارییبهێنن، هەموو سەربازێکیش بەپێی یاسای جەنگی مەغۆل لەسەری پێویست کرابـوو، لـە هـەموو ئەمانـەش بـەرپرس بـوو[٣٤]، هەنـدێ جـاریش سـوودیان لـەو توورەکـە لـە پێسـت و چـەرمە دروسـتکراوانە وەردەگـرت فوویـان تێـدەکردن بـۆ پاراستنی جلوبەرگ و کەلوپەلەکانیان لە کاتی پەڕینـەوە لـە چـەم و رووبارەکـان، ئەمە جگە لەوەی کە سوودیان لە پێستی ئاژەڵ وەردەگرت کە لەماوەیەکی کەمدا لە دار و تەختە لـە شـێوەی حەوزێکدا بەلـەمێکی بچـووکیان دروسـت دەکـردو بـە پێستە ناوەکەیان دادەپۆشی، کەلوپەلەکانیان دەخستە ناو پاشـان بـە پەتێکـەوە جەنگاوەران یەکتریان ڕادەکێشا، بەم هۆیەشـەوە لـە ماوەیـەکی کـەم ژمارەیـەکی زۆر جـەنگاوەر دەپەڕینـەوە[٣٥]، پـاچ و چەکوشیشـیان وەك ئـامرازی هەڵکەنـدنی خەندەق سوود لێوەردەگرت، مەنجەنیق و ( عـرادة)[٣٦] شـیان وەك ئـامرازی بـەرد هاویشـــتن و ئابلۆقـــەدان و ئاگرتێبـــەردان و ڕمانـــدنی شـــوورە و قـــەڵاکان بـەکاردەهێنا[٣٧]، هەرچـی هونـەر و شـێوازەکانی شـەڕی بـوو، ئـەوا مەغۆلـەکان چـەندین شـێوازو تـاکتیکی جیاوازیـان لـە پێنـاو مـل پێکەچـکردنی دوژمنـەکانیان بەکارهێناوە، سروشتی شەڕەکانیشیان بەپێی تاکتیکی جەنگی دەگۆڕا، لەوانـەش پیـادەکرنی جـەنگی دەروونـی، کـە جێگـای مەبەسـتی ئێمەیـە، لەبەرئـەوە بـە پێویستی دەزانین سەرەتا بەکورتی باسـی چـەمك و شـێوازەکانی بکـەین، پاشـان پیادەکردنی لە گرتنی قەڵا و شارە کوردییەکاندا بخەینە ڕوو.

### ب- جەنگی دەروونی و شێوازەکانی:

جەنگی دەروونی هەرچەندە لە پراکتیکدا مێژوویەکی قووڵی هەیـە، بـەڵام بـە زاراوە نوێیە[٣٨]، بۆیـە لـە ڕاسـتیدا پێناسـەکردنی کـارێکی ئاسـان نییـە، چـونکە چـەندین زاراوەی جیاجیـای بـۆ بـەکار هێنـراوە لـە جـەنگی ( ئـیرادە، دەروونـی ، عـەقڵ، سـپی، پروپاگەنـدە، بـیرورا، فێڵبـازی....)[٣٩]، هـەر توێـژەرەش لـە ڕوانگەیەکەوە پێناسە و شیکاری بۆ کردووە، کە دەکرێت بـەکورتی ئاماژەیـان بـۆ بکەین، لەوانـە توێـژەرێك وای ناسـاندووە، کـە دەڵـێ: ((بریتییـە لـە بـەکارهێنانی پروپاگەنـدە لـە دژی دوژمـن لەگـەڵ چـەند ڕێـوڕەسمێکی تـردا، کـە سروشـتێکی سـەربازی و ئـابووری و رامیـاری پێویسـتە بـۆ پروپاگەنـدە))[٤٠]، یـان بریتییـە لـە سەپاندنی ویستی خـۆت بەسـەر دوژمنـدا، بـە بـێ بـەکارهێنانی هێـزی سـەربازی،

بەڵکو بەکارهێنانی ڕێگاو شێوازی دیکە، لە پێناو کارکردنەسەر عەقڵ و لایەنی دەروونییان، بەدروستکردنی گومان و هەندێ جاریش ورووژاندنی هەستی دوژمنایەتی بۆ مەبەستێکی دیاریکراو، یان بریتییە لە بەکارهێنانی هەر ئامرازێك بە مەبەستی کاریگەری دروستکردن لەسەر باوەڕ و لایەنی مەعنەویی بەرامبەر، بۆ گۆڕینی مەیل و ئیرادەی بەمەبەستێکی سەربازیی دیاریکراو، ئەمەش لەپێش جەنگ و لەکات و دوای جەنگیش ئەنجامدەدرێت، ناکەوێتە ژێر سانسۆر و نەریت و یاسای جەنگەوە، پرۆسەیەکی بەردەوامە و خۆی لە بێبەشکردنی دوژمن لە پێویستییە سەرەتاییەکانی ژیان و بڕینی ئاو و خۆراك و ئابلۆقەشدا دەبینێتەوە، کە بەرامبەر بە مەدەنییەکانیش ئەنجام دەدرێت، بە مەبەستی لاوازکردنی گیانی بەرگری و ترس و تۆقاندن[٤١]، هەروەکو کە لە ناکاو بەسەردادان و تارومارکردنی دوژمن کاریگەریی زۆری هەیە لە تێکدانی دەروونیان و نەهێشتنی گیانی بەرەنگار بوونەوە تیایاندا.[٤٢] هەموو ئەمانەش لەگەڵ پیشەی مەغۆلەکان دەگونجێت لە ئابلۆقەدان و سووتاندن و تێکدانی ڕەزو باخ و کاولکردندا، کە دواتر باسی لێوە دەکەین.

ڕەنگە ئەنجامەکانی ئەم جۆرە جەنگە نادیار و درێژ مەودابن، بەڵام گریمانەکانی شکستی کەمن، لە کاتێکی دوور یان نزیکدا کاریگەرییەکانی دەردەکەون، هەر بۆ نموونە کاریگەرییەکانی ئەو جەنگە دەروونییەی کە سوپای مەغۆل لە ئابلۆقەدانی شارو قەڵاکانی کوردستاندا پەیڕەویان کرد، لە نموونەی قەڵای هەولێر (اربل)و میافارقین و ماردین...هتد، هەرچەندە چەند بارە بوونەوە و درێژەیان کێشا، هەر ئەو کوشتوبڕ و ڕەشە کوژییەش بوو، کە سەرئەنجامی خراپی لەسەر دانیشتوان بەجێهێشت[٤٣]، هەرچۆنێك بێت ناکرێت کاریگەریی ئەم جەنگە لە سەرکەوتنەکانی سوپای مەغۆلدا فەرامۆش بکرێت، هەروەك سەرکەوتنی هەر هێزێکیش بە دوو فاکتەرەوە بەستراوەتەوە، لە بەهێزیی سوپاکە و جۆری چەك و کارامەیی لە بەکارهێنانیدا، دووەمیشیان هۆی شاراوە، کە ئەمڕۆ بە جەنگی دەروونی ناودەبرێت[٤٤].

لە ڕاستیدا جەنگی دەروونی چەندین جۆرو شێوازی جیاوازی هەیە، کە دەکرێت هەر یەکەیان بە ڕێگای جیاواز جێبەجێ بکرێت و ئەو ئامانجانەی لە

پێناویدا پیادە دەکرێت بەدی بهێنرێن، بە چاوخشاندن بە مێژووی سیاسی و سەربازیی مەغۆلەکاندا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە وەك ئەندازیارێکی سەربازی سەرکەتوو هەر لە سەرەتای چالاکییە سەربازییەکان و هەوڵە سەرەتاییەکانی جەنگیزخانەوە بەشێکی زۆر لەو شێواز و ڕێگایانەیان ئەزموون کردووە[٤٥]، بە جۆرێك کە سەیری رووداوەکان دەکەیت بە وتە بەناوبانگەکانی بیریاری بەناوبانگی چینی (سون تزو)[٤٦] بەراوردیان دەکەیت، واپێدەچێت سوودی زۆریان لە تێڕوانین و بیرۆکەکانی وەرگرتبێت، هەربۆیە لە تەوەرەی داهاتوودا بە پشتبەستن بە بەڵگە مێژووییەکان بەکورتی باس لە گرنگترین شێوازەکانی جەنگی دەروونیی مەغۆلەکان دەکەین و ئەنجامەکانی شرۆڤە دەکەین.

**تەوەری دووەم/**

**رۆڵی جەنگی دەروونی لە گرتنی قەڵا و شارە کوردنشینەکاندا:**

مەغۆلەکان لە ماوەیەکی کورتدا توانییان هەرێمگەلێکی بەرفراوانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی داگیر بکەن، (ابن ألاثیر) کە هاوسەردەمی بەشێك لە رووداوەکانە سەرسامیی خۆی نەشاردۆتەوە، لەوەی کە بەو ماوە کەمە ئەو پانتاییە بەرفراوانە ببڕن و کاول و وێرانی بکەن[٤٧]، کوردستان هاوشێوەی هەرێمەکانی تر کەوتە بەر شاڵاوەکانی مەغۆل، شارە کوردییەکان بۆ زیاتر لە جارێك و لە کاتی جیاجیادا ڕووبەڕووی هێرش و پەلاماری ئەوان بوونەوە[٤٨]، لەراستیدا ڕێگا و شێوازی جیاوازیان لە پێناو داگیرکردنی قەڵا و شارەکاندا گرتەبەر، کوردیش نەبەردیی زۆری نواندووە لە بەرگریکردن و پاراستنیان[٤٩]، نموونەی جەربەزەیی و ئازایەتی وایان نیشانداوە، کە (الهمذاني) مێژوو نووسی دەرباری مەغۆلەکانیش نەیتوانیوە خۆیان لێ نەبان بکات[٥٠]، بێگومان دەکرێت هۆکارێکی گرنگی پەنابردنی مەغۆل بۆ جەنگی دەروونی بەرامبەر بە کورد کاردانەوەی توندیان بووبێت بەرامبەر بەخۆڕاگرییان، کە سەرکەوتوو نەبوون لە شەڕی مەیدانخوازی لەگرتنی قەڵا و ناوچە سەختەکاندا، ناووناوبانگی ئازایەتی جەنگاوەرانی کوردیشیان بیستبوو، ئەوەتا (منگۆ خان) لەکاتی بەڕێکردنی لەشکری لە ژمارە نەهاتووی هۆلاکۆدا بۆ سەر ئێران ئامۆژگاری دەکات خۆی لە

ڕووبەڕووبوونەوەی کوردەکـان بپارێزێـت[٥١]، کـە پێدەچێت بـەرگرییان کردبێـت و مەغۆڵـــەکان نـــەیانتوانیبێت بـــە جـــەنگی دەروونـــی و ترســـاندنیان ناچـــاری خۆبەدەستەوەدانیان بکەن و ورەیان بڕووخێنن، چونکە ئەوان زۆرجار پێش شەڕو کات و دوای شەڕیش بە شێوازی جیاجیا پەنایان بۆ ئەو جۆرە جەنگە بردووە، کە جێگای مەبەستی ئێمەیە بە پشتبەستن بە بەڵگە مێژووییـەکان بـەکورتی تیشـکی بخەینە سەر.

یـەکێك لـەو شـێوانەی کـە مەغۆڵـەکان هەرلەسـەرەتایی فراوانخوازییـەکانیان پیادەیان کردووە و ناوبانگییان پێدەرکردووە، بریتی بووە لە بڵاوکردنەوەی تـرس و تۆقانـدن، سـەرەتای هەڵمەتەکانیشـیان بـە کوشـتن و بـڕین و تـاڵانکردن و کاولکردن دەست پێکرد، بەم جۆرە کارانەشیان ناوبانگییـان بـە لافـاوی مـەرگهێن دەرکرد و ترس و دڵەڕاوکێی زۆریان خستە دڵـی نـەك تـەنها خـەڵکی هەڕەمـەکی، بەڵکو کاریگەریی خراپیشیان لەسەر دەروونی هێزی سەربازی نەیارەکانیشـیان بـە جێهێشت[٥٢]، ئەمەش پتر بۆ خێرایی و جەربـەزەییان دەگەڕایـەوە بەتایبـەتی لـە پشتبەستنیان بە ئەسپی زۆر، چونکە هـەر جـەنگاوەرێکیان سـێ تـا چـوار وڵاخـی پێبـوو، ئەمـە وایکردبـوو لـە هێرشـکردن ماندوونـەبن، هـەتا سـەرکردەیەکیان گوتوویەتی: ئەگەر ئەسپەکان مردن، منیش مردووم، ئەگەر ئـەوان بمێـنن، منـیش دەمێـنم.[٥٣] بۆیـە مەغۆڵـەکان هـەر لەسـەرەتای هێرشـەکانیان بـەرەو ڕۆژهـەڵاتی ئیسلامی وایان نیشاندا کە هێزێکی لەڕادەبەدەریان هەیە و بە ئەسپی بێشومارەوە هاتوون دەشت و بیابانەکانیان لە ماوەیەکی کەمدا تەی کردووە،[٥٤] وە پەیگیرانـە کاریـانکرد بۆئـەوەی بـەرەی دوژمنـەکانیان پـەرت بکـەن و دڕدۆنگیـان بکـەن لـە باوەڕبەخۆبوون، بۆیە بەئاسانی دەیانکردنە ئامانجی خۆیان،[٥٥] دیـارە کـاری لـەم چەشـنەش پێویسـتی بـەوە هـەبوو کـە وێنـەی بەرامبـەری نـەیار یـان دوژمـن، بەشێوەیەك بشێوێنرێت، کە بە ئاسـانی بکرێتـە ئامـانجێکی ڕەوا.[٥٦] کـە ئەمـەش فاکتـەرێکی کاریگـەری دەروونـی بـوو، گـەرموگوڕی بـەرگریکردنی لای هێـزە موسوڵمانەکان دەپووکاندەوە.

مەغۆڵـەکان جیاوازیشـیان لـە نێـوان کەسـدا نـەدەکرد هـەموو شـێوازێکی دڕندانەیان بەکاردەهێنا، ئەمەشیان بوو بە باوەڕێك لای خەڵك، کە هەرگیز شکست

و دۆڕان ناناسن[٥٧]، هێزی هەرە بەکاری ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی ئەوکات کە خوارزمییەکان بوون و – وەکو هۆکاری کاریگەری راکێشانی سوپای مەغۆلەکان بۆجیهانی ئیسلامی دەناسرێن پاش کوشتنی بازرگانەکانیان[٥٨] – نەیانتوانی بەرگری بەبڕشتانە لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بکەن، بەڵکو لەژێر فشاری مەغۆلەکاندا، بەرەو ناوچەکانی کوردستان کشان و لەوێش بەوێرانکاری و تۆقاندنی خەڵك، کاریگەری زۆر خراپیان لەسەر دەروون و مۆراڵیان کرد، بۆیە لەلایەن مێژوونووسێکی هاوچەرخی سەردەمەکەوە و لەسەر زاری پیرێژنێکی خەڵکی ناوچەکانی باکووری هەرێمی جزیرە یادداشت کراوە کە ئەگەر جلێکی مەغۆلەکان فرێبدرێتە نێو هەزاران جەنگاوەری خوارزمی بەچەشنێك لە مەغۆل تۆقیون هەر هەموویان ڕادەکەن و خۆیان ڕاناگرن،[٥٩] ئەمانەش هۆکار بوون بۆ داگیرکردنی دڵ و دەروون و باوەڕو ئیرادەی خەڵك بەر لەداگیرکردنی وڵاتەکانیان[٦٠]، ئەم جۆرە کارانەشیان بەرامبەر بە شارەکانی کوردستان ئەنجامدا، کاریگەریی خراپیشیان لەسەر دەروون و گیانی بەرگریی خەڵك بەجێهێشت، بازرگانێکی رزگاربوو لەدەستی کوشتاری مەغۆل گێڕاویەتەوە، کە تەنها لە ئامەد پازدە هەزار لاشەیان ژماردووە، خەڵکەکە بە شێوەیەك پەشۆکاو و تۆقیبوون و ورەیان بەردابوو، کە زاتیان نەدەکرد لە مەغۆل بێنە دەنگ و بەرگری بکەن، هەتا لە دەرووێکدا (تەنگەبەرێك) جەنگاوەرێکی مەغۆل چەندان کەسی یەك بەدوای یەکدا کوشتووە یەك کەس زاتی نەبوو دەست بکاتەوە و پەلاماری بدات[٦١]، ئەم کردەوانەش هیچ ئامانجێکی دیاریکراویان لە پشتەوە نەبوو، جگە لە چاوترساندن و تۆقاندن نەبێت، ئەو جەنگە کتوپڕ و خێرایانە وەك جەنگێکی داچۆڕاندن وابوون، کە خەڵکیان پێی لاواز دەکرد و خۆیان بە بەهێز پیشاندەدا، زەمینەسازی بوون بۆ ئەو جەنگە مەزن و گشتگیرەی کە لە داهاتوودا بەرپایان کرد[٦٢].

هەندێ جار یەك لەو تاکتیکانەی مەغۆلەکان لە بەڕێوەبردنی جەنگی دەروونی دەرهەق بە دوژمنەکانیان پەیڕەویان دەکرد ئەوە بوو، کە لەو ناوچانەی کە دەیانگرت بەهۆی ڕەشەکوژی و ئەتککردنی ژن و منداڵیان تۆقاندنیان تێدا بڵاو دەکردەوە، هەر بەمەبەست هەموو خەڵکەکەیان نەدەکوشت بەڵکو هەندێکیان بەردەدان بۆ ئەوەی گەیەنەری هەواڵی دڕندەیی مەغۆلەکان بن بەشار و ناوچەکانی

دیکە[٦٣]، بۆیە بەبێ ئەوەی پێی بزانن جێبەجێکارێکی بێ بەرامبەری جەنگی دەروونیی ئەوان بوون، هەروەتر گەیشتنی هەواڵی ئاکار توندی و خوێنرێژیی مەغۆلەکان بە ناوچە کوردنشینەکان دوای هێرشەکانیان بۆ ڕۆژهەلاتی ئیسلامی جۆرێکی دیکەی پیادەکردنی جەنگی دەروونی بوو، جا ئەمە چ لە ڕێی بازرگانانەوەبێ یان ئەو زانایانەی گەشتی زانستییان دەکرد یان بەهۆی سەفەرکەر و گەڕیدان، هەروەکو پێدەچێت گەڕیدە و وڵاتناسێکی وەکو یاقووتی حەمەوی (م٦٢٦ک/١٢٢٩ز) کە ماوەیەك لە خوارزم بووە[٦٤]، بەهۆی هێرشی مەغۆلەکان بۆ ڕۆژهەلاتی ئیسلامی و لەترسی ئەوان ئەوێی بەجێهێشتووە دواتر هاتۆتە هەولێر[٦٥]، لەم بارەیەوە مێژوونووس ئیبن خەلەکان لەباسی ژینناmەی یاقووت وە ئەوەی بەسەری هاتووە بەهۆی هێرشی مەغۆلەکان نووسیویە: ((فانهزم بنفسه كبعثه يوم الحشر من رمسه ، وقاسى في طريقه من المضايقة والتعب ماكان يكل عن شرحه .. ))[٦٦] هەر لەم بارەیەوە یاقووتی حەمەوی دوای ڕاکردنی لەدڕندەیی مەغۆلەکان و گەیشتنی بە موسڵ نامەی بۆ هاوڕێیەکی نووسیوە باسی گەورەیی کارەساتەکەی کردووە و مەغۆلەکانی بە ئەهلی کوفر و ئیلحاد ناوزەد کردووە و نووسیویە: (( فإنا لله وإنا إليه راجعون من حادثة تقصم الظهر، وتهدم العمر، وتفت في العضد، وتوهي الجلد، وتضاعف الكمد، وتشيب الوليد...))[٦٧]، بێگومان نامەی لەم شێوەیە و بڵاوکردنەوەی هەواڵی هێرشی مەغۆل و توندوتیژییەکانیان و ئەو وێرانکارییەی کە کردوویانە، کاریگەریی زۆری لەسەر خەڵکی ناوچەی هەولێر هەبووە و بەشێوەیەك لە شێوەکان کۆمەکی بە بڵاوکردنەوەی ترس و تۆقین لەنێو خەڵکی کردووە.

ئیدی بەم شێوەیە دەبینین کە ئەو ترس و دڵەڕاوکێیەی مەغۆل لەکاتی شاڵاوەکانیان بڵاویان دەکردەوە، جا بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، ڕۆڵی جەنگی دەروونی دەبینی، بۆیە هەندێك لە مێژوونووسان وای بۆ دەچن کە ئەو پڕوپاگەندانە و دروستکردنی جۆرێك لە ئەفسانە سەبارەت بە سوپای مەغۆل کە لە شکان نەهاتووە، پێش شمشێرەکان، زەبری لە دوژمنەکانیان داوە[٦٨]، چونکە هێرشەکانیان جگە لە نەهامەتی و وێرانی و مردن و لەناوبردنی ئاوەدانی و شارستانی هیچی دیکەی لێ چاوەڕوان نەدەکرا[٦٩]، بۆیە بەرەبەرە ئەوە لەلای

خەڵکی دەچەسپا کە لە ڕووبەڕووبوونەوەی مەغۆل چارەیان نییە و لەگەڵ هێزێکی نابەرابەر دەرگیرن، ئەمەش کاریگەری لەسەر لاوازکردنی گیانی بەرەنگاربوونەوەیان هەبوو دەروونی ناجێگیر دەکردن و هیوایان نەك هەر بۆ سەرکەوتن بەڵکو، بۆ ڕزگاربوونیش لاواز دەکردن.

مێژوونووسێکی وەکو (إبن الأثیر) لەباسی خۆڕاگریی مەغۆلەکان و خۆڕاکیان و خێراییيان لە شەڕدا وای وێناکردوون کە زۆر بەهێز و وێرانکەر و بێڕەزان[٧٠]، کە بۆ خۆی پێڕانەگەیی لە ناوچەکانی هەرێمی جزیرە، کە ئەوی لێ ژیاوە، شاڵاوەکانی مەغۆل ببینێ و کۆچی دوایی کرد، بۆیە ئەوەی نووسیویە هەر لە دوورەوە لەژێر کاریگەریی باس و پڕوپاگەندەی خەڵکی باسی کردوون، بۆیە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەشداربووە لەو جەنگە دەروونییەی مەغۆلەکان دەستیان پێکردبوو، ئیدی بانگەشەی مەغۆلەکان کاریگەریی خۆی بەشێوەی جیاجیا دەردەکەوت و هەندێك لە شار و ناوچەکان بەبیستنی هەواڵی هاتنی مەغۆل یان شاریان چۆل دەکرد یان تەسلیمیان دەکرد بەبێ شەڕ و بەئاسانی[٧١]، خەڵك لەڕێی خوێندنەوەی ئەو نووسراوانە و یان بیستنی ئەو هەواڵانە زیاتر ترساون و پتر دێوی مەغۆلیان لێ بووە بە ڕاستی، هەتا ئەو هەواڵانەش کە لەسەر شێوەی دەموچاوی مەغۆلیش بڵاودەبوونەوە، پرۆپاگەندەیەك بوون کە زیاتر ترسی دەخستە دڵی خەڵك.

هەواڵگریی دیدەوانی و سۆسەکاری یەکێکە لە هونەرەکانی جەنگ، کە هەموو دەوڵەتان پەنایان بۆ بردووە و دەبەن، لەوانەش مەغۆلەکان، کە لە سیستەمی ئەواندا بە (یام) ناسرابوو کە زۆر تۆکمە بوو زەمینەی بۆ هێرشە سەربازییەکان دەڕەخساند و دەیانتوانی ڕۆژانە لە دووری ٢٠٠ تا ٣٠٠ میل هەواڵیان پێبگات[٧٢]، کە بەر لە هەر پەلامارێك بۆ مەبەستی جیاجیا پەنایان بۆ دەبرد، کە مەبەست لێی کۆکردنەوەی زانیارییە لە مەڕ دوژمن و گەیشتنە بە هەواڵگیری سەربازی، بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر توانای سەربازی و ویست و ئیرادەی شەڕ و حەشارگە و تۆپۆگرافیای ناوچەکان کۆبکرێتەوە[٧٣]، ئەمەش لە ڕێگای پێشەنگەکانی سوپاوە (طلائع الجیش – یزك) ئەنجامدەدرا، کە دەبوایە سەرکردەی پێشەنگ سوارچاکێکی باوەڕپێکراو بێت، ئەرکیان بریتی بوو لە کۆکردنەوەی دەنگوباسی

دوژمـن و جموجۆڵـەکانی، ئەسپەکانیشـیان لـە جـۆرە باشـەکان بـن و خۆشـڕەو و پشـت قـایم و سـم سـاغ و سـەرکێش نـەبن، خێرایـی جووڵانـەوە و گواسـتنەوەی هەواڵەکان بەپەلە لە خەسڵەتەکانی تریان بـوو[٧٤]، ڕووداوە مێژووییـەکان ئامـاژە بۆ ئەوە دەکەن کـە ئـەم تیپانـە ئـەرکیان زۆر ڕادەپەڕانـد، لـە چـوونە نـاو شـەڕی بێزارکەر و بۆسە نانەوە و کۆکردنەوەی زانیاری و ناردنی بۆ سـەرکردایەتی بـالاّ و ترساندن و تـالاّنی و رفانـدن، ئەمـەش ئـەم جـۆرە کارانەیـە کـە مەغۆلـەکان پێـی ڕاهاتبوون، لە نموونەی هەڵمەتەکانی سەر زۆر لە شارو ناوچەکانی کوردستان، کـە هەر لە ساڵانی (٦١٨ك/ ١٢٢٠ز)وە دەستیان پێکردبوو، ئەمانەش لە چێوارچێوەی جـەنگی دەروونیـدا بـوون، بەمەبەسـتی هەراسـانکردن و ئاریشـە دروسـتکردن بـۆ بەرپرسانی ناوچەکە، بەرپاکردنی جەنگی بێزارکەرو خەریککردن و تێوەگلانـدنیان بوو بەو پەلامارە لاوەکییانـە، بـۆ سـەر لێتێکـدان و بـە ئەنقەسـت وەڕسـکردنیان، ئەمانـەش بەشـێکن لـە هونـەری جـەنگی دەروونـی، کـە هەڵبـژاردنی ڕێگەیـەکی ناڕاسـتەوخۆیە بـۆ سـەرکوێرکردنی دوژمـن و گەیشـتن بـە ئامانجـە سـەربازییە مەزنەکان[٧٥]، کە بێگومـان ئـەنجامی کاریگـەرتری ڕاسـتەوخۆی بـۆ گرتنـی بەغـدا هـەبوو، کـە ئامـانجی گـەورەی مـەغۆل بـوو، پەیتاپـەیتاش پاڵەپەسـتۆی لەشـکر کێشییەکان توندتر و فراوانتر دەبوون.

لە لایـەکی تریشـەوە کـاری سیخوڕی و سۆسـەکارییان ئەنجامـدەدا، کـە بـە هەلومـەرجی ناوچـەکە ئاشـنا دەبـوون و پەیتاپـەیتا زانیـاریی ورد و هـەواڵیان دەگەیانـدە سـەرانی مـەغۆل، دڵنیـابوون لـەوەی کـە یـەك بـەرەیی هاوئاهـەنگی ڕاستەقینە موسڵمانان کۆ ناکاتەوە، هیچ بەرنامە و هاوهەڵوێستییەك لـە نێوانیانـدا نییە و هیچ ڕێوشـوێنێك نەگیراوەتەبـەر پـێش بـە تـەکانی بـەگوڕ و فـرە بـەرەیان بگرێت و بێ باکانە خواست و مەرجەکانیان دەسەپاند[٧٦].

لە جەنگی دەروونیدا چەندین هۆکاری جۆراوجۆری ڕاگەیاندن بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی بگاتە خەڵك و کار بکاتە سەریان، کە هەوڵدەدات بۆ ڕووخانـدنی نـەیارو نەهێشتنی ورە و لەکەدارکردنی هەموو ئەو بانگەشانەی کە پشتی پێدەبەستن، بۆ بەدەستهێنانی دۆست و متمانەی بێلایەنەکان، دروستکردنی ڕق و دژایەتی دوژمـن و گۆڕینی هەواڵەکانیان بۆ پروپاگەندە، لە بەرامبەردا بەهێزکردنی بەرەی نـاوخۆو

ئاسایش و ئارامی[٧٧]، بڵاوبوونەوەی هەواڵی دابونەریت و یاسا و چالاکییەکانیان، بەو ماوە کەمە، کە جێگەی سەرسوڕمان بوو[٧٨]، بەڵگەی بە هێزییانە لەم بارەیەوە، ئەوەبوو بەشێك لە شوێنکەوتووانی تەتەر لەناو خەڵکدا باسیان لە توانـاو بەهێزی و ئامادەباشی ئەفسانەیی ئەوان دەکـرد، هەوڵیان دەدا جیاوازییەکانی نێوان مەغۆل و موسڵمانان گەورەترو زەقتر بکەنەوە، مەغۆلەکان هەر لە سەردەمی جەنگیزخانەوە ئەوەیان لە مێشکی جەنگاوەرانیاندا چەسپاندبوو کە ئەوەی ئەوان دەیکەن ویستێکی خودایی لە پشتە و یەك خودا لە ئاسمانە و دەبێ یەك فەرمانڕەواش لەسەر زەوی هەبێ کە جەنگیزخانە[٧٩]، ئەم جۆرە بیرۆکانەش لە زاری سیخوڕەکانیانەوە بڵاودەکرانەوە، کە ڕۆڵی گرنگیان لە سەرکەوتنەکانی مەغۆلدا بینیوە[٨٠]، ئەوەتا (الزين الحافظ بن المؤيد العقرباني) (م ٦٦٢ك/ ١٢٦٤ز) لە کاتێکدا نوێنەری مەلیك ناصر یوسفی ئەیووبی بوو، لە هەمانکاتدا سیخوڕی بۆ هۆلاکۆش دەکرد و، هەواڵی بۆ دەهێنا و دەبرد و لە ژێرەوە هانی دەدا کە شام داگیر بکات، هانی مەلیك ناصریشی دا کە پێشوازی لە مەلیك الکامل نەکات، چونکە هۆلاکۆ لێی دڕدۆنگ دەبێت بەرگەی پەلاماری ئەو ناگرێت[٨١]، ئەمەش بەشێك بوو لە خیانەتی ئەو کەسایەتییە.

هەر لە چوارچێوەی پروپاگەندەکانیاندا مەغۆلەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، کە هەواڵی هەموو لایەکیان پێدەگات، بەڵام هەواڵی ئەوان بەکەس ناگات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر توانای هەواڵگری و پروپاگەندەی ئەوان و باڵادەستییان لە هونەری خۆحەشاردان و سەرلێشێواندنی بەرامبەردا، تەنانەت پروپاگەندەی ئەوەیان دەکرد ئەگەر بیانەوێت وڵاتێك داگیربکەن مەرامەکەیان دەشارنەوە، تا بەیەکجار پەلاماری دەدەن و بۆی هەڵدەتۆقن بێ ئەوەی هیچ کەس پێیان بزانێت[٨٢]، سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەکات کە مەغۆلەکان پروپاگەندەی وایان دەکرد، کە جگە لە گۆشت پێویستییان بە هیچ خۆراکێکی تر نییە، گۆشتی هەموو ئاژەڵێك دەخۆن کە لەگەڵ خۆیاندان، لە مەڕ و مانگا و ئەسپ و هی دیکە، ئەسپەکانیشیان پێویستییان بە ئالیك و جۆ نییە، چونکە بە سمەکانیان زەوی دەکۆڵن و ڕەگی ڕووەکەکان دەردێنن و دەیخۆن بۆیە لەهەر شوێنێك بوون بۆ خۆیان پێداویستی خۆیان دابین دەکەن و پێویستییان بەوە نییە شمەکیان

لەدەرەوە بـۆ بێـت،[٨٣] بەتایبـەتیش چـونکە مەغۆڵـەکان بـۆ ڕۆیشـتن و ڕاکـردن و بەسەرداران دەیـانتوانی لەچـەند ڕۆژێکـی کەمـدا سـەدان میـل بـبڕن،[٨٤] بێگومـان ئەمانەش کار لە دەروونی هەڕەمـەکی خـەڵك دەکـات و بـاوەڕ دەکـەن، لەکاتێکـدا ئەوان هەر شـار و شارۆچـکەیەك داگیریـان دەکـرد ئـەوەی بەکـەڵك بوایـە تاڵانیـان دەکردو ئەویتریان دەسووتاندن و کاولیان دەکرد، بەڵام ئەو پروپاگەندانە تەنها بۆ ئـەوە بـوون هەرچـەند ئابڵۆقـەی سـەر شـارو قـەڵاکان درێـژە بکێشـێت و خـەڵك بەردەوام بن لە بەرگری، ئەوان پێویستییان بە خۆراکی ئەوان نییـە، درەنـگ بێـت یـان زوو ڕۆژێـك دێـت شـارەکان بگـرن و قـەڵاکان بـڕووخێنن، لـە لایـەکی تـریش دوورکەوتنەوەیان لە پێگە سەرەکییەکانی خۆیان، تووشی کێشەی بـێ خـۆراکی و خاروبار و تفاقی ئەسپەکانیان ناکات، چـونکە هـەروەك دەیـانوت پێویسـتییان بـە ئالیك و جۆ نییە، ئەمەش جۆرێك بوو لە جەنگی دەروونی.

هەڕەشەکردن بەدەسەڵات و هێز و نامە پڕ لە هەڕەشە ئامێزەکانیـان، پـێش هەر پەلاماردان و داگیرکردنی هەر شارێك جۆرێکی ترە لە جەنگی دەروونی[٨٥]، کە سروشـت و خەسـڵەتێکی خانـەکانی مـەغۆل بـوو، هەمیشـە بـۆ مـل پێکەچـکردنی خاوەن شار و قەڵاکان بەکاریان دەهێنا، لەم بارەیەشەوە ئامانجی خۆیان پێکاوە، بۆیە زۆر کات بەرلە هەر چالاکییەکی سەربازی بە نامە هەڕەشـە و گورەشـەکانیان لەڕووی دەروونییەوە ورەی قەڵاکانیان دەڕووخاند، لە جەنگیشدا زۆر جار سـوپای سـەرکەوتوو ئـەو سـوپایە نییـە، کـە زیـان بـە گیـان و چـەك و تەقەمـەنی دوژمـن دەگەیەنێت، بەڵکو ئەو سـوپایەیە کـە بـەر لـە بەیەکـدادانی سـەربازی بـێ ئـەوەی زیـانی بـە خـۆی بگـات، بەهـەر شـێوازێك بێـت ورەی دوژمـن دەڕووخێنێـت، بۆیـە دەگوترێت لە بنەڕەتدا شەڕ تێکۆشانێکی هونەری و مەعنەوییە[٨٦]، ئەگەر سەیری نامەکانی خانەکان و سەرکردە سەربازییەکانی مەغۆلیش بکەین پڕیەتی لەم جۆرە بابەتانە، ئەوەتا جەنگیزخان لە نامەیەکیدا بۆ مەلیکە موسڵمانەکان وەك سـیفەتی خۆی بەوە دەستی پێکردووە ((من نائب رب السماء ماسح وجه الارض ملك الشرق والغرب..))[٨٧]، ئەمەش لەوە سەرچـاوەی گرتـووە، کـە گوایـە ئـەوان هەڵبـژێراوی خواوەندن و لە ژێرچاودێری و بایـەخ پێـدانی ئـەوەوە وەك فریـادڕەس بـۆ گرتنـی زەوی نێـردراون، لـە نامەیـەکی تریـدا کـە بـۆ خـوارزم شـای نـاردووە دەڵێـت:

((..استعدوا للحرب فإني واصل اليكم))[88]، لەو نامەیەشدا کە ساڵی (٦٤٨ك/ ١٢٤٠ز) لە لایەن ئۆگوتای کوڕی جەنگیزخانەوە (٦٢٤- ٦٣٩ك/ ١٢٢٧-١٢٤١ز) بۆ شهاب الدین غازی دەسەڵاتدارانی تری ناوچەکەی نارد، داوای ملکەچی و گوێڕایەڵی و سەردانەواندنی لێکردن بۆ خاقانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا داگیرکەری زەوی، زیاتر لەوەش فەرمانی پێکردبوو کە دەبێت هەرچی قەڵا و قولەو دیواربەند و شووراکانی مەملەکەتەکەی هەیە بیانڕمێنێت[89]، کە دەبنە رێگر لەبەردەم سوپاکانیاندا لە کاتی رەتبوون بەناوچەکەدا، ئەمە جگە لە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە و چەواشەکاریی تر[90]، زۆرجاریش لە نامەکانیاندا توانای خۆیان لە شکست پێهێنانی دوژمنیاندا بە جۆرێك دەخستە ڕوو، کە لەخۆبایی بوون و بەکەم بینینیی ئەوانی تر بوو، هەروەك لە نامەیەکی هۆلاکۆدا هاتووە ((....هەموو وڵاتانمان داگیر کردووە، زەویمان لە خراپەکاری پاك کردۆتەوە، شمشێرەکانمان برووسکەن و تیرەکانمان کونکەرن، ئەسپەکانمان خێران و دڵمان وەك چیایەو ژمارەشمان وەك لمە..))[91]، ڕەنگە ئەو داواکارییانەی کە لەرێگەی نوێنەرەکانیانەوە بۆ هەریەك لە مەلیك کامل و سەعیدی خاوەنی ماردینیان نارد، کە داوای ملکەچی و گوێڕایەڵییان بۆ پاشای جیهان لێکرابوو[92]، لەم بارەیەوە نموونەیەکی دیاریتر بن، ئەم جۆرە نامانە بەجۆرێکی ئەدەبی سەرنجڕاکێش و ترسێنەر دەنووسران، کە باوەڕکردن پێیان ئاسان بوو، دەبەنگیی بەشێك لە میرەکانیش لەوەدابوو، کە ناوەرۆکی نامەکانیان نە دەشاردەوە و بۆ خەڵك ئاشکرا دەکران، بەوەش ئەوەندەی تر لە ئەنجامی هەڕەشەکانی لەشکری مەغۆل دەتۆقین، پاساوی دەدایە مەلیکەکان تا قبوڵی داگیرکاری بکەن و فەرمانەکانیان و ناوەرۆکی نامەکانیان جێبەجێ بکەن، ڕەنگە قایلبوونی بەرپرسانی هەندێ لە شارەکانی جزیرە و شام، بەناردنی پارەوپووڵ و دیاریی گرانبەها بۆ خانەکانی مەغۆل، بەڵگەیەکی دیار بێت لەم بارەیەوە، هەرچەندە ئەمەش رزگاری نەکردن لە مەترسییەکانی پەلاماری چاوەڕوانکراوی مەغۆل، هەروەك ئەو فرمانەی کە (بایجو نویان) ساڵی (٦٤٩ك/ ١٢٥١ز) بۆ یەکەیەکەی پاشایانی ئەیووبی و تورکەکانی نارد، کە بۆ هەریەکەیان بڕە دراوێکی دیاری کرد کە پێویستە بۆ خانەکانی بنێرن[93]، بارگرانی کۆکردنەوەی ئەو بڕە دراوانەش لە ئەستۆی خەڵکدا بوو، کە

بە ناوی جیاجیا لە باجی پاوان و ئاژەڵداری...بەسەریاندا سەپێنرابوو(٩٤)، ئەمەو جگە لە باجێکی تر بەناوی باجی تەتەر، کە ساڵانە بۆ هەر دەوڵەمەندێك دە درهەم و مام ناوەندێك پێنج و نەبووێك یەك درهەم وەردەگیرا(٩٥)، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئاشکراکردنی ناوەرۆکی نامەکان، ئەمانەش بەشێکن لە جەنگی ئابووری و دادۆشینی خەڵك و هۆکارێکیش بوون بۆ بێزارکردنیان لە دەسەڵاتداران، بە جۆرێك درز بخەنە پەیوەندیی نێوانیان، خۆزگە بەدەسەڵاتی بێگانە بخوازن، ئەم سیاسەتەش جۆرێکە لە سیاسەتی پەرتکە زاڵبە (فرق تسد)، کە هونەرێکە جەنگی دیاری مەغۆلەکان بووە.

لە راستیدا لە جەنگی دەروونیی هێرشبردندا چەندین تاکتیك هەن، کە بە چەند شێوازێکی جیاواز هەوڵدەدرێت بۆ دووبەرەکی نانەوە نێوان هاوڵاتیان و سەرکردە لەلایەك و هێزە لێك نزیکەکان لە لایەکی ترەوە، دروستکردنی ئاژاوەو ئاشووب لە نێو خەڵکدا یان بەکارهێنانی تاکتیکی هەڵخەڵەتاندن، بە پارە و پلەوپایە، کە دەبنە هۆکاری هەرەسی بنەماکانی بەرگری و لاوازکردنی بەرەی ناوخۆ، دەشکرێت کاربکرێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەرچی هەڤاڵبەندی و هاوپەیمانی هەیە، بە جۆرێك بواری دوژمن نەدرێت هاوپەیمانی لەگەڵ هاوتاکانیدا ببەستێت، ئەگەر هاوپەیمانیەتی و هاوسێیەتی وا هەبوو، ئەوا ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دوژمنە مەترسیدارو ئاڵۆز دەبێت، بەڵام ئەگەر لەناوخۆیاندا ناتەباو بە فێڵ و بە گێچەڵ بوون، ئەوا ڕاوکردن و زاڵبوون بەسەر ئەم تەرزە دوژمنانەدا ئاسان دەبێت(٩٦)، لە چەند لایەنێکەوە مەغۆلەکان سوودیان لەم تاکتیکە وەرگرت، لە لایەك سەرکەوتوو بوون لە ڕێگرتن لە ئەگەری پێکهێنانی هەر سوپایەکی هاوبەش لە نێوان هێزە موسڵمانەکاندا بە خەلیفەی عەباسیشەوە، کە لە ڕابواردن و بێئاگاییدا نغرۆ ببوو(٩٧)، جگە لە چەند هەوڵێکی سەرەتایی بۆ ڕێگرتن لە پەرەسەندنی پەلامارە کتوپڕەکانی سوپای مەغۆل بۆ سەر داقووق و خانەقین و شارەزوور(٩٨)، لە لایەکی ترەوە ئەگەر سەیری پیلان و ئاراستەی داگیرکردنی شار و قەڵاکانی کوردستان بکەین، دەبینین بە چەندین قۆڵ و شار بەشار پەلاماردراون، بۆئەوەی پەرتیان بکەن و لە یەکتریان دابڕن و نەپرژێنە سەر یارمەتیدانی یەکتری، هەریەکەیان لە خەمی پاراستنی خۆیدا بێت، جا بەهەر

شێوازێك بێت، ئابلۆقەکانیشیان کە وەك جەنگێکی دەروونی بەکارهێنرا ڕێگەی لە چوست و چالاکی لەم جۆرە گرت، ئەوە نەخاسمە کە خۆشیان لەبەر ملهوڕی و نەخوێندنەوە و حیساب بۆ یەکتر نەکردن، ڕێگەی لە دروستکردنی هاوپەیمانیەتێکی ناوخۆیان گرت[٩٩]، ئەمەش ئامانجێکی سەربازیی گرنگی مەغۆل بوو، تا ئەو ڕادەیەش لە نێوخۆیاندا بە فێڵ و گێچەڵ بوون، هەندێ کەس شکانی بەربەستی نێوان مەغۆل و ناوچەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی لە هەرێمی جزیرە، بە کەوتنی دەوڵەتی خوارزم و کوژرانی جلال الدین منکبرتی ( ٦٢٨ك/ ١٢٢٩ز) بە موژدە بە ( ئەشرەف موسی ئەیووبی) دەدەن، هەرچەند ئەو لەم بارەیەوە تێڕوانینی جیاوازبوو[١٠٠].

گۆڕینی ئاراستەی داگیرکارییەکانی مەغۆل و دواخستنی داگیرکردنی بەشێك لە شار و قەڵاکانی کوردستان تا دوای داگیرکردنی بەغدا و رووخاندنی خەلافەت، لە نموونەی هەولێر و ماردین و میافارقین و لوڕستان، شێوازێکی تری جەنگی دەروونی تاکتیکی بوو، بە ئامانجی دابڕینیان لە بەغدا وەك مەڵبەندی خەلافەت ئەگەرچی بەناویش بوو، بێ ئومێدکردنیان بوو لە مانەوەی خەلافەتی ئیسلامی و دەسەڵاتی روحی خەلیفە، کە ئیتر کۆتایی ئەوانیش بۆتە شتێکی حەتمی، هەر بەپێی ئەو پلانەی دایانڕشتبوو سوودیان لە لاوازیی بەرگری دەروونی و لۆجستی و ئامادەکاری خەلیفە وەرگرت[١٠١]، ئەمە لە کاتێکدا خۆیان بەدوور گرت لە گرتنی ئەو شوێنانەی کوردستان کە تائەو کاتە دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخسابوو لەبەر بەرگری و خۆبەدەستەوە نەدان، بڕینی ئەو شاخ و دۆڵ و دارستانە عاسێیانەش، کە کوردستان پێی ناسراوە[١٠٢]، هەلومەرجی شەڕی مەغۆلی قورستر دەکرد، لە هەمانکاتدا سوودیان لە پاشماوەی ئەو هێزە وەرگرت کە لە داگیرکردنی بەغدا بەکاریان هێنابوو، بۆ پێکهێنانی سوپایەکی نوێ بەسەرکردایەتی (ئەرقیتو نویان) بۆ داگیرکردنی قەڵای هەولێر، پێدەچێت هەواڵی کەوتنی بەغدا کاریگەری کردبێتە سەر (تاج الدین ابن صلایا) یان لەژێر کاریگەریی هەڕەشەکانی مەغۆل یان سیاسەتی پەرتکە زاڵدەبیت خواستی بۆ بەدەستەوەدانی قەڵا پیشاندا، بۆ دیداری ئەرتقیو هاتە خوارەوە، ئەوانیش مەرجی ڕاستگۆیان بەستەوە بە ڕادەستکردنی قەڵا، بەڵام پیاوە ئازاکانی ناو قەڵا بەرپەرچی ئەم داواکارییەیان دایەوە، ئەویش خۆی ڕادەستی ئیرادەی مەغۆل کرد[١٠٣].

هەروەها بەسەرکردایەتی چەند فەرماندەیەکی دیاریان مەغۆڵەکان سوپایان بۆ داگیرکردنی ماردین و دیاربەکر و میافارقین نارد، کە دوای ئابلۆقەدانیان بۆ ماوەیەکی زۆر، بەسوود وەرگرتن لە سیاسەتێکی لەم جۆرە (فرق تسد) سوودیان لە ئاژاوەی دوو کەس کە لە خاوەنەکانیان رەنجابوون، هەواڵی خاڵە لاوازەکانی ناو قەڵایان بۆ مەغۆلەکان گواستەوە، بە دزیشەوە پەیژەیان بۆ شۆڕکردنەوە، ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆر جەنگاوەر خۆیان خزاندە ناو قەڵا و سەرئەنجام داگیریان کرد[١٠٤]، هەروەها بەهۆی کاریگەریی ئەو دڵەڕاوکێیە و هەراسانییەی لە دڵی خەڵکیدا دروستیان کردبوو سوپای مەغۆل دوای گەمارۆدان توانییان شاری جزیرە کونترۆڵ بکەن و هەمەکارەیەکیان بەناوی (جمال الدین جولبغ ) بەسەرەوە دابنێن،[١٠٥] کاریگەریی شەڕی دەروونیی مەغۆڵەکان بە شێوازێك بوو کە وایکرد کوڕی مەلیك سەعیدی خودانی ماردین بەڕادەیەك لەبەرگریکردن لەبەرامبەر مەغۆڵەکان بێ ئومێد بووبوو ژەهر خواردکردنی باوکی و ڕادەستکردنی ماردین بە مەغۆل بەپێی هەندێك لە گێڕانەوەکان و کۆتاییهێنان بەگەمارۆدانی شارەکەی پێ باشتر بوو لە بەرگریکردن هەرچەند بیانووی خۆی هەبوو، چونکە دواتر بەخشرا و شارەکەی پێدرایەوە[١٠٦]، کە دیارە مەغۆڵەکان بەگشتی لە شەڕەکانیاندا بەپێی پێویست پشتیان بە گەمارۆدانیش دەبەست بەتایبەتی بۆ ئەو شار و قەڵایانەی ئەستەم و هەڵەمووت بوون کە ئەمەش تەکتیکێکی بەکاریان بوو زۆر بایەخیان پێدەدا[١٠٧]، بە پێودانگی سەربازیش ئەو شێوازە جەنگییەی مەغۆل پیادەیانکرد، لە شێوەی رژان و رۆیشتنی ئاوە لەگەڵ سروشتی زەویدا، ئەوانیش رژانە ناو مەملەکەتی ئیسلامی و لە بەربەستە سەختەکان خۆیان لادا و بەدەوری خاڵە لاوازەکانیدا خولیان خوارد، پاشان دەوری خاڵە عاسێ و بە هێزەکانیان دا.

ئەو جەنگە تاکتیکییانەی لە کاتی پەلاماردان و شەڕدا ئاراستە دەکرێن، زۆرجار دەبنە چەکێکی یاریدەدەر بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی کردە سەربازییەکان، ئەویش لە ڕێگەی ڕووخاندنی دەروونی دوژمن و زاڵبوون بەسەریدا، کە وایان لێبکات لە بیری خواستی بەرەنگاربوونەوەدا نەبن و ورەیان بڕووخێت[١٠٨]، لەم بارەیەوە ئابلۆقەدان (گەمارۆدان) ئەگەرچی ئابلۆقەدان زیاتر بۆ ئەو ناوچانەیە کە لە گرتن نایەن، بەڵام لای توێژەرانی ئەم بوارە بە شێوازێکی

کاریگەر لە جەنگی دەروونی دانراوە، بە سیاسەتی برسیکردن بۆ رووخاندنی ورەی هێـزی سـەربازی و دانیشـتوانی ئابڵۆقـەدراو، دیـارترین ئـەو شـێوازە تەکتیکییـە دەروونییانەیە، کە هەمیشە مەغۆلەکان لـەکاتی پـەلامارەکانیان لـە بەرامبـەر ئـەو قـەڵا و شـارانەی کـە ئامـادەی خۆبەدەسـتەوەدان نـەبوون بـەکاریان دەهێنـا، سووربوون لەسەر گەمارۆکە بێ ئەوەی ڕاستەوخۆ پەلاماری بدەن، بەم شـێوازەش دانیشتوان لە پەلوپۆ دەخات بێ ئاو و خۆراك دەمێننەوە، بەڵام پێویستە سـوپای گەمارۆدەریش ئاگاداری بارودۆخی شار و ناو قەڵا بێت، توانای ئازووقە و خۆراك و چەکی سوپای گەمارۆدراو بزانێت، کە دانیشتوان چەندەیان بەبەرەوە هەیە توانای گەمارۆکە بگرن، ئەوکاتە ئەو هەلە لە دەست نەدات و ئۆردوی خۆی تێدا هەڵبدات، لە ناکاویش هەڵمەت بەرێ و بێزار نەبێ، چونکە ئەگەر بێزار بـێ پێـی دەشـکێت و سارد دەبێتەوە و هێزی لە کزی دەدات، هەوڵبدات هەستی گـەورە پیـاوان بـۆ لای خـۆی ڕابکێشـێت و هاوسـۆزی بـۆ خەڵکەکـە دەرببڕێـت و ئـەمانیان پێبـدات[109]، ئەمـەش رێـك ئـەو سیاسـەتە بـوو کـە مەغۆلـەکان بەرامبـەر قـەڵاکانی کوردسـتان پیادەیانکرد، لەوانەش هەولێر، دوای چەند جار ئابڵۆقەدانی و درێژە کێشـانی[110]، بەتایبەتی لە سـاڵی ٦٣٣ك/١٢٣٥ز وە دواتـر سـاڵی ٦٣٥ك/١٣٧ز کـە کوشـتارێکی زۆر لە ناوچەی هەولێر کـراوە،[111] مەغۆلـەکان بەگـەمارۆدانی شـار و بـەکارهێنانی مەنجەنیق ترس و بیمێکی زۆریان لەنێو خەڵکدا بڵاوکردبۆوە،[112] بێگومان ئەوەش کاریگەریی دەروونی خۆی لەسەر خـەڵکی ناوچـەکە دانـاوە، بەتایبـەتی کـە بۆیـان دەرکەوت دوژمنی ئەوجارە جیاوازە و بەردەوام فشاریان دەخاتە سـەرو لـەکۆڵیان نابێتــەوە، هــەر بۆیــە تێبینــی دەکــەین تــا دوای گرتنــی بەغــدا جــارێکی تــر ئابڵۆقەدرایەوە و درێژە کێشانیشی زیانی زۆری بە ئـۆردوی دوژمـن و خـەڵکی نـاو قەڵا گەیاند، هەرچەندە توانییان سۆزی بەرپرسـی قـەڵا (ابـن صـلایا) بـۆ لای خـۆ ڕاکێشن بە پیشاندانی مەیلی ڕادەستکردنی قەڵا، بەڵام نـەیتوانی بـاوەڕ بـە خـەڵك بێنێت بە قایلبوون بەداواکاریی مەغۆل[113]، لێرەدا جـەنگی دەروونیـی مەغۆلـەکان بەرامبەر خەڵکی هەولێر ئەنجامی پێچەوانەی لێکەوتەوە، واتا بە شـێوازێکی دیکـە بـوو بـە هـۆی سـووربوونی زیـاتری خەڵکەکـە لەسـەر بـەرگریکردن و کۆڵنـەدان و خۆڕاگری ئەگەر بۆماوەیەکیش بووبێت.

لــە ڕاســتیدا ئــەو توندوتیــژی و کاولکارییــەی کــە مەغۆلــەکان ئەنجامیانــدا ترسێکی زۆری لەدڵی هەندێك لە سەرکردە موسڵمانەکانی دەوروبــەردا دروســتکرد، وای لێکـردن سـۆز و خۆشەویسـتی و ملکەچـیی خۆیـان بـۆ هۆلاکـۆ دەربـبڕن[١١٤]، لەوانــەش دەســەڵاتداری موســڵ (بدرالــدین لؤلــؤ) ( م ٦٦٠ك/ ١٢٦١ن)، کــە لــە چارەنووسی دەسەڵاتەکەی داهاتووی خۆی کەوتە مەترسییەوە، بوو بــە دۆســت و هاوپەیمانی مەغۆل[١١٥]، دواجاریش ئەندازیاری داگیرکردنی هەولێر[١١٦]، هەندێك لــە دەسەڵاتدارانی ئەیووبیش لە هەرێمی جزیرە، لەترسی هۆلاکۆ بێئـوّقرە بووبـوون، هەربۆیە هەندێکیان دروستکردنی هاوپەیمانەتییان بـۆ هاوکـاریکردن دژی مــەغۆل ڕەت کـردەوە، لەکاتێکـدا مەترسـییەکە ڕووی لــە هــەموویان بــوو، پێویســتی بــە دروستکردنی هاوپەیمانی هەموو لایـەك بـوو[١١٧]، بـەم تـرس و تۆقاندنـە شـەڕێکی دەروونییان بەرپاکرد، کە ئەنجامەکەی بەخراپ بەسـەر هەنـدێ لایەنـدا شـکایەوە، گــرنگترین ڕووداویــش لــە شــەڕدا ڕووخانــدنی ورەی دوژمنــە بــێ شــەڕکردن و کۆنترۆڵکردنیەتی.

ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە ئەنجامە خراپەکانی تاکتیکی گەمارۆدانەکانی مەغۆل لە ئەگەری درێژە کێشانیدا زیاتر دەردەکەون، چونکە شـار بـە پاشمـاوەی کوژراو و مردووان و ئەسپ و ئاژەڵان پیس دەبێـت، هــەوای شـار بۆگـەن دەکـات، نەخۆشی و پەتا بڵاودەبێتەوە[١١٨]، ئازووقەو تفاق و کەرەستەی سەربازی لە کزی دەدات و هێــزی گــەمارۆدراو ناچــار بــە خۆبەدەســتەوەدان یــان هەڵگەڕانــەوە دەکات[١١٩]، وەك ئەوەی مەغۆلەکان بەسەر (میافارقین)یان داهێنا، کە بـۆ مـاوەی نزیکەی دوو ساڵ درێژەی کێشا هەتا لـە سـاڵی ٦٥٨ك/١٢٦٠ز بەردەسـت کـرا[١٢٠]، جەنگی دەروونیی مەغۆلەکان لەگەڵ دانیشتوانی وێندەرێ تا ئەو ڕادەیـە کاریگـەر بوو، باوك کوڕەکەی و دایك منداڵەکەی دەخوارد تەنانەت چەرمی پێڵاوەکانیشـیان دەخوارد[١٢١]، ئەمەش نەك هەر دانیشتوان بەڵکو جەنگاوەرانیشی لە پەلوپۆ خست و جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت کەسیان ڕزگاری نەبوو، چارەنووسـی مـاردینیش باشتر نەبوو بێ ئاوی و خۆراکی و بڵاوبوونەوەی پەتا و نەخۆشی ڕۆژانـە سـەدانی دەکوشت[١٢٢]، بێنوی (مظفر الدین)ی کـوڕی مـەلیك سـەعیدیش بـۆ ڕادەسـتکردنی قەڵا و غافڵکوژکردنی باوکیشی هەر ئەوەبوو، کە وتـی مردنـی کەسـێك باشـترە لـە

سەد هەزار کەس[١٢٣]، کە لەشکری مەغۆل ڕێگەیان لە هەموو جموجۆڵێك گرتبوو لە چوونە ناو قەڵا و هاتنە دەر و گەیشتنی هیچ پێداویستییەکی سەرەتایی، کە بێگومان بێبەشکردنیان لە پێداویستییە سەرەتاییەکانی ژیان لەبڕینی ئاو و خۆراك و سووتاندن و بەردبارانکردن و دابەستنی مەنجەنیق[١٢٤]، کاریگەرترین چەکی دەروونی بوو، کە لە بەرامبەریاندا بەکارهات لەپێناو شکست پێهێنانیان و خۆبەدەستەوەدان.

مەغۆلەکان هەربەوە نەوەستان، هەر لەو نێوەندەدا بە شێوازێکی بەرفراوانتریش کاریان لەسەر لەکارخستنی هەموو جموجۆڵێکی ئابووری کرد، لە سووتاندن و رفاندن و وێرانکردنی ژێرخانی ئابووریی کوردستان، کە کارەسات و نەهامەتی زۆری لە دوای خۆی بەجێهێشت[١٢٥]، جەنگی ئابووریش یەکێکە لە جۆرە جەنگە دەروونییە کاریگەرەکان، کە هەر لەکۆنەوە هێزە نەیارەکان بەرامبەر یەکتری پیادەیانکردووە، بە شێوازی دابڕینی ئابووری و ئابلۆقە و دەستگرتن بەسەر بازاڕدا، هەموو ئەمانەش شێوەیەکی چەکی دەروونین[١٢٦]، هەر ئەو جۆرە ڕووداوانەی ئاماژەمان بۆ کردن، باشترین بەڵگەن لەسەر ڕاستیی کاریگەرییە خراپەکانی ئەم جۆرە سیاسەتە، کە مەغۆلەکان لەسەر کوردستان دروستیانکردبوو، سەرباری ئەوەی بە هۆی کردە سەربازییەکانیان چالاکیی بازرگانی پەکی کەوتبوو، رۆڵێکی خراپیشیان گێڕاو ژمارەیەکی زۆریشیان بازرگان کوشتن و سامان و کاڵاکانیان بەتاڵان بردن[١٢٧]، ئەم کارانەشیان لە زۆربەی ناوچەکاندا ئەنجامدەدا و بە هەزاران دینار زیانیان بە خەڵك دەگەیاند[١٢٨]، ئەمە لە کاتێکدا سەرباری بەکارهێنانیان لە کاری سیخوڕیدا ڕێگەیان بە بازرگانی سەر بە خۆیان دەدا کاری بازرگانی بکەن و بازاڕ قۆرغ بکەن[١٢٩]، هەموو ئەمانەش کاریگەریی خراپیان کردە سەر ڕەوشی ژیانی خەڵك و دەیان کارەسات و نەهامەتی لێکەوتۆتەوە.

هەروەك ئاماژەمان دا لە فرتوفێڵی هێزی ئابلۆقەدەر، پەنابردنیەتی بۆ هەڵخەڵەتاندن و بەڵێنی درۆ، تا هەرچۆنێك بێت کار لە دەروونی خاوەنی قەڵا و سەرکردەکان بکەن بە ڕادەستکردن و بەرگری نەکردن، لەم بارەیەشەوە تاڕادەیەك سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، ڕەنگە هەڵخەڵەتاندنی ( تکلە کوڕی

هەزار ئەسپ) فەرمانڕەوای لوڕستان[١٣٠]، کە دوای ئەوەی لە هۆلاکۆ یاخی بوو، لە ناوچەیەکی عاسێی لوڕستان خۆی قایم کرد، سوپای مەغۆل جارێك بە هەڕەشە و گوڕەشە و جارێك بە دڵدانەوە و لاواندنەوە دەیهاتنێ کە خۆی بەدەستەوە بدات، دواجاریش هۆلاکۆ بە فێڵ ئەنگوستیلەکەی خۆی بۆ نارد، کە نیشانەی لێبووردنی بوو، بەڵام دوای لێپرسینەوەیەکی کەم فەرمانی کوشتنی دا[١٣١]، حسام الدین عەکەی سەرداری دەرتەنگیش لە فێڵێکی لەم جۆرە رزگاری نەبوو، کە خۆی و خانەوادەکەی بە دەستی مەغۆل لە ناوچوون[١٣٢]، ئەم جۆرە فێڵ و تەڵەکانە بەرامبەر بەهەریەك لە مەلیك الکامل و سەعیدیش پەیڕەوکرا، بەڵام ئەوان ڕایانگەیاند کە ناکەونە ژێرباری بەڵێنە درۆکانی ئەوان، چونکە باوەڕ بەکەسێك ناکرێت، کە پێشتر بەڵێنی بەکەسانی تر داوە و نەیبردۆتە سەر[١٣٣]، ئەمانەو چەندین شێوازو ڕێگەی تری شەڕی دەروونی تر، کە لە لایەن مەغۆلەوە بەرامبەر کورد پەیڕەوکران، دەکرێت ئەمانە بکرێنە نموونەی دەیان ڕووداوی تر، کە لەبەر درێژنەبوونەوەی باسەکە باس نەکراون، ئەم تەرزانەش لە شەڕی دەروونیدا، کاریگەریی خراپیان لەسەر کورد بە جێهێشتووە هەروەك ئاماژەمان بۆ کرد.

**ئەنجام:**

١- مادام ئامانج لـە ململانێـی سـەربازی لـە نێـوان هێزەکانـدا، سـەرکەوتنی بەرەیەك بێت بەسەر بەرەیەکی تردا، ئەوا ڕێگە و شـێوازی جیـاواز دەگرنەبـەر بـۆ بەدەستهێنانی، جەنگی دەروونییش شێوازێکی کاریگەربووە، کە بەدرێژایی مێـژوو هێزەکان پەنایان بۆ بردووە لەوانەش مەغۆڵەکان کە لـەو بـوارەدا تاڕادەیـەکی زۆر سەرکەوتوو بوون.

٢- لەم توێژینەوەیەدا بەو ئەنجامە گەیشتین کە هێزو توانـای سـەربازی هـیچ سوپایەك تەنها بە ژمارەی سەرباز ناپێورێت، ئەگەر شارەزایی و هونـەری جـەنگی لەگەڵدا نەبێت، مەغۆلەکانیش لەو هێزانە بوون، کە هونەر و تاکتیکی جیاوازیان لە شەڕەکانیاندا بەکارهێناوە، هەرئەمەش بۆتە هۆی ئـەوەی بـە ماوەیـەکی زەمـەنی کەم پانتاییەکی بەرفراوان لەسەر زەویی رۆژهەڵات داگیر بکەن.

٣- مەغۆڵـەکان تـەکتیکی جیاوازیـان لـە چوارچـێوەی جـەنگی دەروونیـدا بەکارهێناوە، لە کوشتن و تۆقانـدن و بڵاوکردنـەوەی تـرس و دڵـەڕاوکێ، بەمـەش کاریگەریی خراپیان کردە سەر گیانی بـەرگری تـەواوی جیهـانی ئیسـلامی. ناوچـە کوردنشینەکانیش کەوتنە بەر کاریگەریی خراپی ئەو شێوازانەی جەنگی دەروونی، کــە بەمەبەســتی داگیرکرنــی شــار و قــەڵاکانی کوردســتان پیادەیــانکرد، لــە هەڵخەڵەتاندن و ئابلۆقەدان و ترس و تۆقاندن. جەنگی بیروبـاوەڕ و پروپاگەنـدە، بەمەبەستی گۆڕینی مەیلی بەرگری بۆ خۆبەدەستەوەدان و شکست، کە هەمیشـە داگیرکەرەکانی کوردستان بەرامبەر بەکورد ئـەزموونیان کـردووە، دەکرێـت سـوود لەم جۆرە ئەزموونانە وەربگیرێت بۆ دووبارە نەکردنەوەی خاڵە لاوازەکان.

٤- یەك لە کاریگەرترین شێوازی جەنگی دەروونیی مەغۆڵەکان لە کوردسـتان بریتی بوو لە هێرشی پچڕ پچڕ و لەناکاو ماوە کورت بۆ سەر ناوچەکانی شـارەزوور و هەولێر و داقووق و هەرێمی جزیرە بەمەبەستی ئاگـاداربوون لـە توانـای بـەرگری جــەنگاوەرانی وێنــدەرێ و هــەروەتر بــۆ تــەنگاوکردن و ســەرکوێرکردن و بڵاوکردنەوەی ترس لەنێو دانیشـتوان و بەمەبەسـتی ساردکردنەوەی گـەرموگوڕی مۆڕاڵیان و سەرەنجام لاوازکردنیان .

٥- تەکتیکی گەمارۆدان تالاّنکردنی ناوچەکان و تێکدانی ژێرخانی ئابووری هەندێك لە شار و قەلاّ کوردنشینەکانی وەکو هەولێر و میافارقین و هەندێك ناوچەی دیکە جۆرێك بوو لە وەگەڕخستنی جەنگی دەروونی لەو شەڕانەدا کە لە کۆتاییدا بەڕادەیەك تاقەت پڕووکێن بوو، بەردەستکردنی ئەو ناوچانەی لێکەوتەوە.

٦- جۆرێکی دیکەی جەنگی دەروونیی مەغۆلەکان بریتی بوو لە خاوە خاوەکردن لە گرتنی هەندێك لە ناوچە کوردنشینەکان کە نەیانتوانیبوو بەشەڕی ڕاستەوخۆ بیانگرن، ئەمەش بەمەبەستی بەکارهێنانی کات لەقازانجی خۆیان بەئاراستەی دواخستنی گرتنی ئەو ناوچانە بۆ دوای داگیرکردنی بەغدا، کە بەهۆیەوە ورەی خەڵك بەتەواوی دابەزی و وایان دەبینی بەرگریکردن لەبەرامبەر هێزێك کە سەرجەم ڕۆژهەلاّتی ئیسلامی گرتووە و بەغداشی هاتە سەر، ئیدی بێهوودەیە و کارێکی مەحاڵە.

٧- هەندێك جار کاریگەری جەنگی دەروونیی مەغۆلەکان لەڕێگای توندوتیژی و تۆقاندنەوە بەشێوەیەك بووە، کە کۆچی بەکۆمەڵی لە هەندێك دەڤەری کوردستان لێکەوتۆتەوە، بەتایبەتی کوردە شارەزوورییەکان کە ئەمەش وایکرد قەڵەمڕەوی ئەوان بەڕووی مەغۆلەکاندا والاّ بێت لەوێوە بتوانن بەئاسانی ناوچەکانی دەوروبەری داگیربکەن .

## پەراوێزەکان :

[١] تتار:یـان تـەتار گرووپێکـی خێڵـەکی ئـاکنجی رۆژهـەڵاتی مـەنگۆلیا بـوون، لـە سـەدەی دوازدەیەمی زاینی پتر نێویان دێتە نێو ناوان، لە سەرەتادا لەگـەڵ بنەماڵـە فـەرمانڕەواکانی چین هاوپەیمان بوون و نەیاری جەنگیزخان بوون، بۆیەکەم جار لەسـەدەی نۆیـەمی زاینـی لەسەرچاوە چینییەکاندا ناویـان دێـت، هـەر لـەو سەرچـاوانەدا دابەشـکراون بـۆ سـێ جـۆر: تتاری سپی، تتاری ڕەش، تتاری دڕندە، بـەڵام دواتـر جـەنگیزخان بەرەبـەرە هێنانیـە ژێـر ڕکێفی خۆی.

Buell, Paul D., Historical dictionary of the Mongol world empire,Published in the United States of America by Scarecrow Press, Inc.(Maryland:2003)p263.

[٢] ئەمانــە چــەند هــۆزێکی ســـەرەتایی بـــوون، کــە دوای شـــەڕو ململانێکــی زۆر تمــوجین (جـەنگیزخان) (لـە٦٢٤ك مـردووە) سـەرکەوتوو بـوو لـە یەکخسـتنیان و سـەرکردایەتی کردنیـــان بـــۆ دەســـتگرتن بەســـەر چـــین‌و مـــەغۆلیاو رۆژهـــەڵاتی ئیســـلامی، دواتـــریش بەسەرکردایەتی هۆلاکۆ درێژەیان بە فراوانخوازییەکانیان دا تـا داگیرکردنـی بەغـدا (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز) و کۆتاییهێنان بە خەلافەتی عەبباسی، بڕوانە: **الهمذاني**، جامع التواريخ، مج٢، ج١، نقله الى العربية محمد صادق نشأت ومحمد موسـى هنـداوي وفـؤاد عبـدالمعطي الصـياد، دار احياء الكتب العربيـة، (القـاهرة:١٩٦٠م)، ص٢٨١؛ **جعفـر حسـين الخصـباك**، العـراق في عهـد المغـول الايلخـانيين (٦٥٦-٧٣٦هــ/١٢٥٨-١٣٣٥م)، الفـتح، الادارة، الاحـوال الاقتصـادية والاحوال الاجتماعية، مطبعة العاني، (بغداد:١٩٦٨م)، ص١ ومابعد.

[٣] بـۆ زانیـاریی زیـاتر بڕوانـە: محمـد صـالح داود القـزاز، الحيـاة السياسـية في العـراق في العصـر العباسي (٥١٢-٦٥٦هـ)، مطبعة القضاء، (النجف: ١٩٧١م).

[٤] فؤاد عبدالمعطي الصـياد، المغـول في التـاريخ، دار النهضـة العربيـة، (بـيروت: د.ت)، ج١، ص ٢٥٨.

[٥] ابن العبري، تاريخ الزمان، نقله الى العربية الاب اسحق ارملة، قدم لـه جـان مـوريس فييـه، دار مشـرق، ط٢، (بـيروت: ١٩٨٦)، ص ٢٣٨؛ منصـور عبـدالحكيم، هۆلاکـۆ، و. مەشـخەڵ کەولۆسی، چاپی یەکەم، سلێمانی ، ٢٠١٠ز، ل٤٢.

[٦] الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص ٢٣٦.

[٧] القلقشندي، صبح الاعشى في صناعة الانشاء، شرحه وعلق عليه محمـد حسـين شمـس الـدين، دارالكتب العلمية ، (بيروت:١٩٨٧م)،ج٤، ص ٣١٤.

[٨] لەم بارەیەوە بڕوانە: الجوزجاني، طبقات ناصري، ترجمة وتقديم: ملكة علـي التركـي، المركـز القومي للترجمة، (القاهرة:٢٠١٢) ج٢، ص١٦٠-١٦١.

[٩] فؤاد عبدالمعطي الصياد، المغول، ج ١، ص ٣٦١.

[١٠] احمد مختار العبادي، مێـژووی ئـەیوبی و مەملوکیـەکان، و. نهـاد جـلال حبیـب الله، نـارین، چاپی یەکەم، ٢٠١٠، ل١٤٧.

[١١] الجويني، تاريخ فاتح العالم جهانگشای، ترجمة محمد التـونجي، دار المـلاح للطباعـة والنشـر، (دم:١٩٨٥م)، ج١، ص٦٣.

[١٢] عباس اقبال، تاريخ المغول، ص ١١٨.

[١٣] سون تزو، هونەری جەنگ، و. رەوف حەسەن، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٩٧.

[١٤] بۆنموونە بڕوانە: الهمذاني، جامع التواريخ (تاريخ خلفاء جنكيزخان)، ص ٥٥.

[١٥] سەید باز ئەلعرینی، مەغۆلەکان، و. شاخەوان محمد، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٥٩.

[١٦] الكامل، ج١٠، ص ٣٧٠.

[١٧] بۆ نموونە بڕوانە: الهمذاني، جامع التواريخ، مج ٢، ج١، ص٢٣٦.

[١٨] عباس اقبال، تاريخ المغول، ص ١١٣.

[١٩] بـۆ درێــژ نەبوونــەوەی بابەتەکــە دوور نەکەوتنــەوەی لــە ئامــانجی ســەرەکی باســەکە، نەمانویستووە زۆر لـەم بارەیـەوە بـدوێین، بـۆ زانیـاری بڕوانـە: فـؤاد عبـدالمعطي الصـياد، المغول، ص ٣٥٨ ومابعدها.

[٢٠] فايد حماد عاشور، العلاقات السياسـية بـين الممالـك والمغـول في الدولـة المملوكيـة الاولى، دار المعارف، (القاهرة: ١٩٧٦م)، ص ٣٤.

[٢١] ابن الطقطقي، الفخري في الاداب السلطانية والدول الاسلامية، راجعه محمد عوض وعلـي جـارم بك، مطبعة معارف، ط٢، مصر، ص٤٧.

[٢٢] سەید باز ئەلعرینی، مەغۆلەکان، ل ٤٧.

[٢٣] بۆ نموونە بڕوانە: ابن الاثير، الكامل، ج١٠، ص ٣٤١.

[٢٤] احمد مختار العبادي، مێژووی ئەیوبی و مەملوکەکان، ل ١٤٦.

[٢٥] فايد حماد عاشور، العلاقات السياسية بين الممالك والمغول، ص٣٤.

[٢٦] احمد مختار العبادي، مێژووی ئەیوبی و مەملوکیەکان، ل١٤٧.

[27] Buell, Paul D., Historical dictionary of the Mongol world empire,p192.

[٢٨] الكامل، ج١٠، ص ٣٤٨.

[٢٩] سەید باز ئەلعرینی، مەغۆلەکان، ل ٦٨.

[٣٠] الهمـذاني، جـامع التـواريخ، مـج٢، ج١، ص٣٠٥؛ محمـد فتحـی امـين، الغـزو المغـولي لـديار الاسلام، دار الاوائل، الطبعة الثانية، (دمشق:٢٠٠٧م)، ص ٨٨.

[٣١] فؤاد عبدالمعطي الصياد، المغول، ص ٣٦٢؛ محمد فتحي امين، الغزو المغولي، ص ٨٩.

[٣٢] بۆ نموونە بڕوانە: ابن الاثير، الكامل، ج١٠، ص٣٤٥، ص ٣٥١.

[٣٣] محمد فتحي امين، الغزو المغولي، ص٨٨.

[٣٤] فؤاد عبدالمعطي الصياد، المغول، ص٣٦٢؛ باز ئەلعرینی، مەغۆلەکان، ل ٦٨.

(٣٥) ابن الاثير، الكامل، ج١٠، ص٣٤٥، ص ٣٤٢.

(٣٦) عرادة: ئامرازێکی بچووکتر بوو لە مەنجەنیق، بۆ بەرد هاویشتن بەکاردەهات بەمەبەستی ڕماندنی شوورەو بەردبارانکردنی جەنگاوەرانی دوژمن لە مەودایەکی دوورەوە، ابن الفوطي، الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المائة السابعة، تحقيق مهدي النجم، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٣م)، ص٢٣٣ هامش رقم ١.

(٣٧) ابن العبري، تاريخ الزمان، ص ٢٧٧؛ ابن الفوطي، الحوادث الجامعة، ص٢٣٣.

(٣٨) بۆیەکەم جار وەك چەمکێکی سەربازی لە لایەن توێژەری سەربازی بەریتانی ( ج.س. فوللر) لە ساڵی ١٩٢٠ز دا، بەکارهێنراوە، دواتر لە ئەمریکا و وڵاتانی تر بڵاوبۆوە، بۆزانیاری بڕوانە: محمد منير حجاب، الحرب النفسية، دار الفجر، الطبعة الاولى، القاهرة، ٢٠٠٥، ص١٥.

(٣٩) بڕوانە: ئاراس فەریق زەینەڵ، جەنگی دەروونی لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبیدا (٥٦٧– ٥٨٩ك/ ١١٧١– ١١٩٣ز) توێژینەوەیەکی مێژوویی دەروونییە، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری ( ی.ن.ك)، ٢٠٠٨، ل ٢٧.

(٤٠) ئاراس فەریق زەینەڵ، جەنگی دەروونی، ل ٣٢.

(٤١) ئەمانەو چەندین پێناسەی تر بڕوانە : محمد منير حجاب، الحرب النفسية، ص١٨ ومابعد.

(٤٢) كارل فون كلاوزفيتز، الوجيز في الحرب، ترجمة: أكرم الديري و الهيثم الأيوبي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، (بيروت: ١٩٧٤) ص ١٩٧.

(٤٣) الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص ٢٩٨؛ ابن الفوطي، حوادث الجامعة، ص ٨٩.

(٤٤) ئاراس فەریق زەینەڵ، جەنگی دەروونی، ل ٤٤.

(٤٥) لە ڕاستیدا دەکرێت پێشکەوتن و دەستنیشانکردنی شێوازەکانی ئەم جەنگە، لە لایەن توێژەرانو پسپۆرانی ئەم بوارە سوود لە ئەزموونی سەربازی مێژووییانەی ڕووداوەکانی مێژووی کۆن و نوێ وەرگیرابێت، ئینجا پۆلێن کرابن و ناویان بۆ داتاشرابێت.

(٤٦) سون تزو بیریارێکی چینییە، وتەکانی لە کتێبێکدا کۆکراونەوە بەناوی ( هونەری جەنگ)، کە مێژوویەکی کۆنی هەیە، بەڵام نازانرێ ئەمانە هی خۆیەتی یان کۆکراوەی ئەزموونی مێژووی دوورو درێژی چینن، بڕوانە: هونەری جەنگ، پێشەکی وەرگێڕ، ل ١٥.

(٤٧) الكامل، ج١٠، ص ٣٣٤.

(٤٨) دیارە لەم بارەیەوە توێژینەوەی تایبەت هەن، بۆیە ئێمە مەبەستمان نییە، باسی لەشکرکێشی مەغۆل بۆ کوردستان بکەین، جگە لەوەی کە پەیوەندی بە باسەکەوە هەیە، بۆ زانیاری بڕوانە: عبدالله محمد العلياوي، كوردستان في عهد المغول (١٢٢٠–١٣٣٥)م، دراسة في تاريخ السياسي، (السليمانية: ٢٠٠٥م)؛ علي عادل حسين، إربل في الفترة (٦٣٠–٨٧٤ه/١٢٣٣–١٤٦٩م) دراسة سياسية حضارية، اطروحة دكتوراه مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة صلاح الدين، (اربيل:٢٠٠٦م).

(٤٩) لەم بارەیەوە بڕوانە: عبدالحليم عبدالله فارس العزاوي، دور الكرد في مقاومة الغزو المغولي (٦٥٦هـ/١٢٥٨م)، منشورات ديوان الوقف السني، (بغداد:٢٠١٣).

(٥٠) جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص ٢٩٨.

(٥١) جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص ٢٣٦.

(٥٢) عباس اقبال، تاريخ المغول، ص ١٠٨، ص ١٣٠؛ محمد سهيل طقوش، تاريخ المغول العظام والايلخانيين (٦٠٢-٧٧٢ه/١٢٠٦-١٣٧٠م)، دار النفائس، (بيروت: ٢٠٠٧م)، ص ٧٩.

(53) Rossabi, Morris, All the Khan"s Horses. Natural History, October 1994,p2.

(٥٤) الجوزجاني، طبقات ناصري، ترجمة وتقديم: عفاف السيد زيدان، المركز القومي للترجمة، (القاهرة: ٢٠١٣)ج١، ص٤٦٩.

(55) Stephen Turnbull, Essential Histories • Genghis Khan & the Mongol Conquests1190-1400,Osprey Publishing Ltd (Oxford :2003) p21.

(56) Jean Baechler,Outline of a Psychology of War, ResMilitaris (http:// resmilitaris. net ), vol.3, n°3, Summer/ Été 2013,p6.

(٥٧) ابن الاثير، الكامل، ج١٠، ص٣٣٦.

(٥٨) بڕوانە: سهيلا نعيمى، واقعەى اترار در منابع تاريخى دوره مغول، آموزش تاريخ، دورەى يازدهم" شماره ٣ بهار ١٣٨٩، ص٣٤-٣٨.

(٥٩) مؤلف مجهول، أخبار سلاجقة الروم، ترجمة وتقديم: محمد السعيد جمال الدين، المجلس الأعلى للثقافة، (القاهرة: ٢٠٠٧) ص٢٢٨.

(٦٠) حسين الامين، المغول بين الوثنية والنصرانية والاسلام، دارالتعارف، (بيروت: ١٩٩٣م)، ص٧٥.

(٦١) ابن الاثير، الكامل، ج١٠، ص ٤٤٨- ص٤٤٩.

(٦٢) منصور عبدالحكيم، هۆلاکۆ، ل ١٧١.

(63) Riyaz Shah AkshayJagadeesh Jing Liong, Genghis Khan's Military Dynasty (Berkeley:2011)p7.

(٦٤) بڕوانە: معجم البلدان، الطبعة الثامنة، دار صادر (بيروت: ٢٠١٠) ج٢، ص٣٩٥ - ٣٩٨.

(٦٥) بڕوانە: ابن مستوفي الإربلي، تاريخ إربل، تحقيق: محمد عثمان، دارالكتب العلمية، (بيروت:٢٠١١) ص٢٩٢.

(٦٦) وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان، تحقيق: احسان عباس، دار صادر، (بيروت: د.ت) ج٦، ص١٢٨

(٦٧) المصدر نفسه، ج٦،ص١٣٦.

(٦٨) جورج لاين، عصر المغول (سلسلة الحياة اليومية عبر التاريخ)، ترجمة: تغريد الغضبان، منشورات هيئة ابوظبي للسياحة والثقافة، (ابوظبي:٢٠١٢) ص١٧٧.

[69] Thomas T. Allsen, commodity and exchange in the Mogolempire , Cambridge university press (Cambridge:1997)p4.

[٧٠] بڕوانە: الکامل، ج١٠، ص٣٣٣-٣٤١.

[٧١] جورج لاين ، عصر المغول، ص١٧٨-١٧٩.

[72] Ricci, Aldo. The Travels of Marco Polo.: Asian Educational Services, (New Delhi 1994). p484.

[٧٣] نەبەز مەجید ئەمین، هەواڵگری لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبیدا، و. کەمال غەمبار، دەزگای وەرگێڕان، ل ١٤٥- ل١٤٦.

[٧٤] هەمان ژێدەر، ل ١٤٨.

[٧٥] سون تزو، هونەری جەنگ، ل ١٥٤.

[٧٦] زرار صدیق توفیق، کوردو کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئیسلامیدا ( ١٦- ٦٥٦ك / ٦٣٧- ١٢٥٨ز)، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٣٥٧- ٣٥٨.

[٧٧] محمد منير حجاب، الحرب النفسية، ص ١٤٨.

[٧٨] ابن الاثير، الكامل، ج١٠، ص ٣٣٤.

[79] Burgan, Michaelو Empire of the Mongols ,Chelsea House Printed in the United States of America(U.S.A:2009) P23.

[٨٠] عباس اقبال، تاريخ المغول، ص ١٣٠.

[٨١] اليونيني، ذيل مرآة الزمان، دار الكتب الاسلامية، ط١٩٩٢،٢، ج٢، ص ٧٦؛ زرار صدیق، کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئیسلامیدا، ل٣٧٥.

[٨٢] منصور عبدالحكيم، هۆلاکۆ، ل ١٧٢.

[٨٣] ابن الاثير، الكامل، ج١٠، ص٣٣٤، ص٣٥٠.

[84] Matthew Barnes ,The Mongol War Machine: How were the Mongols able to forge the largest contiguousland empire in history? Publications in Contemporary Affairs (PiCA) © 2010, http://www.thepicaproject.org, p4.

[٨٥] محمد منير، الحرب النفسية، ص ١٤٧.

[٨٦] قاسم الدويكات، الجغرافيا العسكرية، الطبعة الثانية، ٢٠٠٢، ص٤١.

[٨٧] محمد ماهر حمادة، وثائق الحروب الصليبية والغزو المغولي للعالم الاسلامي (٤٨٩-١٠٩٦هـ/١٢٠٦-١٤٠٤م)، مؤسسة الرسالة، (سوريا:١٩٧٩)، ص ٣٤٢.

[٨٨] ابن الاثير، الكامل،ج١٠، ص٣٣٧.

[٨٩] وەك بەڵگەش ابن شداد تەنها لە هەرێمی دیاربەکر زیاتر لە پەنجا قەڵای بژاردووە، الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة، ج٣، ق١، تحقيق يحيى عبادة، وزارة الثقافة والارشاد القومي، (دمشق:١٩٧٨)، ج٣، ق١، ص٢٤٦-٢٥٢؛ کەچی لە سەردەمی هەڵمەتەکانی مەغۆل زۆربەیان کاول کراون، بڕوانە : ئەولیا چەلەبی، سیاحەتنامە (کورد لە مێژووی

دراوسێکانیدا)، وەرگێڕانی سەعید ناکام، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، (بەغدا:١٩٧٩ز)، ل٦٩.

(٩٠) ابن كثير، البداية والنهاية، تحقيق ابوفضل الدمياطي احمد بن علي عبدالرحمن فهمي الزواوي، متضمنة الحكم على الاحاديث من تخريج العلامة محمد ناصر الدين الاباني، دار الجديد، (القاهرة:٢٠٠٧م)، مج٦، ج١٣، ص٢٣٧؛ سيپان حسن علي بنگلي، حصن كيفا، دراسة في تاريخها السياسي والحضاري ( ١٢٠٠– ١٣٠٠م)، دهوك، ٢٠٠٥، ص٥٨.

(٩١) بۆ درێژەی ناوەڕۆکی نامەکە بڕوانە: المقريزي، السلوك، ج٢، ص ٢٤٧ –٣٤٩.

(٩٢) الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص٣١٩، ص٣٢٤.

(٩٣) ابن شداد، الاعلاق الخطيرة ،ج٣،ق١،ج٣، ق١، ص٢٣٧؛ **سيپان** حسن علي، حصن كيفا، ص١٥٩.

(٩٤) ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص٤٥٩؛ علي عادل مراد، اربل، ص٢٥٤.

(٩٥) محمد ماهر حمادة، وثائق الحروب الصليبية، ص٣٤٣.

(٩٦) محمد منير، الحرب النفسية، ص ٧٢؛ سون تزو، هونەری جەنگ، ل ٧٢.

(٩٧) ابن كثير، مج ٦، ج١٣، ص ٢٧٧.

(٩٨) زرار صديق، كوردستان لە سەردەمی خيلافەتی ئيسلاميدا، ل٣٤٧.

(٩٩) جعفر حسين خصباك، العراق في عهد المغول الالخانيين، ص٤؛ فواد معطي الصياد، المغول، ص ٢٩١.

(١٠٠) ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، مكتبة دار الكتب المصرية، (القاهرة:١٩٣٥)، ج٦، ص ٢٧٧.

(١٠١) بۆزانیاری بڕوانە: جعفر حسين خصباك، العراق في عهد المغول الالخانيين، ص١٢ ومابعد.

(١٠٢) بدليسی، شەرەفنامە (مێژووی ماڵە میرانی کوردستان)، وەرگێڕانی هەژار، دەزگای ئاراس، چاپی سێیەم، (هەولێر:٢٠٠٦ز)، ل٢٧.

(١٠٣) الهمذاني، جامع التواريخ، مج ٢، ج١، ص٢٩٨.

(١٠٤) الهمذاني، جامع التواريخ، مج ٢، ج١، ص٣١٩؛ ابو الفداء، تاريخ ابو الفداء المسمى المختصر في اخبار البشر، علق عليه ووضع حواشيه محمود ديوب، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٩٧)، ج٢، ص٣١٣.

(١٠٥) ابن العبري، تاريخ الزمان، ص ٣٢٢–٣٢٣؛ درويش يوسف حسن هروري، بلاد هكاري ٩٤٥–١٣٣٦ دراسة سياسية حضارية، دارسپيريز، مطبعة وزارة التربية (اربيل:٢٠٠٥) ص ١٧٥.

(١٠٦) الهمذاني، جامع التواريخ، مج ٢، ج١، ص ٣٢٥– ص٣٢٦.

(107) Buell, Paul D., Historical dictionary of the Mongol world empire,p254-255.

(١٠٨) قاسم الدويكات، الجغرافيا العسكرية، ص٤١.

(١٠٩) محسن محمد حسێن، سوپای ئەیوبیان لە سەردەمی سەلاحەددیندا، و. عوسمان عەلی قادر، التفسیر، چاپی دووەم، ٢٠١٤، ل٤١٢.

(١١٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: محسن محمد حسین، أربیل في العهد الأتابكي، منشورات مكتب التفسير، طبعة مزيدة ومنقحة، (اربيل:٢٠١٤) ص١٦٩-١٧١؛ علی عادل حسین، اربل، ص٧٨.

(١١١) ابو شامة، تراجم رجال القرنين السادس والسابع المعروف بالذيل على الروضتين، عرف الكاتب وترجم للمؤلف وصححه: محمد زاهد بن الحسن الكوثري، الطبعة الثانية، دار الجيل، (بيروت: ١٩٧٤) ص١٦٥.

(١١٢) كاشاني، تاريخ اولجايتو، بإهتمام: مهين همبلي، انتشارات علمي فرهنگی (تهران:١٣٦٦) ص١٢.

(١١٣) الهمذاني، جامع التواريخ، مج ٢، ج١، ص ٢٩٨.

(١١٤) باز ئەلعەرینی، مەغۆلەکان، ل ٢٤٣.

(١١٥) لەم بارەیەوە بڕوانە: علاء محمود خليل، المغول في الموصل و الجزيرة (٦٥٦-٧٣٦ه/١٢٥٨-١٣٣٥م)، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٨٥م)، ص٤٨.

(١١٦) الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص ٢٩٨؛ سوادي عبد محمد الرويشدی، امارة الموصل في العهد بدرالدين لؤلؤ (٦٠٦-٦٦٠ه/١٢٠٩-١٢٦١م) الاحوال السياسية والعسكرية والادارية والاحوال الثقافية والاحتلال المغولي، مطبعة الارشاد، (بغداد: ١٩٧١م).

(١١٧) بۆ زانیاری لە سەر ئەم جۆرە هاوپەیمانیەتانە بگەڕێوە بۆ: موسى مصطفى ابراهيم الهسنياني، السنوات الاخيرة من حياة دولة الكورد الايوبية في مصر وبلاد الشام (٦٣٤-٦٥٨هـ/١٢٣٦-١٢٦٠م)، دراسة في العلاقات في العصر الاسلامي الوسيط، (اربيل: ٢٠٠٧م)، ص ٤١١.

(١١٨) مەهدی عوسمان حسێن هەروتی، نەهامەتی و کارەساتەکانی کوردستان لە سەدەکانی( ٦-٨ك/ ١٢-١٤ز)، تێزێکی دکتۆرای بڵاونەکراوەیە، پێشکەش بە کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین کراوە، ٢٠١٤ز، ل١٦٨.

(١١٩) محسن محمد حسێن، سوپای ئەیوبیان لە سەردەمی سەلاحەددیندا، ل٤١٠.

(١٢٠) بڕوانە: ابن واصل، مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمري، المكتبة العصرية للطباعة والنشر، (بيروت: ٢٠٠٤) ج٦، ص٢٤٧، ٢٧٥ - ٢٧٦.

(١٢١) ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص ٢٨٠؛ المقريزي، السلوك، ج١، ص ٥٠٥؛ ابن دقماق، - نزهة الانام في تاريخ الاسلام ، تحقيق سمير طبارة، المكتبة العصرية، (بيروت: دت)، ص٢٤١.

(١٢٢) ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص ٢٨٠.

[123] الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص ٣٢٦.

[124] ابن الفوطي، حوادث الجامع، ص ٩٠.

[125] لەم بارەیەوە بڕوانە: مەهدی عوسمان هەروتی، کارەسات و نەهامەتیەکانی کوردستان، ل ١٦٨ و ئەوانی تر.

[126] محمد منير، الحرب النفسية، ص ٢٤٥.

[127] ابن العبري، تاريخ الزمان، ص٢٨٢؛ وليد مصطفى نجم، الاوضاع الاقتصادية في عهد الخليفة المستعصم بالله العباسي (٦٤٠ – ٦٥٦هـ/١٢٤٢ –١٢٥٨م)، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٨٩م)، ص٨٢.

[128] ابن التغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٧، ص ٢٥.

[129] بۆ نموونە بڕوانە: ابن الفوطي، حوادث الجامعة، ص ٢٠٠.

[130] بۆ زانیاری بڕوانە: رمضان شريف زبير الداودی، لورستان الكبرى (٥٥٠–٨٢٧هـ/١١٥٥–١٤٢٤م) دراسة في احوالها السياسية والحضارية، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٤م).

[131] بەدلیسی، شەرەفنامە، ل٤٨؛ رمضان شريف، لورستان الكبرى، ص ٨٢.

[132] الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص٢٧٧؛ عبدالحليم عبدالله العزاوي، دور الكرد في مقاومة الغزو المغولي، ص٢٨٦.

[133] الهمذاني، جامع التواريخ، مج٢، ج١، ص٢١٩، ص ٢٣٤.

**لیستی سەرچاوە و ژێدەرەکان:**

**یەکەم/ سەرچاوەکان:**

أ- بەزمانی عەرەبی و وەرگێڕدراو بۆ سەر زمانی عەرەبی:


- ابن الاثير، عزالدين أبوالحسن علي بن أبي الكرم (٦٣٠هـ/١٢٣٢م).
الكامل في التاريخ، حققه واعتنى به عمر عبدالسلام التدمري، دار الكتب العربي، (بيروت:٢٠٠٦).
- ابن تغري بردي، جمال الدين ابي المحاسن يوسف (ت ٨٧٤هـ/١٤٦٩م)
النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، مكتبة دار الكتب المصرية، (القاهرة: ١٩٣٥).
- جوزجاني،القاضي منهاج السراج ابي عمر منهاج الدين عثمان (ت ٦٥٨هـ/ ١٢٦٠م)
طبقات ناصري، ترجمة وتقديم: عفاف السيد زيدان، المركز القومي للترجمة، (القاهرة: ٢٠١٣) ج١.
طبقات ناصري، ترجمة وتقديم: ملكة علي التركي، المركز القومي للترجمة، (القاهرة: ٢٠١٢) ج٢.
- ألجويني، علاءالدين عطا الملك بن بهاءالدين (ت٦٨١هـ/١٢٨٢م).
تاريخ فاتح العالم جهانگشاي، ترجمة محمد التونجي، دار الملاح للطباعة والنشر، (دم:١٩٨٥م).
- ابن خلكان، ابوالعباس شمس الدين احمد ألأربلي (ت٦٨١هـ/١٢٨٢م).
وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان، تحقيق: احسان عباس، دار صادر، (بيروت: د.ت) .
- ابن دقماق، صارم الدين ابراهيم بن محمد (ت٨٠٩هـ/١٤٠٦م).
نزهة الانام في تاريخ الاسلام، تحقيق سمير طبارة، المكتبة العصرية، (بيروت: دت).
- ابوشامة، شهاب الدين ابو محمد عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسي (ت٦٦٥هـ/١٢٦٦م).
تراجم رجال القرنين السادس والسابع المعروف بالذيل على الروضتين، عرف الكاتب وترجم للمؤلف وصححه: محمد زاهد بن الحسن الكوثري، الطبعة الثانية، دار الجيل، (بيروت: ١٩٧٤)
- ابن شداد، عزالدين محمد بن علي (ت٦٨٤هـ/١٢٨٥م).
الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة، ج٣، ق١، تحقيق يحيى عبادة، وزارة الثقافة والارشاد القومي، (دمشق: ١٩٧٨).
- ابن الطقطقي، محمد بن علي بن طبا طبا (ت٧٠٩هـ/١٣٠٩م).
الفخري في الاداب السلطانية والدول الاسلامية، راجعه محمد عوض وعلي جارم بك، مطبعة معارف، ط٢، مصر.
- ابن العبري، ابوالفرج جمال الدين بن تاج الدين الملطي (ت٦٨٥هـ/١٢٨٦م).
تاريخ الزمان، نقله الى العربية الاب اسحق ارملة، قدم له جان موريس فييه، دار مشرق، ط٢، (بيروت: ١٩٨٦).
تاريخ مختصر الدول، وقف على تصحيحه الاب انطون صالحاني اليسوعي، دار الرائد اللبناني، ط٢، (دم: ١٩٩٤).
- إبن عبدالظاهر، محي الدين ابوالفضل عبدالله (ت٧٩٢هـ/١٢٩٣م).
تشريف الأيام والعصور في سيرة الملك المنصور، حققه: مراد كامل، الشركة العربية للطباعة والنشر، (القاهرة: ١٩٦١) .

– العيني، بدرالدين محمود (ت ٨٥٥هـ/١٤٥١م).
عقد الجمان في تاريخ أهل الزمان، تحقيق: محمد محمد أمين، الهيئة المصرية العامة للكتب (القاهرة: ١٩٩٢).
– الغساني، الملك ألأشرف اسماعيل بن العباس (ت٨٠٢هـ/١٤٠٠م).
العسجد المسبوك والجوهر المحكوك في طبقات الخلفاء والملوك، تحقيق:شاكر محمود عبدالمنعم ، دار البيان (بغداد:١٩٧٥).
– ابو الفداء، عمادالدين اسماعيل بن علي (ت٧٣٢هـ/١٣٣١م).
تاريخ ابو الفداءالمسمى ب المختصر في اخبار البشر، علق عليه ووضع حواشيه محمود ديوب، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٧).
– ابن الفوطي، كمال الدين عبدالرزاق (ت٧٢٣هـ/١٣٢٣م).
الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المائة السابعة، تحقيق: مهدي النجم، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٤٢٤هـ/٢٠٠٣م).
– القلقشندي، ابوالعباس أحمد بن علي (ت٨٢١هـ/١٤١٨م).
صبح الاعشى في صناعة الانشاء، شرحه وعلق عليه محمد حسين شمس الدين، دارالكتب العلمية، (بيروت: ١٩٨٧م).
– ابن كثير، عمادالدين ابوالفدا اسماعيل بن عمر القرشي (ت٧٧٤هـ/١٣٧٢م).
البداية والنهاية، تحقيق ابوفضل الدمياطي احمد بن علي عبدالرحمن فهمي الزواوي، متضمنة الحكم على الاحاديث من تخريج العلامة محمد ناصر الدين الابـاني، دار الجديد، (القاهرة: ٢٠٠٧م).
– ابن المستوفي الإربلي، شرف الدين ابوالبركات (ت٦٣٧هـ/١٢٣٩م).
تاريخ إربل، تحقيق: محمد عثمان، دارالكتب العلمية، (بيروت: ٢٠١١) .
– المقريزي، تقي الدين احمد بن علي (ت٨٤٥هـ/١٤٤١م).
السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق محمد عبدالقادر عطا، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٧م).
– مؤلف مجهول، (تأليف الكتاب في حدود سنة ٧٦٥هـ/١٣٦٣م).
أخبار سلاجقة الروم ، ترجمة وتقديم : محمد السعيد جمال الدين، المجلس الأعلى للثقافة، (القاهرة:٢٠٠٧).
– الهمذاني، رشيدالدين فضل الله بن عماد الدولة (ت٧١٨هـ/١٣١٨م).
جامع التواريخ، مج٢، ج١، نقله الى العربية محمد صادق نشأت ومحمد موسى هنداوى وفؤاد عبدالمعطى الصياد، دار احياء الكتب العربية، (القاهرة: ١٩٦٠م).
– ابن واصل، جمال الدين محمد بن سالم (ت ٦٩٧هـ/١٢٩٨م).
مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمري، المكتبة العصرية للطباعة والنشر، (بيروت: ٢٠٠٤).
– ياقوت الحموي، شهاب الدين بن عبدالله الرومي (ت٦٢٦هـ/١٢٢٨م).
معجم البلدان، الطبعة الثامنة، دار صادر (بيروت: ٢٠١٠).

- اليونيني، قطب الدين موسى بن محمد (ت٧٢٦هـ/١٣٢٦م).
ذيل مرآة الزمان، دار الكتب الاسلامية، الطبعة الثانية، (١٩٩٢).

**ب- سەرچاوە بەزمانی فارسی:**

حمدالله مستوفي قزويني، ابو بكر بن محمد بن نصر (ت٧٥٠هـ/١٣٤٩م).
تاريخ گزيدة، بأهتمام: عبدالحسين نوائي، مؤسسة إنتشارات أمير كبير، چاپخانه سپهر، چاپ چهارم، (تهران:١٣٨١) .
نزهة القلوب، تصحيح و تحشية: گای ليسترانج، چاپ ديبا، انتشارات اساطير (تهران:١٣٨٩).
كاشاني، ابوالقاسم عبدالله بن محمد (ت٧٣٨هـ/١٣٣٧م).
تاريخ اولجايتو، بإهتمام: مهين همبلي، انتشارات علمي فرهنگی (تهران:١٣٦٦).

**دووەم / ژێدەرەکان:**

**أ- بەزمانی عەرەبی و فارسی :**

- جعفر حسين الخصباك، العراق في عهد المغول الايلخانيين (٦٥٦-٧٣٦هـ/١٢٥٨-١٣٣٥م)، الفتح، الادارة، الاحوال الاقتصادية والاحوال الاجتماعية، مطبعة العاني، (بغداد: ١٩٦٨م).
- جورج لاين، عصر المغول (سلسلة الحياة اليومية عبر التاريخ)، ترجمة: تغريد الغضبان، منشورات هيئة ابوظبي للسياحة والثقافة، (ابوظبي: ٢٠١٢).
- حسين الامين، المغول بين الوثنية والنصرانية والاسلام، دار التعارف، (بيروت: ١٩٩٣م).
- درويش يوسف حسن هروري، بلاد هكاري ٩٤٥-١٣٣٦ دراسة سياسية حضارية، دارسپيريز، مطبعة وزارة التربية (اربيل: ٢٠٠٥).
- رمضان شريف زبير الداودی، لورستان الكبرى (٥٥٠-٨٢٧هـ/١١٥٥-١٤٢٤م) دراسة في احوالها السياسية والحضارية، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٤م).
- سهيلا نعيمی، واقعەی اترار در منابع تاريخی دوره مغول، آموزش تاريخ، دورەی يازدهم شماره ٣ بهار ١٣٨٩.
- سوادي عبد محمد الرويشدي، امارة الموصل في العهد بدرالدين لؤلؤ (٦٠٦-٦٦٠هـ/١٢٠٩-١٢٦١م) الاحوال السياسية والعسكرية والادارية والاحوال الثقافية واحتلال المغول، مطبعة الارشاد، (بغداد: ١٩٧١م).
- سيپان حسن علي بنگلی، حصن كيفا، دراسة في تاريخها السياسي و الحضاري ( ١٢٠٠-١٣٠٠م)، ( دهوك، ٢٠٠٥ )
- عباس اقبال، تاريخ المغول منذ حملة جنكيزخان حتى قيام الدولة التيمورية، ترجمة عبدالوهاب علوب، مجمع الثقافی، (ابوظبي: ٢٠٠٠م).
- عبدالله محمد العلياواي، كوردستان في عهد المغول (١٢٢٠-١٣٣٥)م، دراسة في التاريخ السياسي، (السليمانية: ٢٠٠٥م).

- عبدالحليم عبدالله فارس العزاوي، دور الكرد في مقاومة الغزو المغولي (٦٥٦هـ/١٢٥٨م)، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة بغداد، (بغداد: ٢٠٠٧م).
- علاء محمود خليل، المغول في الموصل و الجزيرة (٦٥٦-٧٣٦هـ/١٢٥٨-١٣٣٥م)، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة الموصل، (الموصل:١٩٨٥م).
- علي عادل حسين، إربل في الفترة (٦٣٠-٨٧٤هـ/١٢٣٣-١٤٦٩م) دراسة سياسية حضارية، اطروحة دكتوراه مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة صلاح الدين، (اربيل: ٢٠٠٦م).
- فايد حماد عاشور، العلاقات السياسية بين المماليك والمغول في الدولة المملوكية الاولى، دار المعارف، (القاهرة: ١٩٧٦م).
- فؤاد عبدالمعطي الصياد، المغول في التاريخ، دار النهضة العربية، (بيروت: د.ت).
- قاسم الدويكات، الجغرافيا العسكرية، الطبعة الثانية، ٢٠٠٢.
- كارل فون كلاوزفيتز، الوجيز في الحرب، ترجمة: أكرم الديري و الهيثم الأيوبي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، (بيروت:١٩٧٤) .
- محمد سهيل طقوش، تاريخ المغول العظام والايلخانيين (٦٠٢-٧٧٢هـ/١٢٠٦-١٣٧٠م)، دار النفائس، (بيروت: ٢٠٠٧م).
- محمد صالح داود القزاز، الحياة السياسية في العراق في العصر العباسي (٥١٢-٦٥٦هـ)، مطبعة القضاء، (النجف:١٩٧١م).
- محمد فتحي امين، الغزو المغولي لديار الاسلام، دار الاوائل، الطبعة الثانية، (دمشق: ٢٠٠٧م).
- محمد ماهر حمادة، وثائق الحروب الصليبية والغزو المغولي للعالم الاسلامي (٤٨٩-١٠٩٦هـ/١٢٠٦-١٤٠٤م)، مؤسسة الرسالة، (سوريا: ١٩٧٩).
- محمد منير حجاب، الحرب النفسية، دار الفجر، الطبعة الاولى، القاهرة، ٢٠٠٥م.
- محسن محمد حسين، أربيل في العهد الأتابكي، منشورات مكتب التفسير، طبعة مزيدة ومنقحة، (اربيل: ٢٠١٤).
- موسى مصطفى ابراهيم الهسنياني، السنوات الاخيرة من حياة دولة الكورد الايوبية في مصر وبلاد الشام (٦٣٤-٦٥٨هـ/١٢٣٦-١٢٦٠م)، دراسة في العلاقات في العصر الاسلامي الوسيط، (اربيل: ٢٠٠٧م).
- وليد مصطفى نجم، الاوضاع الاقتصادية في عهد الخليفة المستعصم بالله العباسي (٦٤٠-٦٥٦هـ/١٢٤٢-١٢٥٨م)، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٨٩م).

**ب- بە زمانی کوردی:**

- احمد مختار العبادي، مێژووی ئەیوبی و مەملوکیەکان، و. نهاد جلال حبیب الله، نارین، چاپی یەکەم، ٢٠١٠.
- ئاراس فەریق زەینەڵ، جەنگی دەروونی لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبیدا، ( ٥٦٧-٥٨٩ك/ ١١٧١- ١١٩٣ز) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی دەروونییە، سلێمانی، بەهاری ٢٠٠٨ز.

-زرار صدیق توفیق، کورد و کوردستان لە رۆژگاری خیلافەتی ئیسلامیدا ( ١٦- ٦٥٦ك / ٦٣٧- ١٢٥٨ز)، هەولێر، ٢٠١٠.
- سۆن تزو، هونەری جەنگ، و. رەوف حەسەن، خانەی وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- سەید باز ئەلعرینی، مەغۆلەکان، و. شاخەوان محەمەد، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- قادر محمد ئەشکەنەیی، کوردە شارەزووریيەکان (٦٥٦-٧٠٦ك/١٢٥٨-١٣٠٦ز) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەبارەی ڕۆڵی سیاسی و سەربازیان لە ولاتی شام، گۆڤاری زانکۆ، گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین، ژمارە (٢١) ساڵی ٢٠٠٤.
- مەهدی عوسمان حسێن هەروتی، نەهامەتی و کارەساتەکانی کوردستان لە سەدەکانی ( ٦-٨ك/ ١٢-١٤ز)، تێزێکی دکتۆرای بڵاونەکراوەیە، پێشکەش بە کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین کراوە، ٢٠١٤ز.
- محسن محمد حسێن، سوپای ئەیوبیان لە سەردەمی سەلاحەددیندا، و.عوسمان عەلی قادر، التفسیر، چاپی دووەم، ٢٠١٤.
- منصور عبدالحکیم، هۆلاکۆ سەرسەختە ستەمکارەکەی رۆژهەڵات خوێنڕێژی مێژوو، دوژمنی شارستانیەت، و. مەشخەڵ کەولۆسی، چاپی یەکەم، سلێمانی ، ٢٠١٠ز.
- نەبەز مەجید ئەمین، هەواڵگری لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبیدا، و. کەمال غەمبار، دەزگای وەرگێڕان. بێ ساڵ.

**ج- بەزمانی ئینگلیزی:**

-Buell, Paul D., Historical dictionary of the Mongol world empire, Published in the United States of Americaby Scarecrow Press, Inc.( Maryland: 2003).
-Burgan, Michael, Empire of the Mongols , Chelsea House Printed in the United States of America(U.S.A:2009).
- Jean Baechler, Outline of a Psychology of War, ResMilitaris (http://resmilitaris.net), vol.3, n°3, Summer/ Été 2013 .
-Matthew Barnes ,The Mongol War Machine: How were the Mongols able to forge the largest contiguous land empire in history? Publications in Contemporary Affairs (PiCA) © 2010, http://www.thepicaproject.org
-Stephen Turnbull, Essential Histories • Genghis Khan & the Mongol Conquests1190-1400,Osprey Publishing Ltd (Oxford :2003)
-Ricci, Aldo. The Travels of Marco Polo.: Asian Educational Services,( New Delhi:1994).
Rossabi, Morris, All the Khan"s Horses. Natural History, October 1994,-
- Riyaz Shah AkshayJagadeesh Jing Liong, Genghis Khan's Military Dynasty (Berkeley:2011) .
Thomas T. Allsen, commodity and exchange in the Mogolempire , Cambridge university press (Cambridge:1997) .-

## ملخص البحث

يهدف هذا البحث المعنون ب(الحرب النفسية للمغول وأثرها في سقوط القلاع والمدن الكوردية خلال الحقبة ٦١٨-٦٥٨هـ/١٢٢٠- ١٢٦٠م) إلى توضيح أحد أهم تكتيكات المغول ألا وهي الحرب النفسية في التعامل مع المناطق التي ينوون الاستيلاء عليها، ومنها المناطق الكوردية التي تقع في أقاليم الجبال وآذربيجان والجزيرة وخوزستان وبعض المناطق الأخرى، اعتمد البحث على المصادر الأساسية ولاسيما المعاصرة للحقبة المغولية وذلك لاستجلاء التفاصيل المتعلقة بالوسائل المستخدمة من قبل المغول في الحرب النفسية وكيفية التعامل معها.

قسم البحث إلى مبحثين فضلا عن المقدمة والنتائج، خصص المبحث الأول لدراسة تمهيدية حول الفن الحربي للمغول والتكتيكات المستخدمة من قبلهم وخاصة استخدام العنف والترهيب والفتك بالسكان وعدم التمييز بين المحاربين من أعدائهم والسكان العزل، مما أثاروا زوبعة كبيرة في المشرق الإسلامي، كما وبين هذا المبحث المقصود من الحرب النفسية وكيفية استفادة المغول منها.

عالج المبحث الثاني آثار الحرب النفسية التي شنها المغول بحق سكان ومحاربي بعض القلاع والمدن الكوردية، مثل (اربل و شهرزور وداقوق وميافارقين وآمد ..الخ) من خلال المناوشات المتقطعة ومحاصرة المدن والقصبات والتأثير على عزيمة المقاتلين فضلا عن نشر الفوضى والإرباك بغية تحطيم شجاعة الخصوم وذلك من خلال تشويه صورتهم وتحويلهم إلى أهداف مشروعة، لذلك حاول المغول وبشتى السبل النيل من مقاومة الكورد للدفاع عن أنفسهم، وحاولوا نشر الرعب والفزع بين السكان، كما واستمروا في محاصرة بعض المدن لفترات طويلة الأمر الذي مكنهم من احتلال العديد من مدن وقلاع كوردستان.

## Abstract

Human being is a complex creature , so according to scientific development phases tried to be dealt on its inner psycho long ago , realized to secrets witch always under outer effects, They affect on changing activities and tart mints, These are in relation with life different elements, This effect often appeared badly , That's why those who work in army in the militant frame works affect in psycho force opposite differently , till be came a new war those shape which is known psycho war nowadays.

As we pointed to Mongolian psycho war opposite Kurdish to conquer the Kurdish castles and cities, writer on the above ponies so much but it's still important to write about it, Have we want write more about these important points as a research, hoping to be gate on it, To stretch tried to talk about some castles and cities during (618 - 658H / 1221-1260 AD), The research consists of this introduction and two main parts .Firstly Mogul war techniques and Mogul psycho to the vole of Mogul psycho war in conquering Kurdish castles and cities, with the conclusion and the list of references and the synopsis of the research in both languages Arabic and English.

# باجەڵان و میرایەتی باجەڵان لە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی و فەرمانڕەوایانی ئێراندا

م. ئەحمەد محەمەد ناسر (ئەحمەد باوەڕ)
بەشی مێژوو – كۆلێژی پەروەردە – زانكۆی گەرمیان

**پێشەكی :**

هۆزی گەورەی باجەڵان، بەتایبەتی لە بەشی باشووری كوردستاندا، بەیەكێك لـە هـۆزە گـەورەكانی كـورد دادەنرێـت و بـەزۆری لـە ڕووی شـوێن و هەڵكەوتـەی جوگرافی و ژیانی نیشتەجێبوونەوە، كەوتوونەتە ناوچەی گەرمیان و بەشـێكی زۆر لە گوند و دێهاتەكانی ناوچەی (بنكوورە) ی سەر بە شاری خانەقینـەوە. تەنانـەت یەكێك بوون لەو هۆزە كوردانەشی، كـە لـە مـاوەی سـاڵانی سـەدەی حەڤدەیـەمی زایینی بەدواوە و لە ناوچەی زەهاوی ڕۆژهەڵاتی كوردستاندا (میرایەتی) بە هێزیان پێكـــەوەناوە و ناوەنـــدە سەرەكییەكەشـــی، بـــەپێی زۆرێـــك لـــە سەرچـــاوە مێژووییەكان شاری (زەهاو) بووە و ماوەیەكی زۆریش وەك میرایەتییەكی سەر بە فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانی لە دەسـەڵاتدا ماونەتـەوە. تـا ئەوكاتـەی وەك هەر دەسەڵات و میرنشینێكی تری كورد لـە دەرئـەنجامی فراوانخـوازی و ململانێـی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەلایـەك و هـەموو ئـەو بنەماڵانـەی، كـە لـە سـەرەتاكانی سەدەی شازدەیەمی زایینییەوە، كاروباری وڵاتی ئێرانیان كەوتۆتە دەستەوە، هەر لـە سـەفەوی، ئەفشـاری، زەنـدی، قاجـاری و هاوكـات جگـە لـە دەسـتێوەردانی دەرەكی، سیاسـەتی سـینترالی دەوڵـەتی عوسمـانی بـۆ كوتاییهێنـانی دەسـەڵاتی میرنشـینەكان و گەڕانـەوەی دەســەڵاتی ناوەنـدی عوسمـانی بـۆ ناوچـە دوورە دەستەكان. هەموو ئەمانە بوونەتە مایەی ئەوەی ئەم میرنشینەی كوردیش لـە بـار ببرێ و كۆتایی بەدەسەڵاتی بهێنرێت.

ئەم لێکۆڵینەوەش، کە پشتی بەستووە، بە دەیان سەرچاوەی دەوڵەمەند و بەزمانەکانی کوردی، عەرەبی و فارسی لەم چوارچێوەیەشدا دامانڕشتۆتەوە، زیاتر هەوڵێکە بۆ ڕۆشنایی خستنەسەر ئەم هۆز و میرایەتییەی گەلی کورد، کە تا ئێستاش بەشێوازێکی سەربەخۆ بابەتێکی زانستیی هەمەلایەنەی ئەوتۆی لەسەر نە نووسراوە، بەو ئومێدەی ئەم هەنگاوەی ئێمەش لە ئایندەدا و لە لایەن ڕووناکبیران و مێژوونووسانی کوردەوە بتوانرێت زیاتر دەوڵەمەند بکرێت و زانیاری و ڕۆشنایی زیاتر و نوێتری بخرێتەسەر. ماوەتەوە بڵێین : لێکۆڵینەوەکە، بەسەریەکەوە، لە پێشەکی و چەند سەرباس و تەوەرێکی سەربەخۆدا سەرچاوە دەگرێت. تەوەری یەکەمیان : زیاتر تەرخانکراوە بۆ ڕۆشنایی خستنەسەر ناوی باجەلان و لێکدانەوەی بەپێی هەموو ئەو سەرچاوە جۆربەجۆرانەی، کە سوودیان لێ وەرگیراوە. هەرچی تەوەری دووەمە: تایبەتە بە مێژوو و شێوازی ژیان و نیشتەجێبوونی باجەلان و هۆزی گەورەی باجەلان لە بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و بەشێك لەو شار و شارۆچکە و ناوچانەی، کە هۆزی باجەلانی کوردی لەلایەن فەرمانڕەوایانی ئێرانەوە بۆ دوورخراوەتەوە. بەڵام تەوەری سێیەم : بەدواداچوونێکە سەبارەت بە شێوازی دابەشبوونی هۆزی باجەلان لە وڵاتی عێراق و ناوچە جۆربەجۆرەکانی باشووری کوردستان، هەروەها تەوەری چوارەم و کۆتایی، زیاتر هەوڵێکە بۆ باسکردنی مێژووی سەرهەڵدانی میرنشینی باجەلان و لیوای دەرنە و باجەلان لە دەشتی زەهاو و شێوازی فەرمانڕەوایەتی بەشێك، لەو کەسایەتی و میر و فەرمانڕەوایانەی، کە بەدرێژایی مێژوو کاروباریان بەڕێوەبردووە و هاوکات چۆنێتی پەیوەندی و پابەندبوونیان بەدەسەڵات و فەرمانڕەوایانی ناوچەکەوە، بەتایبەتی هەریەك لە دەوڵەتی عوسمانی و فەرمانڕەوایانی ئێرانی لە قۆناغە جیاجیاکانی حکومڕانیەتییاندا.

## تەوەری یەکەم / ناوی باجەلان :

باجەلان یەکێکە لە هۆزە گەورەکانی کورد، لە دێر زەمانەوە، بەسەر دەوڵەتەکانی عێراق و ئێران و تورکیادا دابەشبوون، وەك ئەوەی لە عێراقدا بەزۆری دەکەونە پارێزگاکانی : دیالە و کەرکوك و نەینەواوە و لە ڕووی زمان و دیالێکت و ئاخاوتنەوە لەگەڵ هۆزی زەنگەنە و کاکەیی و تایەفەی شەبەکدا یەك

شێوەزاری هاوبەش کۆیان دەکاتەوە، کە ئەویش بۆخۆی دیالێکتی (ماچۆی گۆرانی) یە[1]. بەلآم وەك تێگە (مفهوم) و زاراوەسازی، باجەلآن بریتییە لە وشەیەکی لێکدراو، کە لە دوو برگەی (باج و لان)ەوە سەرچاوەی گرتووە، یەکەمیان (باج) یان (واجی) پەهلەوییە، بەواتای گوفتار یان وتار و هەندێك جاریش بە واتای (واژ) یان (باژ)ەوە هاتووە، کە زۆر بە کپی و هێواشی لە ڕێوڕەسمی ئایینی زەردەشتیدا خوێندراوەتەوە، وەك ئەوەی یەکێك لە نوێژی زەردەشتییەکان، بەناوی سروشی باجەوە بووە، کە ئەمەش بەواتای گوفتاری سروش یان ئەو نوێژی سروشە دێت، کە زەردەشتییەکان، هەموو بەیانیانێکی زوو دوای بێداربوونەوەیان لە خەو و شوشتنی دەست و دەموچاویان بەجێیان هێناوە، هەروەها (لان)یش بەو شوێن و جێگەیە وتراوە، کە ڕێوڕەسمە ئایینییەکەیان تیا بەڕێوەبردووە، هاوکات دەبێت ئەوەشمان لە بیربێت، کە هۆز و خێلێکی گەورەی وەك باجەلآن هەر لە مێژەوە ئەرك و پێگەیەکی ڕۆحییان لە نێو ئایینی زەردەشتییاندا هەبووە[2]. کەچی گەڕیدە و مێژوونووسی عێراقی عەباس ئەلعەزاوی (١٨٩١– ١٩٧١)[3] بەپێی لێکدانەوەی خۆی نووسیویەتی : ناوی باجەلآن دەبێت بە دوو برگە یان بە دوو بەشەوە یەکەمیان: (باج) بەزمانی تورکی بە واتای باج یان زەریبە هاتووە و (ئالان) یش بە واتای (جابی) واتە کۆکەرەوەیە و بەسەریەکەوە دەکاتە (جابی — الضریبة — کۆکەرەوەی باج) دەگەیەنێت، ئەمەش بۆخۆی پۆستێکی فەرمییە، بەر لەوەی ناو بێت بۆ ناوی هۆزێك[4].

هەرچی کاتب چەلەبیشە (١٦٠٩ — ١٦٥٧)[5] لە ماوەی سالآنی سەدەی حەڤدەیەمدا دەنووسێت : (لە ئەیالەتی مووسلدا دانیشتوانی لیوای (باجوانلو) لە کوردانی سەر بەعەشیرەتی باجەلآنن[6]. بەلآم هەر یەك لە یاقووتی حەمەوی بە: (باجروان) و قەشە سلێمان سائیغ بە: (باجوان) و ئیبراهیم شەوکەت بە: (باجردان) و دکتۆر ئەحمەد سووسە (١٩٠٠– ١٩٨٢) ی بەڕەگەز جوولەکەی عێراقی بە: (جروان) باسیان لێوەکردوون[7]. هەرچی گیوی موکریانیشە (١٩٠٣ — ١٩٧٧) لە (فەرهەنگی کوردستان)دا، لەبارەی (تێگە) یان (چەمکی) باجەلآنەوە دەنووسێت : ((پارچە خاکێکە لە نێوان مەندەلی و خانەقیندا و لە سەر ئاوی ئەلوەندێیە)). هەروەها لە بارەی باجەلآنییشەوە نووسیویەتی : ((تیرەیەکی

کوردە لە خێڵی لوو لوو لە خاکی باجەلآنی دادەنیشێت و ڕاوێژی ئاخافتنیان زۆر لە هەورامی دەچێت))[8]. بەلآم تۆفیق وەهبی بەگ (١٨٩٢ — ١٩٨٤)، بەپێی هەندێك لێكدانەوە و ڕای بەشێك لە ڕۆژهەلآتناسان دەیانباتەوە سەر گۆران[9].
شان بەشانی هەموو ئەوانەش عەلی ئەکبەری دهخدا لە : (لغت نامەی دهخدا)دا، لە بارەی هۆزی باجەلآنەوە نووسیویەتی : تایەفەیەکە لە ئێلآتی کوردی ئێران و نزیکەی (١٥٠) خانەوادە دەبن و لە قۆرتوو جگەرلوی زەهاودا نیشتەجێ بوون و بەزۆری لەسەر مەزهەبی سونەن[10].

## تەوەری دووەم / باجەلآن لە ولآتی ئێران و ڕۆژهەلآتی کوردستان :

بەگشتی ئەو باجەلآنانەی، کە دەکەونە ولآتی ئێران و ناوچەی زەهاوەوە بنچینەیان دەگەڕێتەوە بۆ هەرێمی دیاربەکر و لە ناو ئەو هۆزە کرمانجانەی، کە لە دەوروبەری ئەم شارە بارگەیان لێخستبوو، لە دەوروبەری سالّی (١٦٣٠) زایینییەوە کۆچیان کردووە بۆ ناوچەی زەهاو، کە لەو دەمانەدا ناوچەیەکی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی و تورکیای ئێستا بووە، داگیری دەکەن و سولّتانی عوسمانی موڕادی چوارەم (١٦٢٣– ١٦٤٠) ناوچەی زەهاویان پێ دەبەخشێت، بەوەی لە کاتی پێویستی جەنگیدا (٢٠٠٠) سوارە و (٣٠٠٠٠) پیاستەر (بیزە)ی سالآنە بدەن بەدەوڵەتی عوسمانی[11]. کەچی کاتب چەلەبی وەك سەرچاوەیەکی ڕەسەنی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی و وەك ئەوەی پێشتریش ئاماژەی بۆکرا، لای خۆیەوە ڕەسەنایەتییان دەگەڕێنێتەوە بۆ سالآنی پێشتر و لەگەڵ ئەوەدایە، کە هۆزی باجەلآن لە سالآنی سەدەی شازدەیەمدا لە دانیشتوانی ناوچەی مووسڵ و ئەیالەتی مووسڵ بوون[12]. هەروەها (بارون بوود) لەو گەشتەیدا، کە لە سالّی (١٨٥١) دا، بۆ (ناوچەی لوڕستان) کردوویەتی دەنووسێت : ئەو باجەلآنانەی، کە بە ڕێکەوت لە ناوچەی زەهاو چاوم پێکەوتن، بەڕەسەن ئەگەڕێنەوە سەر تورکەکان و لەڕووی بۆچوونەوە موسوڵمانی سونە بوون[13]. هەر لەم دەمانەشدا گەورەی هۆزی باجەلآن ناوی عەبداڵ بەگی باجەلآن بووە و بۆ یەکەم جار لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە نازناوی (پاشا) بەخشراوەتە ئەحمەد پاشای باجەلآن، کە لە (پای تاق) ی نێوان زەهاو و شاری کرندی ئەمڕۆدا، لەگەڵ نادر شای ئەفشاری

(١٧٣٦– ١٧٤٧) دا جەنگاوە، بەجۆرێك پاشالكی زەهاو تا دەورانی عوسمان پاشای باوكی مستەفا پاشای باجەلآن (١٨٤١– ١٩٢١)[١٤]. لە دەسپێكی سالآنی سەدەی نۆزدەیەمی زایینیدا هەر بەردەوام بووە، هەروەها لە دەرئەنجامی مۆركردنی پەیماننامەی ئەرزرومی دووەمی (٣١ مایسی ١٨٤٧)دا، كە بەچاودێری و نوێنەرانی هەریەك لە ولآتانی بەریتانیا و ڕووسیا بەڕێوەچووە. ناوچەی زەهاو وەك بەشێك كەوتۆتە بەر فەرمانڕەوایەتی ئێرانی قاجاری، هەر لێرە بەدواوە بنەماڵەی باجەلآنیش وایان پێباشتر بووە، كە وەك ڕەعیەتێكی توركیای عوسمانی بمێننەوە، جا بۆیە كۆچیان كردووە بۆ ناوچەی خانەقین و دەشتی (بنكدرە – بنكوورە)[١٥]، كە تا ئێستاش بە شوێنی نیشتەجێبوون و ناوەندی سەرەكی هۆزی باجەلآن دادەنرێت لە باشووری كوردستاندا[١٦].

بەلآم ئەوانەیان كە دەكەونە ناوچەی لوڕستانی ئێرانی ئێستاوە، وەك بەشێك لە سەرچاوە مێژووییەكان ئاماژەیان بۆ كردوون، بەزۆری لەوانەن، كە لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی سەفەوییەكان (١٥٠١ – ١٧٣٦)دا و، بەتایبەتی لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شا عەباسی گەورەی سەفەوی (١٥٨٨ – ١٦٢٩) دا، زیاتر بەمەبەستی سنووردانانێك، بۆ دەسەلآتی ئەتابكیەكانی ناوچەی لوڕستان كۆچیان پێكراوە و گواستراونەتەوە بۆ ئەم ناوچەیە، هاوكات (ڕابینۆ)ش، باسی لەوەكردووە، كە هۆز و تیرەكانی: سلسلەی دلفان، باجەلآن، مافی و زەندیای كالە بەشێكن لە تایەفەی لەك و لە كاتی خۆیدا كەریم خانی زەند (١٧٥٠ – ١٧٧٩) بەشێكی زۆر لەمانەی، لەگەڵ خۆیدا بۆ (شیراز)ی باشووری ئێران و ناوەندی دەسەلآتەكەی خۆی گواستۆتەوە. سەرەڕای هەموو ئەوانەش (ڕاویلسۆن) وەك ڕۆژهەلآتناسێك لای خۆیەوە، وای لێك داوەتەوە، كە بەشێك لە هۆزی باجەلآن و پایرەوەندی لە سالآنی سەدەی هەژدەیەمدا، لە دەوروبەری شاری مووسڵی ژێر دەسەلآتی عوسمانییەوە، هەلآتوون و بەناچارییەوە، پەنایان هێناوەتە بەر ناوچەی بروجەرد[١٧]. كەچی دكتۆر محەمەد عەلی سوڵتانی لە (مێژووی كرماشان)دا، كە (دوو بەرگی سەربەخۆی) بۆ مێژووی (ئێلآت عەشایەر) تەرخانكردووە، لە بارەی باجەلآنەكانی ناوچەی بروجەردەوە نووسیویەتی : ماوەی گیرسانەوە و نیشتەجێبوونی هۆزی باجەلآن، لە دەوروبەری (بروجەرد)

دەگەڕێتـــەوە بـــۆ كۆتاییـــەكانی فەرمانڕەوایـــەتی ســـەفەوییەكان و مـــاوەی فەرمانڕەوایەتی نادر شای ئەفشار، جگە لەوەش وای لێكداوەتەوە، كە هۆزەكـانی باجەلآن و زەند و پالآنی تا بەر لە فەرمانڕەوایـەتی سـەفەوییەكان، بەسـەریەكەوە یەكەیەكی خێڵی (ئێڵی)یان پێكهێناوە، بەوەی ئەمانـە بەتایبـەتی هـۆزی گـەورەی باجەلآن و زەند سـنووری دەسـەلآتیان لـە ناوچـەكانی زەهـاو، خانـەقین، كفـری و قەرەتەپـە بـە تەنیشـت یـەكترەوە بـووە و پێكـەوە ژیـاون ماوەتـەوە بڵـێین : باجەلآنەكانی ناوچەی لوڕستان لە سەرچاوە مێژووییەكاندا بەزۆری بە (باجلوەند) ناویان هاتووە و لە تیرەكانی: (سەگوەند، دالوەند، یارئەحمەد، قائید ڕەحمـەت و ئاروان)دا سەرچـاوەیان گرتـووە و لـە دیـارترین كەسـایەتی و ناودارەكانیشـیان : نەقد عەلی خانی باجەلآن، تەهماسب خانی باجەلآنی بروجەردی بـووە، بەڕادەیـەك ئەم هۆزەی كورد لە بەشی ڕۆژهەلآتی كوردستان و تەنانەت تەواوی ولآتـی ئێرانـدا ڕۆڵێكی گـەورەیان گێـڕاوە لەتـەواوی جومگـەكانی دەسـەلآت و بـەڕێوەبردنی ئـەم ناوچەیەدا و تێكەڵ بەژیانی دانیشتوانەكەی بوون[١٨].

كەچـی لەلایـەكی تریشـەوە، باجەلآنـەكانی ناوچـەی قـەزوین، كـە لـە باجەلآنەكانی ناوچەی زەهاون، لەگەڵ هۆزەكانی وەند و زەنـددا كۆچیان كـردووە بـۆ ناوچـەی قـەزوین و لـە هـەردوو ئـاوایی : (ئیسـماعیل ئـاوا) و (نـادر ئـاوا)دا نیشتەجێ بوون و لە كاتی خۆیدا و بەسەریەكەوە نزیكـەی (٤٥) خانـەوادە بـوون. بەلآم بەژیانی گەرمیان و كوێستانەوە سەرگەرم نـەبوون[١٩]. هـەروەها بەشـێكی تریشـیان، كـە پێكهـاتوون لـە كۆمـەڵێك بنەماڵـە و بـەزۆری لـە دەوروبـەری سـاڵی (١١٩٨ كۆچی) بەرانبـەر بـە سـاڵی (١٧٨٣ زایینـی) لـە مـاوەی فەرمانڕەوایـەتی زەندییەكاندا و بە تایبەتی حوكمداریەتی چوارەمین شـای زەندییـەكان، كـە عـەلی موراد خـانی زەنـد (١٧٧٩ — ١٧٨٥) بـووە، لەلایـەن ئاغـا محەمـەد خـانی قاجـار (١٧٧٩– ١٧٩٧)ەوە، بـەرەو ناوچـەكانی مازنـدەران و بـاكووری ولآتـی ئێرانـی ئەوكاتە ڕاگوێزراون و دوای كۆمەڵێك ڕووداوی كارەساتبار لـە (ڕودبـار)ی سـەر بـە ناوچەی قەزوێن نیشتەجێ كراون، دەبێـت ئـەوەش بـزانین، كـە ئەمانـە بەڕەسـەن دەگەڕێنەوە سەر باجەلآنەكانی ناوچەی زەهاو و لە سـەرەتادا، ئـەمانیش هـەر بـۆ (سـیلاخۆر)ی ناوچـەی (برۆجـەرد) كۆچـیان پێكـراوە، وەك ئـەوەی دواتـریش بـە

مەبەستی هاوڕایی و پشتگیریکردنی زەندییەکان، لەلایەن کەریم خانی زەندەوە بۆ ناوچەی شیرازی باشووری ئێرانی ئەو دەمانە گواستراونەتەوە و نزیکەی حەڤدە تا هەژدە ساڵ لەو شارەدا نیشتەجێ بوون. بەلآم لە مردنی کەریم خانی زەند بەدواوە و دەسەلآت گرتنەدەستی عەلی موڕادخانی زەند و گواستنەوەی پایتەختی فەرمانڕەوایەتیەکەی بۆ شاری (ئەسفەهان)، هاوکات بەشێك لە کوردەکان، بەتایبەتی باجەلآنەکانی گواستۆتەوە بۆ شاری ناوبراو و لە دیارترین کەسایەتییە ناسراوەکانی هۆزی باجەلآنی ئەم ناوچەیەش، بەتایبەتی لەماوەی فەرمانڕەوایەتی قاجارییەکان (١٧٩٢– ١٩٢٥) دا، هەر یەك لە ئەڵلآ یارخانی باجەلآنی و سەفدەر خانی باجەلآنی بوون[٢٠]. هەرچەندە بەپێی ساڵنامەی قاجاری ساڵی (١٣١٤ ك.) بەرانبەر بە(١٨٩٦ ز.)، ئەو باجەلآنانەی، کە لە دەوروبەی (قۆرەتوو) و نزیکی (قەسری شیرین) نیشتەجێ بوون، ژمارەیان (٣٠٠– ٥٠٠) بنەماڵە بووە و پەنجا سوارێکیان خستۆتە خزمەتی دەوڵەتەوە، تاقە سەرۆکیشیان لەو دەمانەدا (عەزیز خانی باجەلآنی) بووە و وەك کەسایەتییەکی لێهاتوو باسی لێوەکراوە و بەهۆی بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی و (١٩١٤ – ١٩١٨) چەسپاندنی هێڵی سنوورییەوە بە نوێنەرایەتی هەریەك بەریتانیا و ڕووسیا کەوتوونەتە بەر دەوڵەتی عوسمانی و لەولآتی ئێران دابڕاون[٢١].

### تەوەری سێیەم / باجەلآن و لقەکانی لە عێراق و باشووری کوردستان :

لە کاتێکدا کە باس لە هۆزی گەورەی باجەلآن دەکرێت، بەتایبەتی لە بەشی باشووری کوردستان و تەواوی ولآتی عێراقدا، زۆرێك لە مێژوونووسان، وا جەخت دەکەنەوە، کە بەسەریەکەوە دابەشبوون بەسەر پارێزگاکانی : مووسڵ، دیالە، کەرکووك و هەولێر، هاوکات هۆزی باجەلآن بەسەر هێڵێکدا درێژدەبنەوە، کە لە مووسڵەوە دەست پێدەکات بەرەو کەرکووك، دووز خورماتوو، کفری، قەرەتەپە، کۆیە، تەق تەق، مەخموور، جەلەولا، مەندەلی و خانەقین تا دەگاتە دەشتی زەهاو و ڕێژا و و کامیاران لە ڕۆژهەلآتی کوردستان و شاری (دەرنە)ش بە پایتەخت یان ناوەندی دەسەلآتی میرنشینی باجەلآن ناسراوە[٢٢]. هەروەها ئەم هۆزە بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان لە: (دوو بەشی سەرەکی یان دوو تایەفەی سەرەکی

پێکهاتبن)[٢٣] و هەر یەك لەوانەش بووبێتن بە چەند تیرەو بەرەباب و تایەفەیەکی بچووکترەوە، بەتایبەتی هەردوو تایەفەی :

**یەکەم** : (**جموور** jmur ) :

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا (لقی جموور)ی سەر بە هۆزی باجەلآن چ خۆیان و تەنانەت زۆرێك لە سەرچاوە مێژووییەکانیش، وەك هۆزێکی سەربەخۆ باسیان لێوەدەکەن و دیارترین سەرۆك و تیرە و تایەفەکانی دەستنیشان دەکەن. بەلآم بەپێی لێکدانەوەی مێجەر سۆن، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا دیارترین سەرۆك و لقەکانی بەم جۆرە دیاری کردووە: سەگەوەند، حاجیلەر، غەریبەوەند، شێرەوەند، چوارکلآو، مەمەوەند، داودەوەند و جەلیل ئاغا و سەرۆکەکانیشی لەو دەمانەدا هەریەك لە : مەجید خان، پەروێز، موبارەك، جیهانبەخش، قادر ئاغا و محەمەد ئەمین ئاغا بوونە. هەروەها شوێنی نیشتەجێبوونیان پێکهاتبوو لە: پێدەشتی باجەلآن، کە بەم شێوەیە دەستنیشان کراوە، لە لای باکوورەوە جۆباری عەباسان و لای باشووریان ڕێگای قەسری شیرین – کرماشان، تەوەری ڕۆژهەلآتیان بریتییە گردۆڵکەی داری دیوان و کەلی بێشکان بووە و هەرچی لای ڕۆژئاوایانە ڕووباری (سیروان) و بەرزاییەکانی ئاغ داغی گرتۆتەوە. بەلآم هەریەك لە سامر عەبدولحەسەن ئەلعامری، کە ئینسایکلۆپیدیای هۆزە عێراقیە (موسوعة العشائر العراقیة)کانی لە نۆ بەرگی سەربەخۆدا و عەبد عۆن ئەلڕەوزان، کە ئینسایکلۆپیدیای هۆزەکانی عێراقی (موسوعة عشائر العراق)ی لە دوو بەرگدا، نووسیوەتەوە، هەریەکەو بەجۆرێك لقی (جموور)یان، وەك هۆزێکی سەربەخۆ دەستنیشانکردووە. کەچی ئەلعامری باسی لەوەش کردووە، کە گوایە ئەندامانی ئەم هۆزە خۆشیان واتای ناوەکەیان نەزانیوە. بەڵکو خۆیشی پێی وابووە، کە (جموور)ەکان، بەڕەسەن دەگەڕێنەوە سەر هەردوو هۆزی (زۆلا و جموور)ی ناوچەی هەمەدان و پەیوەندییەکی مێژوویی پتەو لە نێوانیاندا هەبووە[٢٤].

شان بەشانی هەموو ئەوانەش، وەك کاری سەرۆکایەتی و بەڕێوەبردنی کاروباری (هۆزی جموور) لە بەشی باشووری کوردستاندا و بەتایبەتی دوای لێکەوتن و بەساڵاچوونی مەجید خانی کوڕی عەزیز خانی کوڕی عەبدولڕەحمانی

سالار سولتان (١٨٨٢– ١٩٧٠)، بەتایبەتی لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا، مەجید قادر ئاغای کوڕی عەزەم خانی کوڕی عەبدولڕەحمان خان (١٨٩٢ – ١٩٦٣)، بۆ ماوەی چەند ساڵێك، کاروباری هۆزی جمووری گرتۆتە ئەستۆ، تا کاتی کۆچکردنی لە (١١/ ١٠ / ١٩٦٣)دا[٢٥]. وەك ئەوەی لەم ماوەیەش بەدواوە، هۆزی ناسراوی جموور لە ناوچەکانی سەر بە شاری خانەقین و دەوروبەریدا، وەك دوو بەشی سەرەکی هاتوونەتە پێش چاو، کە ئەوانیش بە: (جمووری خواروو) و (جمووری سەروو) ناسراون، ئەوانەی خوارووییان بەزۆری کەوتوونەتە گوند و دێهاتەکانی : (ساڵح ئاغا (خدربەدر)، وەلی ئاغا، قادرئاغا (ساڵحان، باریکە و دەورە)[٢٦]. کەچی ئەوانەی سەروو بەزۆری کەوتوونەتە: ناحیەی قۆرەتوو و دێهاتەکانی : عەلی ئاغا، پەروێزخان، مەجید سالار، مەحموود قەجەر، چیاسرخ و سەید مستەفاوە[٢٧]. هەروەها بەپێی بەدواداچوون و لێکدانەوەی سامر عەبدولحەسەن ئەلعامری و نەوەکانی مەجیدی قادرئاغای جموور خۆیان، بەزۆری و لەم سەروبەندەدا : (عەبدولڕەحمان جیهان بەخشی کوڕی عەلی ئاغای کوڕی عەزیز خانی جموور) سەرۆکایەتییان دەکات و بەسەریەکەوە هەموو تیرە و بەرەبابەکانیان هەریەك لەمانە دەگرێتەوە : (سەیکەوەن، حاجیلەر، غەریبەوەند، شێرەوەن، چوار کڵاو، مامەوەند، داودەوەند لەگەڵ جەلیل ئاغا)دا[٢٨].

**دووەم** : (**قازانلو** qazanlu) :

ئەمەش تایەفەکانی هەریەك لە : حاجی خەلیل، والی ئاغا و عەبدولڕەحمان ئاغا دەگرێتەوە و سەرۆکەکانیشیان هەریەك لە : والی ئاغا، عەبدولڕەحمان ئاغا، غێدان ئاغا و حاجی خەلیل ئاغا بوونە[٢٩]. هەرچی لقی یان بەشی قازانلوویانە، شوێنی نیشتەجێبوونیان دەکەوێتە دەشتی (بنکوورە) وە، کە لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی دەولەتی عوسمانیدا (مەرکەزی ناحیە) بووە و لای باکوور و ڕۆژئاوایان ڕووباری سیروان و هاوکات تەوەری باشووریان گوندی باوەپلاوی و زنجیرەچیای مرواریيە. کەچی هەمان سەرچاوە، کاتێك دێتە سەر باسکردنی بنەماڵەی (جموور) و لە بارەیانەوە دەنووسێت : لە ڕەچەڵەکی باجەلأن نین (لیست من أصل باجلان)[٣٠]. بەلأم میهردادی ئێزەدی، باجەلأنی وەك گەلە

هـۆزی باجــەلآن (بــاژاروان) نــاو بــردووە و نــاوی بەشــێك لــە تــیرە و لقــەكانی دەستنیشان كردووە[31]. وەكتر مێژووناسی عێراقـی عـەباس ئەلعـەزاوی. وا باسـی لێوە كردوون، كە هۆزی گەورە و بەناوبانگی باجەلآن لە پـازدە تـیرەی سـەرەكی پێكهـاتبن و بـەزۆری لـە شـوێن و ناوچـەیەكدا نیشـتەجێن، كـە دەكەونـە قـەزای خانەقینی ولآتی عێراقەوە و لە ماوەی سالآنی سەدەی هەژدەیەمدا بـە (سـنجاقی باجەلآن) و دواتریش بە(سنجاقی دەرنە و باجەلآن) ناوی هاتووە و[32]. بەزۆری لـە دێهات و گوندە ئاوەدانەكانی دەشتی (بنكوورە)دان، كە لـەم سـەروبەندەدا سـەر بە ناحیەی قۆرەتووە[33].

بەزۆری لە پارێزگـای مووسڵیشـدا هـۆزی باجـەلآنی شـەبەك بەسـەر گونـد و دێهاتــەكانی : عومــەر كــان، تــبراغ زیــارە، تــەل یــەعقوب، تــۆبزاوە، بیرحــەلان، جیلوخان، ئۆرتە خەراب، مووكان، ئەلك، تلیارە، قەرەشـوور، تەرجەلـە، عـاموود، بەلوات، كارێز، جەدیدە، بەستەڵی، تەل عاكوب و باریمادا دابەشـبوون و بەشـێكی تریشـیان دەكەونــە ناوچــەكانی پارێزگــای هــەولێرەوە[34]. بــەلآم لــە پارێزگــای كــەركووكی ئەوكاتــەدا بــەزۆری كەوتوونەتــە دێهــات و شــار و شارۆچــكەكانی قەرەتەپە، خورماتوو، داقـووق و قەرەیاتاخـەوە[35]. سـەرەڕای ئـەوەش بەشـێكی تریان دەكەونە ناوچەكانی : هورێن، شێخان، قەسـری شـیرین، حـەلوان، قازانیـە، مەندەلی و قزرەبات، مەنسوریە و شارەبانەوە و بەزۆری بوونەتـە دراوسـێی هـۆزی (عـەززە)ی عـەرەب و لەگـەڵ توركمانـەكانی ئـەم ناوچـەیەدا، تێكـەڵ بـوون و بـە هەرسـێ زمـانی : كـوردی و عـەرەبی و توركمـانی قسـەدەكەن، سـەرەڕای ئـەوەی بەشێكی تریشیان دەكەونە گوندی (تـاغ)ی سـەر بـە ناحیـەی قەرەتەپـەی قـەزای كفرییــەوە و بــەزۆری نــزیكن لــە هــۆزی (كــرووی) عەرەبــەوە، لەگــەڵ ئەوەشــدا سەرەڕای زانینی زمانەكەی خۆیان، كـە زمـانی كوردییـە زۆر شـانازی بەهۆزەكـەی خۆشیانەوە دەكەن، كە باجەلآنییە[36]. هەروەها لەگەڵ ئەوەشـدا بەشـێكی تریـان دەكەونـە ناوچـەی دەرگەزێنـەوە و نزیكـەی (٧٠) بنەماڵـەی تریشـیان دەكەوێتـە ناوچەكانی دەوروبەری دەریاچەی قەزوینەوە لە ولآتی ئێرانی ئێستا[37].

بەلآم بەڕای پارێزەری ناسراو ڕەشـیدی ئیسـماعیل ئاغـای باجـەلآن (١٩٢٠–٢٠٠١)[38]. هــۆزی باجــەلآن لەگــەڵ هــەموو ئــەو زانیارییانــەی، كــە سەرچــاوە

جۆربەجۆرەکان ئاماژەیان بۆ کردوون، بەزۆری لەم تیرە و بەرەبابانەی خوارەوە پێکهاتوون، کە ناوەکانیان لێرەدا دەستنیشان کراوە لەوانە : (قازانلو ، چوار کلاو، قەرییەوەن، شێرەوەند، ڕێژاو، فەڵەوەند، نادرەوەند، سارووجە، دەربەنرند، زوزەوەند، زەهاو، خدرەوەند ، قەسرەوەن و جوگرلو، حاجیلەر، شیك، سیکەوەند، جاجم باز[٣٩]. کەچی خاوەنی ئینسایکلۆپیدیای هۆزەکانی عێراق (موسوعة عشائر العراق) هۆزی باجەلآنی لەم تیرانەی خوارەوەدا دەستنیشان کردووە : (قازانلو، شێرەوەند، سیکەوەند، حاجیلەر، زوزەوەند، قەرییەوەند، جوگرلی، چوارکلاو، بیرەوەند، ساڕوژە، جموور، فەلەوەند، خدرەوەند، قەسرەوەند، هیوانلی، زەهاو و ڕێژاو، باوەپلاوی)[٤٠]. بەجۆرێك فەرمانگەی شاهانەی (ملکی) بەریتانی لە زمانی: (قازانلو)ەکانیانەوە، وای دەگێڕێتەوە کە: (قازانلوەکان وای بۆ دەچن، کە ئەوان لە ڕەچەڵەکی (سلالە) خێڵێکی تورکین و لە سەرەتادا لە نزیکی شاری (هەمەدان)دا نیشتەجێ بوون[٤١]. هەرچەندە ئەمڕۆ هۆزێکی وەك باجەلآن لە باشووری کوردستاندا جگە لەوانەیان، کە پێشتر ئاماژەیان بۆ کرا بەوەی کە دەکەونە سنووری شارەکانی : مووسڵ ، کەرکووك و دەشتی کۆیە و دێهاتەکانی دەوروبەریەوە[٤٢]. هەر ئەمەش وایکردووە، کە ناوچەکانی دیالێکتی باجەلآن بەم شێوە بەربلاوەوە لە یەکترەوە دووربن. بەلآم ئەو شێوە دیالێکتەی، کە پێیدەدوێن لەیەکەوە نزیکن. هەر ئەوەندە هەیە کە دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست بەهۆی تێکەڵییەوە کارێکی تەواوی تێکردووە[٤٣].

لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، زۆرێك لە ڕۆژهەلآتناس و گەڕیدەی ئەوروپایی وەك : جیمس بیکنگهام (Buchkingham)ی ئینگلیزی لە (گەشتەکەم بۆ عێراق – رحلتي الى العراق ١٨١٦) و کلاودیوس جەیمس ریچ ( Claudius James Rich)ی ئینگلیزی لە (گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان – رحلة ريج الى كوردستان ١٨٢٠) هێنری بێندەری فەرەنسی (سەفەرنامەی هێنری بێندەر – رحلة الى كردستان في بلاد مابين النهرين ١٨٨٥)، کە لە چەند کاتێکی یەك بەدوای یەکی ساڵانی سەدەی نۆزدەیەمدا، هاتوونەتە ڕۆژهەلآت و عێراق و بەشێکی زۆری ناوچە کوردنشینەکان و نێو هۆزە کوردییەکانی ئەودەمانەی کۆمەڵگەی کوردەواری. بەجۆرێك یەکەمیان : لە چوارچێوە و درێژەی هاتن و گەشتەکەیدا، کە لە

دەوروبــەری (٨ ئــەیلولی ١٨١٦)دا و لــە ڕێگــای شــاری خانەقینــەوە، کــە ئــەو بە(ئــەرتمیتا)ش نــاوی بــردووە، گەشــتەکەی دەســت پێــدەکات و وەســفێکی هەمەلایەنــەی شــاری خانــەقین و ناوچــەکەی کــردووە، وەك ئــەوەی دەنووســێت: خانەقین لە دوو بەش پێکهاتووە.. بەهەردوو بەشەکەیەوە نزیکــەی (١٥٠٠) ماڵــە و ژمارەی دانیشتوانی (١٠– ١٢) هەزار کەس بووە، دوو مزگەوتی تیابووە و بــەزۆری موســوڵمانی ســونەن، ســەرەڕای کەمایەتییــەکی جوولەکــە و دیــان و حــاکمی شارەکەش سەر بەفەرمانڕەوایەتی بەغدایە[٤٤]. پاشان بە چــەند ڕۆژێکــی دواتــر لــە حەلوانەوە بەرەو دەشتی باجەلآن و ناو هۆزی باجەلآن لە شاری زەهــاو و دەشــتی زەهاو دەبێتەوە، وای باسکردووە: (کــە ئێــرە کۆتــایی بــاکووری ناوچــەی گەیلانــە و... سەرەتای درێژبوونەوەی کوردستانە بەرەو باکوور)[٤٥].

بــەلآم شــاری زەهــاو کــە بارەگــای (مقــر) پاشــای باجــەلآنی کــوردە، دانیشــتوانەکەی بــەزۆری بــە ئاژەڵــداری و کشــتوکاڵکردنەوە ســەرگەرمن، شــێوازی زمان و ئاخاوتنیــان لــە زمــانی فارســییەوە نزیکــە تــا هــەر زمــانێکی دی، ژمــارەی ماڵەکانی کــە ناوەنــدی ناوچــەکە بــووە، بەســەریەکەوە نزیکــەی (١٠٠٠) خانــەوادە بووە و بە زۆری ماڵ و خانووەکانیان بچووك و یەك نهۆمی دروســتکراون و بــەزۆری باخچەیان لەگەڵدایە و لە هەموو شارەکەشدا خانوویەکمان نەدی کە لــە یــەك نهــۆم زیاتر بێت، هەروەها لەو دەمانەشدا شارەکە تەنها دوو یــان ســێ خــان و بــازاڕێکی تایبەت بەخۆی هەبووە، بەلآم هەر هەموویان بچووك و تاڕادەیــەك خــراپ دروســت کراون. هەر لەو ماوەیەدا فەرمانڕەوای شارەکەیان (فەتاح پاشای باجەلآن) بــووە و هەموو ناوچەی باجەلآنی لەژێر دەسەلآتدا بــووە. کــە زۆرتــرین بەشــی باشــووری کوردستانی پێکهێناوە و هەموو کوردەکانی دەوروبەریش هــەر لــە ژێــر دەســەلآتی ئەودا بوونە، ئەمــە لــە کاتێکــدا و لــەو ســەروبەندەدا دەسەلآتەکەشــی پەیوەســت بووە بە دەسەلآت و فەرمانڕەوایەتی بەغداوە. هەرچەندە ئەم ناوچەیە پێشتر و بۆ ماوەیــەکی زۆر ملکەچــی فــەرمانڕەوایانی فــارس بــووە، بــەلآم وەکتر زۆر جــاریش دەسەلآتی ســەردارەکانیانی ڕەتکردۆتــەوە[٤٦]. هــەروەها (جــیمس بینکنگهــام) لــە درێژەی گێڕانەوەکانیدا سەرەڕای ئەوەی ڕەخنــەی لــە خــەڵك و شــێوازی مامەڵــەی خراپی دانیشتوانی شاری زەهــاو گرتــووە، کەچــی لەگــەڵ ئەوەشــدا دەنووســێت:

بەڵام لەگەڵ ئێمەمانانـدا بـەجوانی هەڵسـوکەوتیان دەکـرد و ڕێزیـان لێ دەگـرتین، وێڕای باسکردن لە شێوازی ژیانی دانیشتوانی شار و جلوبەرگیان، کاروکاسـبییان، بارودۆخی ئافرەت و سەربەستی و ڕادەی جوانییان لە ژنانی عـەرەب زیـاتر، جگـە لە شـێوازی بـەکارهێنانی گـا و وڵاخـی بـەرزە بـۆ کـاری گواسـتنەوە و ڕاپـەڕانـدنی کاروباری ڕۆژانە زیاد لە هـەرجۆرە ئـاژەڵێکی تـر، لەلایـەکی تریشـەوە ئـەوەی بـۆ گێڕاوینەتەوە، کە بازاڕی شـارەکە هـەموو جـۆرە شمـەك و کاڵایـەکی بەباشـی تیـا دەسـت کـەوتووە، دانیشتوانەکەشـی هـەموو موسـڵمانی سـوونەن و تـەنها یـەك مزگەوتیان هەیە[٤٧].

هەرچـی کلاَدیـوس جـەیمس ڕیچـە، کـە ماوەیـەکی زۆر لـە وڵاتـی عێـراق و ناوچەکەدا کاروباری نیشینگە (مقیمیة)ی بەریتانی گرتبووە دەستەوە، هاوکات لـە ململانێیەکی بەردەوامدا بووە، لەگەڵ هـەردوو والی بەغدا سـلێمان پاشـای بچـووك (١٨٠٨– ١٨١٠) و داود پاشـــا (١٨١٧– ١٨٣١) دا [٤٨]. تـــا ئەوکاتـــەی بـــاری تەندروستی تێکدەچێت و بەمەستی هەوا گۆڕین گەشـتێك بـە کوردسـتان و ناوچـە کوردنشـینەکاندا دەکـات، هــەر ئەوسـاش لـە مـارتی (١٨٢٠)دا و، لـە کۆتـایی گەشتەکەیدا، کە دەگاتە ناوچەی قەسـری شـیرین، لەوێشـەوە دوایـی زۆر بـەوردی باسی لە کاولەکانی نزیك گوندی (حەوش کوڕی) سەر بە شاری خانەقین دەکات، بەوەی کە لە کۆنترین دێرینەی وڵات و باشووری کوردستان بووە و دواتـر لـەوێوە ڕێـی کەوتۆتـە دەشـتی (بنکـوورە)ی ناوەنـدی دەسـەڵاتی هـۆزی باجـەڵان لـە باشووری کوردستان، باسی لەوەش کردووە، کە چـۆن لـە درێـژەی گەشـتەکەیاندا بوونەتە میوانی کەسایەتی و تورکی زانێکی وەك : (حەسەن ئاغای سەرۆك خێڵـی باجـەڵان) و بـە چ شـێواز و جلوبـەرگێکی تایبەتـەوە میواندارییـەکی شایسـتەی کـردوون، وەك خـۆی لـەم بارەیـەوە دەنووسـێت: (ڕێـی نـەدا هـیچ شـتێك لـە گوندەکەیـدا بکـڕم، سـووربوو لەسـەر ئـەوەی کـە مـن میـوانی ئـەوم). هـەروەها دەنووسـێت دوای ئامادەبوونمـان لـە ئاهـەنگێکی شـایی و هەڵپـەڕکێی گونـد و ناوچـەکەیدا بـەیاوەری و ئاسـانکاریی (حەسـەن ئاغـای باجـەڵان)، کەڵـەکیان بـۆ ئامادە دەکرێت و بە نرخی (دووسەد یان سێ سەد قرووشی) ئەوکاتەی عوسمـانی بەرەو بەری زەنگاباد و ناوچەی قەرەتەپە بەڕێی کردوون[٤٩]. بەڵام ڕۆژهـەڵاتناس

و گەڕیدەیەکی وەك: (هێنری بێندەر)ی فەرەنسی، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم و بەتایبەتی لە ساڵی (١٨٨٥)دا، هاتۆتە کوردستان و ولاتی نێوان دوو ئاوان (بلاد مابین النهرین) و ئێرانی قاجاری. هەرچەندە ئەم سەفەرنامەیە: بەشێکی جیاوازی تەرخان نەکراوە بۆ کورد، بەڵکو بەپێی ئەو ناوچانەی، کە گەلی کوردیان لێ بووە، لە چەند بەشێکی کتێبەکەدا ناویان هاتووە، ئەم بەشانەشی بریتین لە: لە تەورێز تا ورمێ، لە ورمێوە تا وان، لە بەغداوە تا کرماشان، لە کرماشانەوە تا تاران [٥٠]. وەك دەبینی لە بەشی (لە بەغداوە تا کرماشان ٣٠ تشرینی یەکەم – ٥ تشرینی دووەمی ١٨٨٥)دا، کە لە (٥ تشرینی دووەمی ١٨٨٥)دا، گەیشتۆتە دەوروبەری شاری خانەقینی ئەوکاتە، دەنووسێت: (زۆری پێ ناچێت دەگەینە باغی هەنار و خانی خەڵك، گوند لە هەردوو لای ڕووباردا بلاوبۆتەوە، بەدوا تیشکی هەتاو ڕووناك بۆتەوە... چەند ژنێك ئاو دەبەن، هەندێکی دیکە خەریکی جل شوشتنن منالەکانیش لە تەنیشتیانەوە مەلە دەکەن). هەروەها لە بەشێکی تری وەسفکردنەکانیدا باسی لەوە کردووە : (خەڵك لێرە حەزیان لە فەرەنگییان نییە، جگە لە باسکردنی دکتۆرێکی ئەڵمانی بەناوی (ساب Sab)ەوە، کە لەو دەمانەدا لە شارەکەدا کاروباری تەندروستی ڕاپەڕاندووە[٥١]. بەلام لە (٢ی تشرینی دووەمی ١٨٨٥)دا دەگەنە (شاری قەسری شیرین) و لەبەر بۆنی لاشەی ئەو مردووانەی، کە لە ئێرانەوە هێنراون بەرەو شارەکانی کەربەلا و نەجەف و بەمەبەستی ناشتنیان، تیایدا نەماونەتەوە، هەر بۆیە لەوێوە بەرەو ناوچەی زەهاو دەبنەوە، کەچی ئەمیان بەپێچەوانەی (جیمس بینکنگهام)ەوە، کە کوردەکانی ئەم ناوچەی بە ئەهلی سونە باسکردبوو، دەنووسێت: (کوردەکانی ئێران لە تایەفەی عەلی ئیلاهین). بەلام لەبارەی کابان و ژنانی ئەم ناوچەیەوە، بەخەڵکانێکی ئیشکەر و (لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا هەویر دەکەن ئەنگوتك دەخەنە سەر ساج) بە گشتی (خەتی سیمای گەلێکیان جوانە). هاوکات بەڕادەیەکی زۆر کەم نەبێت باسی شێوازی دەسەلات و بەڕێوەبردنی ناوچەکەیان نەکردووە، لە بارەی هۆزەکانیشیەوە ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە: (تووشی کاروانێکی گەورەی حەفت سەت هەشت سەد نەفەری هۆزەکان هاتین، کە بەخۆیان و ڕەشماڵ و ولاغ و کەلوپەلەکانیان کۆچ دەکەن، ئەمانە لەسەرمای

زستان ڕادەکەن و بە دوای ئاووهەوایەکی خۆشتر و لەوەڕگایەکی تازە بۆ پەزەکانیان دەگەڕێن)[٥٢].

کەچی لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، کە هێشتا ناوچەی خانەقین و دەوروبەری بە دەستی هێزەکانی عوسمانییەوە بووە، وڵاتانی هاوپەیمان، بەتایبەتی ڕووسیا توانیویانە دەست بەسەر تەواوی شارەکەدا بگرن و لەگەڵ ئەوەشدا تالآنی و بێ سەرەو بەرەییەکی زۆریان تێدا کردووە، ئەمەش لەکاتێکدا بوو، کە هێشتا تاقە سەرۆکی هۆزی باجەڵان و کەسایەتی گوێ لێگیراوی شار و ناوچەکە مستەفا پاشای باجەڵان بوو، لەلایەن هاوپەیمانانەوە، بە تایبەتی بەریتانیا، داوای ئەوەی لێ کراوە، هەموو هەوڵێکی خۆی بخاتە گەڕ بۆ پاراستنی نیزام و ڕێکوپێکیی ناو شار و ناوچەی خانەقین لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیاندا [٥٣]. چونکە مستەفا پاشا: هەمیشە دژەتورك و لە دژی تورکەکان ڕاپەڕیوە و چەندین جار دوورخراوەتەوە، لە شەڕی نێوان هۆزەکانیشدا شۆرەتێکی بەجەرگانەی هەبووە، جگە لەوەش هاریکارێکی بەهێزبووە بۆ هەر پرۆژەیەك، کە سەربەخۆیی کوردستانی لێ بکەوێتەوە. بەوەی : ((ئەو کوردێك بووە بە هەموو مانای وشە)) واتە: ((انه كوردي بكل معنى الكلمة He is akurd to the Bachbone))[٥٤].

لە کاتێکیشدا مستەفا پاشا کە مامەڵەکردنی خراپ و ترس و تۆقاندنی ڕووسەکانی بە چاوی خۆی بینی دژی دانیشتوانی ناوچەکە و بەتایبەتی شاری خانەقین، مستەفا پاشای باجەڵان لە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا دەپاڕێتەوە: (باشتر وایە ئەفسەرێکی سیاسی بەریتانی بۆ دیاری بکرێت بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی دانیشتوان). هەرکە داواکارییەکەشی دەخرێتە بەردەم جەنەراڵ مۆدی فەرماندەی سوپای بەریتانی ئەوان ترسی ئەوەیان دەبێت: ((کە ڕەنگە دەستنیشانکردنی کاربەدەستێکی بەریتانی ببێتە سۆنگەی ناکۆکییەکی قورس لەگەڵ ڕووسەکاندا)). هەرچەندە لە لایەکی تریشەوە ڕاپۆرتەکەی کاربەدەستانی بەریتانیا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: (مستەفا پاشا ڕوونی کردەوە، کە کوردەکان تێگەیشتوون، بوونی ڕووسەکان شتێکی پێویستە، بەڵام لێمان پاڕانەوە زۆر لە ڕووسەکان بکەین کۆتایی بەتالآنی و توندوتیژی بێنن و بەجۆرێك بجووڵێنەوە کە لە سوپایەکی

پێشکەوتووی داگیرکەر بوەشێتەوە). وەك ئەوەی پێشتریش نارەزایی نامەیەکی زۆری نوێنەرانی هۆز و خێڵەکانی باجەلآن، جاف، شەرەفبەیانی و تاڵەبانی و کەسانی ناسراوی قزرەبات بۆ هەمان مەبەست گەیشتبووە فەرمانرەوایانی بەریتانیا و تەنانەت مستەفا پاشا بەخۆی لە دوا رۆژەکانی (نیسانی ١٩١٧)دا چۆتە شاری بەغدا و داواکاری و دۆزی دانیشتوانی ناوچەکەی خۆی گەیاندۆتە فەرمانرەوایانی بەریتانیا و لەسەر ئەوەش بەرامبەر بە تورکەکان تووشی کێشە و لێپرسینەوە بووە، بەوەی کە گوایە زانیاریی سەربازی لەبارەی تورکەکانەوە گەیاندۆتە هێزەکانی بەریتانیا لەنزیك شارەبان [٥٥]. چونکە پێشتریش لە نێوان مستەفا پاشای باجەلآن و فەرمانرەوایانی دەوڵەتی عوسمانیدا، بەردەوام جۆرێك لە پێکدادان و هەڵپژان سەرچاوەی گرتووە، وەك ئەوەی ئەو پێش سەردەمی دەستووری، سالآنێکی زۆر بە رەهەندەیی بۆ ئەستەمبووڵ دوورخراوەتەوە و هەردەم لەلایەن تورکەکانیشەوە بەچاوی گومانەوە سەیرکراوە، بە هۆکاری ئەوەی کە لایەنگیری بەریتانیایە، وەك ئەوەی لە ساڵی (١٩١٢) دا بۆ ماوەیەك لە شاری بەغدا دەستگیریان کرد، بە تۆمەتی ئەوەی، ئەو کەسایەتییەکە لەرووی سیاسییەوە شیاو نییە[٥٦]. ئەوەبوو لە سەروبەندی داگیرکاریی رووسەکانیشدا بۆ شاری خانەقین و ئەو دەمانەی، کە مستەفا پاشا پاش سووکایەتی کردنێکی زۆر بەرانبەر بەخۆی و دانیشتوانی شار و ناوچەکە لەلایەن رووسەکانەوە پەنای بردبووە بەر شاری بەغدا و لای بەریتانییەکان[٥٧]. هاوکات خێزانەکەشی لەتا و داگیرکاری رووس و بەپاڵپشتی ژمارەیەك لە پیاوانی سەر بە هۆزەکەی توانیویانە لە شاری خانەقین هەڵبێن و خۆیان بگەیەننە (چیای باخچە) لە باشووری شار و ماڵەکەشی لەلایەن رووسەکانەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت[٥٨].

بەڵام ئێرانیش هەرچەندە وەك وڵاتێك لە سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، بێ لایەنیی خۆی راگەیاندبوو، کەسایەتییەکی وەك مەجید خانی باجەلآن (١٨٨٣- ١٩٧٠)، کە بە(سالار سوڵتان) ناسرابوو برایەکی بەناوی (حەمید خان)ەوە و، لەگەڵ حەوت کەسی تر لە هاوەڵآنی لەلایەن هێزەکانی سوپای دەوڵەتی عوسمانییەوە و بەتۆمەتی هاوکاریکردنیان لەگەڵ هێزەکانی رووسیادا دژی دەوڵەتی عوسمانی لە(چیا سرخ) لە سێدارە دەدرێن [٥٩]. ئەمانیش

لەبەرئەوەی دێهات و ناوچەکانی ژێردەسەلآتیان بە هۆی داڕشتنەوەی هێڵی سنووریی نێوان دەولەتی عوسمانی و ئێرانی قاجاری سالی (١٩١٤)ەوە، کە دەکەوێتە ژێر دەسەلآتی ئێرانی قاجارییەوە و، بەتایبەتی دوای ئەوەی خۆی واتە مەجید خانی سالارسولتان لە زیندانی (قزلڕەبات)ی عوسمانی هەلدێت و بەهەر تەقەلا و پلانێك بێت، سەرەڕای ئەوەی هەموو مال و سامانی خۆی و خزم و کەس و کارەکەی لەلایەن هێزەکانی عوسمانی و لایەنگرانی عوسمانییەوە دەسووتێنرێت و بە تالآنی ئەبرێت، بەیەکجاری پەنا دەباتە بەر ئێرانی قاجاری و بارودۆخی خۆی و هۆزەکەی بەنووسراوی فەرمی دەگەیەنێتە فەرمانڕەوایانی ئێرانی قاجاری و ڕووسیا بۆئەوەی هاوکاری بکرێت و دووبارە بگەڕێنرێتەوە ناوچەکەی خۆی [٦٠]. وەك ئەوەی هەمان بارودۆخ لە ڕاپۆرتێکی صمصام ولمەمالیکی سنجاویشدا، کە بۆ (ئەنجومەنی شوورای میللی) دەولەتی قاجاری بەرز کردۆتەوە جەختی لەسەر کردۆتەوە و لە بەشێکیدا نووسیویەتی: (حەمید خانی برای مەجید خانی باجەلآنی لەگەل شەش پیاوی خۆی لە سێدارە درا)[٦١]. کەچی هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوەدەکەن، کە گوایە لە سێدارەدانی حەمیدخانی برای مەجید خانی باجەلآن (لقی جموور) و هاوەلآنی لە تۆلەی کوشتنی (بەها بەگ)ی قائممامی خانەقینی ئەوکاتەدا بووە، کە لەلایەن ئەمانەوە لە گوندی (حەوش کوری) دەکوژرێت[٦٢]. بەلآم بەپێی یاداشتەکانی ڕەشید شەوقی (١٨٩٣– ١٩٦٧)[٦٣]، کە فەرماندەو ئەفسەرێکی دیاری سوپای عوسمانی بووە و ماوەیەکی زۆر لە سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، لە ناوچەی گەرمیان و دەوروبەری شاری خانەقین خزمەتی سەربازی خۆی بەڕێ کردووە، لە بارەی مەجید خانی باجەلآنیشەوە (کە ڕەشید شەوقی بە هەلە بەکەلهوڕ ناوی بردووە) دەنووسێت: (بە فەرمانی عەلی ئیحسان پاشای عوسمانی، کە ئەوکاتە بارەگای سەرەکی لە کفری بووەو بەهۆی جاسووسەوە خەبەری زانیبوو، کە مەجید خان مەنسووبی ڕووسەکان بوو، نزیك سنووری خانەقین بۆتەوە. ئەمری دا بەلیوا مەخصوصەن من بنێرن بە مەفرەزەیەکەوە بۆ سەری. جاسووسێکیان لەگەل ناردم کە جێگەکەی ئەزانی)[٦٤].

هەروەها ڕەشید شەوقی بەوردی باس لەوەش دەکات کە چۆن لە کاتی شەودا و بەهێزێکەوە لە ناو خاکی ئێراندا چوونەتە سەری و لە ناو جێگا و لە دەواردا مەجید خانیان گرتووە و تەنانەت لەڕێگاشدا مەجید خان دوای: (ڕووناك بوونەوەی دونیا و... بە دزیەوە) بە ڕەشید شەوقی فەرماندەی هێزەکەی وتووە: (ئەو خورجەی لە پاشکۆمەوەیە، پڕیەتی لە لیرە، ئەتدەمێ بۆ خۆت، بەلآم بە مەرجێ، کە بلێیت خۆی تەسلیم بووە و شەڕی نەکردووە. بەلآم ئەمەم بە بەرتیل زانی و لێم قبوولێ نەکرد، چونکی فێری بەرتیلخواردن نەبووم و سەداقەتم ئەنواند لە واجیبا بۆ بێگانە (مع الاسف) هێنام بۆ مەرکەزی لیوا و تەسلیمی لیوا کرا). دوابەدوای ئەوانە و لە بەشێکی تری یاداشتەکانیدا ڕەشید شەوقی دەنووسێت: (مەجیدخان لە قزڕەبات ئەو پارەیەی کە ئەیدا بە من و لێم وەرنەگرت، لێی وەرگیرا و فیراریان پێ کرد بەرەو ئێران و وتیان دیواری کون کردووە و بۆی دەرچووە). کەچی دواتریش هەر (ئامیر لیوای عوسمانی) فەرمان بەڕەشید شەوقی دەکاتەوە بۆ گرتنەوەی، بۆیە هەر لە درێژەی یاداشتەکانیدا دەنووسێت: (منیش تێگەیشتم مەسەلە چییە، تەعقیبی ئەوم نەکرد و کەوتمە ڕاوکردن و، چوومە خانەقین و ڕۆژێك لەوێ مامەوە و ڕاپۆرتم دا کە بۆم نەدۆزرایەوە و نەمتوانی بیگرم)[٦٥]. شارێکی وەك خانەقینیش سەرەڕای گرنگی و بایەخی لە ڕووی هەلکەوتەی جوگرافییەوە، بەزۆری دانیشتوانەکەی لە نەتەوەی کوردن و هەندێك مالێ و خانەوادەی تورکمانیشی تێدایە، ئەمانەش پاشماوەی مەغۆل و قەرەقۆینلۆ و ئاقۆینلۆکانن. شێوەزاری خانەقینی زیاتر کەلهووڕییە و خۆیان پێی ئەلێن باجەلآنی، بە زۆری ڕچە ئایینی هەرێمەکە سونەیە و هەندێك بنەمالەی شیعەشی تیایە، خەلکەکەی زمانی عەرەبی و فارسیش دەزانن [٦٦]. لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردووەوەو بەهۆی ئەو بارودۆخەی، کە بەسەر باشووری کوردستان و ناوچەکانی سەر بە شاری خانەقیندا هات، بەشێکی گەورەی هۆزی باجەلآن کەوتوونەتە ناوچەی گەرمیان و سنوورەکانی قەزای کەلاری ئێستاوەو نزیکەی (١٠٠٠) خێزانی باجەلآنی تیا نیشتەجێ بووە، سەرەڕای ئەوەی بەشێکی زۆریشیان بۆ جارێکی دی دێهات و ناوچەکانی خۆیان لە سنووری دەشتی (بنکوورە) و دەوروبەری شاری (خانەقین)دا، دووبارە ئاوەدانکردۆتەوە.

وەك ئـەوەی دەكرێـت، بەشـێوازێكی گشـتی گونـد و دێهاتـە ئاوەدانـەكانی هـۆزی باجەلآن لەم ناوچەیەدا، بەزۆری لەم شوێنانەدا دەستنیشان بكەین: گـاكولێ، كـانی ماسی، وەلی ئاغا، شێرەوەند ، ئاوایی گەورە، پشت پەنگ ، تازەشار ، سەوزبلآخ، غێدان، دارەخورما، موسـا عوسمـان، تـازەدێ، سـیاووڵە، ئـاوایی حـاجی خـەلیل، دەككەی مەلا تەیب، دەككەی مـەلا حەمیـد، قـەلآی حـاجی سـالم، گـەرمك، راغب بەگ، حاجیلەر ، عالیاوە، باوەپلآوی، كـانی ماسـی، خـێری، مـەلا حەسـەن و ملـە كونار(٦٧). ئەوەی شایانی باسكردن بێت ئەم هـۆزەی كـورد لـە ڕۆژگارێكـدا و وەك هـەر هـۆز و دەسـەلآتێكی تـری ژێـر دەسـەلآتی دەوڵـەتی عوسمـانی توانیویانـە ئەمارەتێك یـان (میرنشـین)ێك پێكـەوە بنـێن و بـۆ ماوەیـەكی زۆر لـە دەسـەلآتدا بمێنێتەوە.

## تەوەری چوارەم / میرنشینی باجەلآن و لیوای دەرنە و باجەلآن :

زنجیرە پاشایانی باجەلآن لە ڕووی ڕەسەنایەتییەوە، لە بنەماڵـە و خانـەوادە دێرینـــەكانی گـــەلی كـــوردن و پێدەچـــێت لـــە ئەردەلآنییـــەكانیش دێـــرینتربن، بەسەریەكەوە نزیكەی (٥٠٠) ساڵی تـەواو لـە ناوچـەكانی زەهـاوی كـۆن، هـۆرێن، شێخان، بنكورە، قۆرەتوو، سەرقەلآ، جگێران، كوبسا و ناوچـەكانی پشـتی چـیای بـەمۆ، پـاوە، جـوانڕۆ و ڕوانسـەر بـە ئەوپـەڕی توانـا و بـەبێ هـیچ هاوتاییـەك فـەرمانڕەواییان كـردووە، بـە وتـەی مـیر شـەرەفخانی بەدلیسـی (١٥٤٣ – ١٦٠٤)(٦٨). جاری وا هەبووە نفووزی حكومداریەتییان گەیشتۆتە ناوچەی دینـەوەر و هۆكاری لەناوچوونی دەسەلآتیشیان دەگەڕێتـەوە بۆئـەوەی، كـە جارێـك سـەربە دەسەلآتی دەوڵەتی عوسمانی بوون و دەمێكیش لایەنگیری فـەرمانڕەوایانی ئێـران بـوون، وەك ئـەوەی هـەر كاتێـك سـەر بـە ئێـران بوونایـە ئـەوا نفـووزی ئێرانـی دەگەیشـتە دەوروبـەری شـارەبان و هەركـە یـار و هـەواداری دەوڵـەتی عوسمـانی دەبوون ئەوا نفووزیان گەیشـتۆتە هەمـەدان(٦٩). بـارودۆخێكی ئـەوتۆش بـەردەوام بووە تا ئەوكاتەی هەردوو دەوڵەتی ناوبراو توانییان لە پەیماننامەیـەكی هاوبەشـدا یەكبگرنەوە و سنوورێك بۆ دەسەلآتیان دابنـێن. دوا پادشـایان بـەپێی (حەدیقـەی سوڵتانی) ئیـبراهیم پاشـای باجـەلآن بـووە، كـە لـە دەوروبـەری سـاڵی (١٢٨٥ ك)

بەرانبەر بە(١٨٦٨ز) لە گوندی (ڕێژاو)ی ڕۆژهەلاتی کوردستان کۆچی دوایی کردووە[٧٠]. لە ساڵانی دواتریشدا ئەم هۆزەی کورد، لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانیدا و لە ناوچەی (زەهاو) دا، کە دواتر بەپێی بنەماکانی پەیماننامەی ئەرزڕۆمی دووەمی (٣١ مایسی ١٨٤٧) کەوتۆتە ژێر دەسەلاَت و فەرمانڕەوایەتی ئێرانی قاجارییەوە، توانیویانە میرنشینێك پێکبهێنن بە ناوی: (میرنشینی باجەلان)ەوە و پایتەخت یاخود بڵێین: ناوەندەکەی لە سەرەتادا، شاری (زەهاو) بووە، کە پێشتر و هەر لەلایەن یەکێك لە میرەکانی باجەلان خۆیانەوە دامەزراوە[٧١].

سنووری دەسەلاَتەکەشیان لە زنجیرە چیاکانی حەمرین لە باشووری کوردستانەوە دەستی پێکردووە تا چیای زەهاو و لەسەر (ڕووباری سیروان)ەوە، تا سنوورەکانی پشتکۆ و شاری کرماشانیشی گرتۆتەوە. بەلاَم شەرەفخانی بەدلیسی لە (شەرەفنامە)دا ئاماژەی بەوەکردووە، کە گوایە شاری (دەرتەنگ) پایتەختی ئەم میرنشینە بووە[٧٢]. کەچی بەپێچەوانەوە، محەمەد ئەمین زەکی بەگ (دەرتەنگ) بەئەمارەتێکی سەربەخۆ ناو دەبات و دەنووسێت: دەکەوێتە ولاَتی (حەلوان)ەوە و یەکەم میریان ناوی (زۆراب) بووە. لە ساڵانی دواتریشدا سەربە دەوڵەتی عوسمانی و سوڵتان سلێمانی قانوونی بووە[٧٣]. بەلاَم سەبارەت (بە میرنشینی باجەلان)، ئەوا بەپێی لێکدانەوە و بە دواداچوونی هەریەك لە ئێلی بانیستەر سۆن واتە مێجەر سۆن Ely banister soan (١٨٨١– ١٩٢٣)[٧٤] و عەبدولڕەقیب یوسف، یەکێك لە دامەزرێنەرە سەرەتاییەکانی و باپیرە گەورەیان، عەبدالڵ بەگی باجەلانی بووە و بۆ یەکەم جاریش نازناوی (پاشا) لە لایەن فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی عوسمانییەوە بەخشراوەتە ئەحمەد پاشای کوڕی ئاسف بەگی کوڕی عەبدالڵ بەگی باجەلانی[٧٥]. تەنانەت هەر لە ماوەی حکومداریەتی ئەم ئەحمەد پاشایەی باجەلاندا، نادرخانی ئەفشار دوای ئەوەی، کە هێرشێکی تەمێکارانەی کردۆتە سەر بەختیارییەکان و تایەفەی زەند هاوکات لەوێشەوە و بەتایبەتی لە کۆتاییەکانی مانگی جەمادی دووەمی (١١٤٥) کۆچی مانگیدا، گەیشتۆتە شاری کرماشان و لە دەرەوەی شاردا هەموو چین و توێژەکانی خەڵك پێشوازییەکی جەماوەریی گەورەی بێوێنەیان لێکردووە[٧٦]. پاشان بە هێزێکی

گەورەی سەربازییەوە هێرشی کردۆتە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەحمەد پاشای باجەڵان و لە شەڕی (پای تاق)ی نێوانیان بەدواوە[٧٧]. توانیویەتی دەست بەسەر قەڵای زەهاویشدا بگرێت[٧٨]. ئەحمەد پاشای باجەڵانیش، کە زانیویەتی بەرگری ئەو هەموو هێزە گەورەیەی نادرشای پێ ناکرێت، بە ناچارییەوە ڕێگای هەڵاتن دەگرێتەبەر، بەڵام دوای ماوەیەکی زۆر و کاتێك، کە ئەسپەکەی لە پێ دەکەوێت و بەلادا دێت، لە لایەن هێزێکی سوارەی بەختیارییەکانەوە، دوای ئابلۆقەدانی دەستگیری دەکەن و بە کەلەپچەکراوی دەبرێتە بەردەم نادرشای ئەفشار و دەیخاتە زیندانەوە[٧٩]. پاشان لەوێشەوە بە هێزێکی سەربازیی گەورەی (١٤) چواردە هەزار کەسی خۆراسانی، مازندەرانی، مەروی و ئەفغانییەوە بەرەو شاری کەرکووك و ناوچە کوردنشینەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دەبێتەوە[٨٠]. بەڕادەیەك هێزەکانی نادرخانی ئەفشار لەم هێرشانەیاندا، بەسەر هەر شوێن و ناوچەکیاندا دابێت و تێپەڕیبوون ئەوا تالآنی و وێرانییەکی چاوەڕوان نەکراویان بەسەر دانیشتوان و کۆمەڵانی خەڵکی ئەو ناوچانەدا هێناوە[٨١].

هەر لەو ماوەیەش بەدواوە کەسایەتییەکی وەك مونشی بەغدادی، کە فەرمانبەری نشینگە (المقیمیة)ی بەریتانی و هاوکاری کلاودیوس جەیمس ڕیچی بەرپرسی یەکەمی نشینگەکە بووە، لە گەشتەکەیدا (گەشتی مونشی بەغدادی بۆ عێراق – رحلة المنشیء البغدادي الی العراق)، ساڵی (١٨٢٠)، کە نزیکەی نۆزدە ڕۆژی تەواو لە نێوان ناوچەکانی بنکورە و دەشتی زەهاودا ماونەتەوەو لە بارەی شارۆچکەی زەهاو و ناوەندی کوردانی باجەڵانەوە دەنووسێت: (لە قەسری شیرینەوە بۆ سەر پردی زەهاو پێنج فەرسەخە، لە سەر ڕووباری ئەڵوەندێیە و خانێکی گەورە هەیە، کاتی خۆی لە لایەن محەمەد حسێن خانی تەراکوزلوەوە بونیادنراوە، هەرئەویش پردەکەی دروستکردووە[٨٢]. کوردە باجەڵانییەکان لەوێ نیشتەجێن و باجی خۆیان لەوانە وەردەگرن، کە بەوێدا تێپەڕدەبن). بەڵام لە بارەی شارۆچەکەی باجەڵانەوە دەنووسێت: (ژمارەی ماڵەکانی پێنج هەزارە و دەبێتە ناوەندی کوردانی باجەڵان، سەرۆکیان نازناوی (پاشا)ی هەڵگرتووە و خاوەنی نزیکەی (٣٠٠) گوندی ئاوەدانن. کەچی شارۆچکەکە ئاو و هەوایەکی ناسازی هەیە، ئەگەر مرۆڤ بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ تیایدا بمێنێتەوە، ئەوا تووشی

نەخۆشی لەرزوتا (الحمی) دەبێت)[٨٣]. شان بەشانی ئەوانەش (کارستین نیبۆر ١٧٣٣– ١٨١٥ Carsten Niebuhr) ی بەڕەچەڵەك ئەڵمانی و بە ڕەگەزنامە دانیمارکی لە (سەفەرنامەی نیبور)دا، کە لە ماوەی سالآنی سەدەی هەژدەیەمدا هاتۆتە ناوچەکە، ئەمیش لە بارەی پاشاکانی ناوچەی زەهاو و باجەلآنەوە دەنووسێت: (سێهەمین پاشای کورد، کە لە ژێر فەرمانڕەوایەتی بەغدادا بێت، ناوی پاشای دەرنەیە، ئەمە حاکمی زەهاو (Zehau) و ناوچەیەکە، کە دەکەوێتە سەر سنووری فارسەکانەوە..)[٨٤].

هەر وەك پێشتریش تاڕادەیەك ئاماژەی بۆ کرا، دەگوترێت سەرەتا باجەلآنەکان بەڕەسەن لە ناوچەی (دیاربەکر) ی باکووری کوردستان و بەتایبەتی لە (١٦٣٠)دا، هاتوونەتە ناوچەی زەهاو و لەلایەن سوڵتان موڕادی چوارەمی (١٦٢٣– ١٦٤٠) عوسمانییەوە، دوای ئەوەی ناوچەکانی دەرنە، زەهاو، دەرتەنگ و دەوروبەری، بەپێی وردەکاری و بنەماکانی پەیماننامەی زەهاو یان قەسری شیرینی (١٧ مایسی ١٦٣٩ ز – ١٤ موحەڕەمی ١٠٤٩ ك)، کە بە هەردوو زمانی تورکی و فارسی نووسراوەتەوە و زۆر سەرچاوە ئاماژەیان بۆ ناوەرۆك و وردەکارییەکانی کردووە[٨٥]. بۆتە بەشێك لە ناوچەکانی ژێردەسەلآتی دەوڵەتی عوسمانی و دواتر خراوەتە ژێردەسەلآتی بنەماڵە و هۆزی باجەلآنەوە، واتە لە لایەن ئەمانەوەو بەناوی سوڵتان و دەوڵەتی عوسمانییەوە بەڕێوەبراوە[٨٦].

ئەوەشی کە جێی سەرنج و لێکدانەوە بێت، تا ئێستاش زۆر ڕوون نییە، کە ئاخۆ ئەم میرنشینەی کورد تاکەی لە دەسەلآتدا ماوەتەوە و فەرمانڕەواکانی دواتری کێ بوون، بەلآم بەپێی لێکدانەوەی مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی (١٩١٣– ٢٠٠١)[٨٧] میرنشینیی باجەلآن بەدرێژایی سەدەکانی نۆیەم و دەیەم و یازدەیەمی کۆچی دەسەلآتیان درێژەی هەبووە[٨٨]. هەندێ سەرچاوەی تریش بە یەکێك لە میرنشینە بە ناوبانگەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی کوردستانی ناو بردووە[٨٩]. جا بۆیە زۆر هەڵدەگرێت، کە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی زیاتری لە بارەوە بکرێت. هەرچەندە لە سالآنی دواتریشدا ناوچەکە وەك (سەنجەق) واتە (لیوا)یەکی سەربەخۆ هاتۆتە بەرچاو و بۆ ماوەیەکی زۆر، بە موتەسەرفیەتی (دەرنە و باجەلآن) ناوبراوە[٩٠]. سەرچاوەکانیش زۆر بە ڕوونی لەسەریان نووسیوە و

تەنانەت موتەسەریفەکانیشی بە زۆری لە شاری (زەهاو)دا، کاروباری ڕۆژانەی فەرمانڕەوایەتیەکەیان ڕاییکردووە. جگە لەوەش وەك سنوور و وەك هەڵکەوتەی جوگرافی بەسەریەکەوە هەموو شار و شارۆچکە و ناوچەکانی : زەهاو، دەرنە، قەسری شیرین، خانەقین و تا کردندیشی گرتۆتەوە، هەروەها لەبەر بایەخ و گرنگیی شوێنەکەی بۆ تەواوی ناوچەکە، کە دەروازەی سەرەکی ڕۆژهەلات و بەتایبەتی شاری بەغدا بووە، بەردەوام هەموو هێرش و داگیرکارییەکی فەرمانڕەوایانی ئێران بۆ سەر وڵاتی عێراق، زیاتر لەم دەروازەیەوە سەرچاوەی گرتووە، هەر بۆیە فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی عوسمانی وەك ڕێزلێنانێك و بەبایەخەوە نازناوی (پاشا)یان بە موتەسەریفەکانی بەخشیوە و بەردەوام جەختیان لەسەر کردۆتەوە[٩١].

بۆ نموونە لە ماوەیەکدا و بەپێی دیکۆمێنت و بەڵگەنامەیەکی دەوڵەتی عوسمانی، کە عەبدولڕەقیب یوسف ساغی کردوونەتەوە یەکێك لە موتەسەریفە بەراییەکانی (سنجەقی باجەڵان) بۆ ماوەیەك، ناوی (دلاوەر) بووە و سنجەقەکەشی سەر بە ویلایەتی شارەزوور بووە[٩٢]. بەڵام لە ساڵی (١٧٨٦) دا موتەسەریفەکەی، کەسایەتییەك بووە بەناوی: **(عەبدولفەتاح پاشای باجەڵان)[٩٣]ەوە، هەرلە هەمان ساڵیشدا بەپێی فەرمانێك، لە لایەن سلێمان پاشای والی بەغداوە لە دەسەڵاتی موتەسەرفیەت دوورخراوەتەوە و لە شوێنی ئەو کوڕە مامێکی خۆی بەناوی (عەبدولقادر پاشا)وە جێگای گرتۆتەوە[٩٤]. هەروەها بەپێی هەمان ڕێکار و گۆڕانکاری موتەسەرفیەتی شاری کۆیە و هەریریشی بە عوسمان پاشای کوڕی مەحموود پاشا سپاردووە**[٩٥]. وەك ئەوەی دوای ئەم لێپێچینەوە و گۆڕانکارییەی، کە والی بەغدای عوسمانی کردوویەتی، بەرانبەر بە عەبدولفەتاح پاشای باجەڵان، بۆ ماوەیەك، لە شاری بەغدادا ماوەتەوە تا ئەوکاتەی لە ساڵی (١٨٠٦)دا، دووبارە کراوەتەوە بە موتەسەریفی ناوچەی باجەڵان و دواتر و لەو ماوەیەدا، کە عەبدوڵڵا پاشای مەملووکی (١٨١٠– ١٨١٣) بە شێوازێکی فەرمی ویلایەتی بەغدای پێ سپێردراوە، عەبدولڕەحمان پاشای بابانیش لای خۆیەوە تاڕادەیەك ڕۆڵێکی کارای هەبوو لە دەستنیشانکردن و هاوکاریکردنیدا، بەڕادەیەك هەنگاوێکی لەو بابەتەش ڕێگاخۆشکەر بووە، بۆ ئەوەی وا لە عەبدولڕەحمان پاشا

بکات، بە شێوەیەك، هەڵسوکەوت بکات بەوەی کە ئەو والی حەقیقییە و هەموو گۆڕانکارییەك لە دەستی ئەودا دەبێت[٩٦]. ئەوەبوو یەکێك لە هەنگاوەکانی و بێ ڕاوێژکردن و گەڕانەوە بۆ والی بەغدا گۆڕینی عەبدولفەتاح پاشای باجەلآنی بوو، بەوەی کە گوایە عەبدولفەتاح پاشای باجەلآن: (کەوتۆتە داوی چەواشەکارییەکانی محەمەد عەلی میرزای کوڕی فەتح عەلی شای قاجاری (١٧٩٧–١٨٣٤) حاکمی کرماشانەوە)...ئەمەو (لە کاتێکدا ناوچەی باجەلآن لە خاڵێکی چاودێری و ناوەندێکی بەرگریی نێوان سلێمانی و کرماشاندا بوو. لەبەر ئەوە عەبدولفەتاح پاشای باجەلآنی لە دەسەلآت لابردووە و) ڕاستەوخۆ خالید پاشای ئامۆزای و موتەسەریفی بابانی پێشووی لە شوێن دامەزراندووە و هەروەها ڕێنوێنیی پێویستی سەبارەت بە چۆنێتی ڕەفتارکردنی بەرانبەر بە محەمەد عەلی میرزای حاکمی کرماشانی داوەتێ و هەر ئەو جا ناردوویەتی بۆ ئەوەی پلەو پایەکەی خۆی بگرێتە دەستەوە[٩٧]. هەنگاوێکی لەم بابەتەش بووە جێی سەرنج و ناڕەزایی ئێرانییەکان، لە بارەی زێدەڕۆیی عەبدولڕەحمان پاشا و دوورخستنەوەی فەتاح پاشای حاکمی دەرنە و باجەلآنەوە[٩٨]. هەر بۆیە هێزێکیان ئامادەکردووە و بە مەبەستی هێرشکردنە سەر ناوچەکانی لیوای دەرنە و باجەلآن[٩٩]. هەروەها بە هاوکاریی خالید پاشای بابانیش، کە بووە بە هاوپەیمانی ئێرانی قاجاری بەرانبەر بەوەی : (گفتی ئەوەیان پێ دابوو، کە حکوومەتی سلێمانی پێ دەسپێرن) لە شوێنی عەبدولڕەحمان پاشای بابانی ئامۆزای تەنانەت (محەمەد بەگی کوڕیشی کردبوو بە بارمتە... لای ئەوانەی فریویان دابوو تا لەو ڕووەوە دڵنیایان بکاتەوە)[١٠٠].

ئەوەبوو کەسایەتییەکی وەك عەبدوڵلا پاشای مەملووکی : (دواتر بۆی دەرکەوت، کە چەند هەڵەیەکی گەورەی کردووە)، بە هەماهەنگی لەگەڵ حاکمی کرماشان محەمەد عەلی میرزا دا توانییان سەرکەوتن بەسەر عەبدولڕەحمان پاشای باباندا بە دەست بهێنن و هاوکات توانییان، لەساڵی (١٨١١)دا، عەبدولفەتاح پاشای باجەلآن بۆ جاری سێیەم و بۆ سەر کار و ناوچەکەی خۆی وەك حاکمی (دەرنە و باجەلآن) بگەڕێننەوە[١٠١]. ئەوەبوو لەم ماوەیەش بەدواوە جۆرە هاوپەیمانییەك، لە نێوان والیی بەغدا و محەمەد عەلی میرزای فەرمانڕەوای

کرماشاندا هاتەکایەوە دژی ئەوڕەحمان پاشای بابان و توانییان هێرش بکەنە سەر ناوچە کوردنشینەکانی ژێر دەسەلآتی بابانییەکان و تەنانەت مەترسی لە سەر شاری کەرکووکیش دروست بوو[١٠٢]. سەرەڕای ئەوەش لە ڕێگەی مۆرکردنی پەیماننامەیەکەوە خالید پاشای هاوپەیمانیان کردە فەرمانڕەوای سلێمانی و عەبدولڕەحمان پاشا کۆیە و هەریری پێ سپێردرا [١٠٣]. هەرچەندە بە چەند ساڵێکی دواتر و بە تایبەتی لە ساڵی (١٨١٥)دا، موتەسەرفیەتی (دەرنە و باجەلآن) لە لایەن والی بەغدا سەعید پاشاوە (١٨١٣– ١٨١٦)، سپێردرایە محەمەد جەواد پاشای باجەلآن و سلێمان پاشای موتەسەریفی بابانی پێشووش بۆ حاکمیەتی کۆیە و هەریری ئەوکاتە دەستنیشانکرا[١٠٤]. تا ئەوکاتەی لە ساڵی ئایندە (١٨١٦) دا محەمەد عەلی میرزای فەرمانڕەوای کرماشان. بە هێزێکی گەورەی ئێرانییەوە، هێرشی کردە سەر ناوچەی زەهاو و دەستی بەسەردا گرت. هەرچەندە بۆ ڕوو بەڕووبونەوەی ئەم هێرش و داگیرکارییەش بنەماڵەی باجەلآن و جووتیارە ڕەعیەتەکانی بە بێ هیچ هاوپشتییەك شەڕی محەمەد عەلی میرزای فەرمانڕەوای کرماشانیان کرد و لە کۆتاییشدا ناچار بوون زەهاو و ناوچەی زەهاو چۆڵ بکەن[١٠٥].

ئەوەبوو لەم هەلومەرجە بەدواوە و دوای ماوەیەکی زۆر لە شەڕ و ململانێی سیاسی و سەربازی، هەریەك لە ئێرانی قاجاری و دەوڵەتی عوسمانی بەدەست تێوەردان و نێوانگیری ولآتانی دەرەکی وەك هەریەك لە: ڕووسیا و بەریتانیا، کە وەك دوو دەوڵەتی گەورە زۆر پێویستییان بە ئەمنیەت و ئاسایشی ناوچەکە هەبوو لە ڕێگای نوێنەرەکانیانەوە کە هەر یەك لە (کیرزن و ولیامز) بوون، لەگەڵ میرزا تەقی خانی نوێنەری ئێرانی قاجاری و ئەنوەر ئەفەندی نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی، یەکەمین دانیشتنی خۆیان لە (١٥ی مارتی ١٨٤٣) لە ئەرزڕۆم کرد[١٠٦]. وەك ئەوەی دوای دەیان کۆبوونەوەی نێوانیان، وەك قۆناغی یەکەم دانیشتنەکانیان کۆتاییان هات و بۆ دواجاریش لە (٣١ مایسی١٨٤٧)دا بە چاودێری، نوێنەری بەریتانیا و ڕووسیا پەیماننامەکە واژۆکرا، ئەوەبوو بەگوێرەی بنەماکانی ئەم پەیماننامەیە هەریەك لە دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی قاجاری سازشێکیان بە کوردستانەوە کرد و جارێکی دیکە کوردستانیان لە نێوان خۆیاندا

دابەشکردەوە. بۆ نموونە لە ماددەی دووەمیدا هاتووە: (حکومـەتی فـارس بـەڵێن دەدات، کە دەست لە هەموو زەوییە دەشتەکان، واتە زەوییەکانی بەشی ڕۆژئاوای زەهاو بـۆ دەوڵـەتی عوسمـانی هـەڵبگرێت، دەوڵـەتی عوسمـانیش لـەلای خۆیـەوە بەڵێن دەدات دەست لـە بەشـی ڕۆژهـەڵاتی ناوچـەی زەهـاو، واتـە هـەموو زەوییـە شـاخاوییەکانی ناوچـەی زەهـاو لەگـەڵ شـیوی کرنـد بـۆ حکومـەتی فـارس هەڵبگرێت..)[107]. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمسیونی هێڵکێشانی سنوور لە ئـەرزڕۆم، کـە عوسمان پاشای باجەلآنیش تیایدا ئەندام بووە، زەهـاوی وەکـو بەشـێك لـە ئێـران ناسی و بنەماڵەی باجەلآنیش وایـان پـێ باشـتربوو، کـە وەك ڕەعیـەتی عوسمـانی بمێننـەوە و بـۆ ئـەو مەبەسـتەش کۆچـیان کـردووە، بـۆ ناوچـەی خانـەقین و بـەو شێوەی، کە ئێستا شاری خانەقین و دەوروبەری بۆتە ناوەندی ئێستایان[108]. وەك دەشبینی بە درێژایی مێژوو و بەپێی سەرچاوەکانی مێژوو خانـەقین و دەوروبـەری بووە بە مۆڵگەی دەیان خێڵی ناسراوی کورد، بۆ نموونە لـە ڕۆژگارێکدا ژمارەیـان گەیشتۆتە (٢١) خێڵ و بەسەریەکەوە سەرژمێریان (١٦٠٠٠) هەزار کەس بـووە، لـە نێویاندا هۆزی باجەلآن (١٣٠٠) بنەماڵە، شەرەفبەیانی (٧٠٠) بنەماڵە، دەلـۆ (٦٠٠) بنەماڵـە، سـوورەمێری (٢٢٥) بنەماڵـە... تـاد[109]. دیـارە هـەر لـەو دەمانەشـدا بووە، کە دەوڵـەتی عوسمـانی وەك بـەدیلێك بـۆ (لیـوای دەرنـە و باجـەلآن)، کـە شاری زەهاو ناوەندەکەی بووەو بەپێی بنەماکانی پەیماننامەی ئەرزڕۆمی دووەمی (١٨٤٧) بەشێکی گرنگی لەدەستداوە و، شاری خانـەقینی ئـەو دەمانـەی کردۆتـە ناوەندی لیوا بەناوی: (لیوای خانـەقین)ەوە و تەنانـەت یـەکێك لـە قائیمقامـەکانی ناوەندی (لیوای خانەقین)ی ئەو دەمانە و بەتایبەتی لە (١٨٦٣)دا، سلێمان فایەق بەگی (١٨١٢– ١٨٩٦)[110]، مێژوونووسـی گـەورەی بەڕەگـەز مـەملووکی و بـاوکی مەحموود شەوکەت سلێمان بەگی سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی و حیکمەت سولەیمانی (١٨٨٩– ١٩٦٤) سەرۆك وەزیرانی عێراقی (تشرینی یەکـەمی ١٩٣٦ – ١٧ئـابی ١٩٣٧)[111] بـووە، لـە سـەردەمی پاشـایەتیدا لـە عێـراق[112]. بـەجۆرێك خانەقین وەك ناوەندی لیوا لە عێراقدا ماوەتەوە، تا ئەوکاتەی لە (١٨٦٩)دا، واتـە ئەو ساڵەی، کە مەدحەت پاشای والیـی بەغـدا (١٨٦٩ – ١٨٧٢) لـە چوارچـێوەی ئەو گۆڕانکارییە ئیدارییەی، کـە جێبـەجێی کـردووە، لیـوای خانـەقینی ئەوکاتـەی

هەلوەشاندۆتەوە و کردوویەتی بە ناوەندی قەزا و گرێی داوەتەوە بەویلایەتی بەغداوە، دیارە لەبری لیوای خانەقین لە هەمان ماوەدا (لیوای دیالە) دامەزراوە[113]. دیارە هەر ئەو بناغەیەش بووە، کە لە سالآنی دواتردا ببێتە مایەی ئەوەی، کە وا لە بەشێك لە کەسایەتی و پەرلەمانتارانی کوردی باشووری کوردستان بکات، لە سالی (١٩٣٠)دا بۆ جارێکی دی یاداشتنامەیەك، بەرز بکەنەوە بۆ فەرمانڕەوایانی حکومەتی عێراق لە سەردەمی یەکەمین حکومداریەتی نوری سەعید (٢٣ مارتی ١٩٣٠ – ١٩ تشرینی یەکەمی ١٩٣١)دا، بۆ ئەوەی دووبارە (لیوای باجەلآن) پێك بهێنرێتەوە و ناوەندەکەشی شاری خانەقین بێت[114].

**لیستی پەراوێز و سەرچاوەکان :**

(1) – جمال بابان، نظرة الى تاريخ عشيرتي (پشدر – الميراودليين ) و باجەلأن (باجلان )، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، بەرگی (٢٣– ٢٤ )، القسم العربي، (بەغدا : ١٩٩٢ )، ص ٢٤٦.

(2)– محمد علی سلطانی، جغرافیای تاریخی و تاریخ مفصل کرماشان، ایلات طوایف کرمانشاهان، شامل اوضاع اقلیمی، تاریخی، سیاسی، اجتماعی و اقتصادی، جلد دوم و جلد سوم، (تهران : ١٣٨١ )، ص ٨٨٥، مظاهر باجلان، ایل باجلان از صفوية تا عصرحاضر، حکمرانان و حوادث تاریخی باجلانهای عراق، زهاب، لرستان و قزوین، (قزوین: ١٣٩٠ )، ص ٩.

(3) – عەباس عەزاوی : لە ساڵی (١٨٩١ )دا لە دیالە هاتۆتە دونیاوە، لە سێ ساڵەی تەمەنیدا، باوکی دەکوژرێ و لەم هەلومەرجە بەدواوە لەگەڵ دایکی و عەلی غالیبی برایدا هاتوونەتە لای حاجی ئەشکەنجی مامیان لە بەغدا و پلەکانی خوێندنی هەر لەم شارەدا و بەتورکی دەست پێکردووە و لە ژێر چاودێریی هەردوو مامۆستای ناسراوی ئەوکاتەی بەغدا مەحموود شوکری ئالووسی و عەلی عەلائەدینی ئالووسی دا، زانستی ئایینی و زمانی عەرەبی خوێندووە و نزیکەی چل ساڵ پارێزەری کردووە و لە چەندین ڕێکخراوی مێژوویی و زانستیدا ئەندامی کارا بووە، تا ئەوکاتەی بووە بەو ڕووناکبیرەی، کە بەخاوەنی زۆرترین بەرهەمی مێژوویی دادەنرێت، سەبارەت بەعێراق لە نێویاندا، کتێبی: (تاريخ العراق بين الاحتلالين )، لە (٨ ) بەرگدا، جگە لەوەش یەکێکە لەو ڕووناکبیرانەی کە بایەخێکی زۆری بە کورد و مێژووی گەلی کورد داوە و بەشێوازێکی مەیدانی بە زۆربەی وڵاتی کوردەوارییدا گەڕاوە، هەروەها توانیویەتی چاوی بە دەیان گەورە پیاوی ناسراو و کەسایەتی ئایینی و سەرۆك هۆزی ساڵانی سەدەی بیستەمی ڕابردووی کوردستان و ناوچەکە بکەوێت و لەڕێی ئەمانەوە توانیویەتی بەڕادەیەکی زۆر باش زانیاریی گرنگ لەسەر هۆز و بۆچوونە ئایینییەکانەوە، کۆبکاتەوە و لەبارەیانەوە بنووسێت و لە (١٧ تەمووزی ١٩٧١ ) دا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: محمد علي قرداغي، شهرزور، السليمانية، (بغداد: ٢٠٠٠ )، ص ٨، طارق نافع حامد الحمداني، التدوين التاريخي في العراق، (بغداد : ٢٠١٠ )، ص ٢١٦– ٢٢٠ .

(4) – جمال بابان، نظرة الى تاريخ عشيرتي (پشدر – الميراودليين ) وباجەلأن (باجلان )، ص ٢٤٨ .

(5) – کاتب چەلەبی : ناوی مستەفای کوڕی عەبدوڵڵای حەنەفی ئەستەمبووڵییە، شوباتی (١٦٠٩ ) لە دایك بووە . باوکی لە ماوەی حوکمی عوسمانیدا فەرمانبەری گەنجینە بووە، وەك نووسەری بەشی ژمێریاری ئەنادۆڵ، سەرەتاکانی خوێندنی زۆر پوخت نەبووە، بەڵکو باوکی هەر لە تەمەنی لاوییەوە کردوویەتی بە شاگردی خۆی لە بەشی ژمێریاری و لە

زۆربەی گەشتەکانیدا بۆ ئەنادۆڵ و بەغدا یاوەری بووە، لە مردنی باوکی بەدواوە، کە گەڕاوەتەوە ئەستەمبووڵ، یەکێك لە هاوڕێکانی ئەو بە ناوی (محەمەد خەلیفە ) لە بەشی وردبینی دایمەزراندووە، بەحوکمی پیشەکەی زۆر ناوچەی دەوڵەتی عوسمانی گەڕاوە و لە نێو هاوەڵانیدا بە (کاتب چەلەبی ) ناسراوە، هەروەها لە نێو کارمەندانی دیوانی هەمایوونیشدا بە (حاجی خەلیفە ) ناسراو بووە و نزیکەی (٢٠ ) ساڵ لە (مقابلە سواری )دا ماوەتەوە و لەو هەموو داهاتەشی، کە لە باوك و کەس و کارییەوە بۆی مابووەوە، جگە لە پێکەوەنانی ژیانی هاوسەری و ماڵ و کتێبخانەیەکی گەورە . لە ژیانیدا گەلێك دانراوی بە زمانی تورکی و عەرەبی لە دوا بەجێماوە . ینظر: الدکتور خلیل علي مراد، الکرد و کردستان في کتاب (جهان نما ) لکاتب جلبي (١٠١٧– ١٠٦٧ هجری / ١٦٠٩– ١٦٥٧ میلادی)، (اربیل : ٢٠١٣ )، ص ٥– ١٤ .

(٦) – خلیل علي مراد، الکرد و کردستان في کتاب ، ص ٥٧ .

(٧) – بڕوانە : مظاهر باجلان، ایل باجلان از صفویة تا عصر، ص ٨، جمال بابان، نظرة الی تاریخ عشیرتي، ص ٢٤٦.

(٨) – گیوی موکریانی ، فەرهەنگی کوردستان ، (هەولێر : ١٩٩٩) ، ل٥٠.

(٩) – توفیق وهبي، الآثار الکاملة، اعداد : رفیق صالح، الطبعة الثانیة، (بغداد : ٢٠١١ )، ص ١٥٠ .

(١٠) – علی اکبر دهخدا، لغت نامەی دهخدا، شمارە مسلسل (٣١)، شمارە حرف (ب )، (تهران : ١٣٣٦)،ل ١٧٣.

(١١) – مێجەر ئی . بی . سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ٣٨، تقریر دائرة الحاکم المدني في العراق (سنه ١٩١٩ ) : ملاحظات عن عشائر کردستان الجنوبیة (بین الزاب الکبیر ودیالی )، ص ٢٢– ٢٣ .

(١٢) – خلیل علي مراد، الکرد وکردستان، ص ٥٧ .

(١٣) – توفیق وهبي، الآثار الکاملة ، ط٢، ص ١٥١ .

(١٤) – مستەفا پاشای باجەلآن : کوڕی عوسمان پاشای کوڕی ئەحمەد پاشای کوڕی قادر پاشای کوڕی عەبدوڵلا پاشای کوڕی ئەحمەد پاشای باجەلآنە، لە ساڵی (١٨٤١ )دا، لە خانەقین لە دایك بووە و سەرەتاکانی خوێندنی لێرەوە دەست پێکردووە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی عوسمانیدا، قائمقامی شارەکانی : بەدرە و جەسان، مەندەلی، عەزیزیە و خانەقین بووە . پێش بەرپابوونی شۆڕشی دەستووری (١٩٠٨ ) دوورخراوەتەوە بۆ ئەستەمبوڵ و دواتر بە بڕیارێکی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی ئازاد کراوە و لە ماوەی داگیرکاری سوپای رووسیاشدا بۆ شاری خانەقین و ساڵی (١٩١٦ ) پەنای بردۆتە بەر بەریتانییەکان و بەپێی هەفتەنامەی (پێشکەوتن ) لە کۆتاییەکانی مارتی (١٩٢١)دا کۆچی دوایی کردووە . تقریر دائرة الحاکم المدني في العراق (سنة ١٩١٩ ) : ملاحظات عن عشائر

کردستان الجنوبية ، ص ٢٥، هەفتەنامەی (پێشکەوتن )، ژمارە (٤٩ )، پێنجشەمە، ٣١ی مارتی ١٩٢١، ل ٣، ابراهيم باجلان، مصطفى باشا باجلان والدفاع عن القضية الكردية ١٨٤١–١٩٢١، الاتحاد (جريدة )، العدد (٢٩٨١)، السبت ٢٦/ ٥/٢٠١٢.

[١٥] – بنكورە یان بنكدرە : ناوچەیەكی بەرفراوانی كشتوكاڵی بەپیتە، بەپێی هەندێك سەرچاوە لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی عوسمانی و لە ساڵی (١٨٧٥ )دا، لەگەڵ شارۆچكەی (قزلڕەبات )دا، وەك دوو ناحیەی سەر بەقەزای خانەقین و سەر بە ویلایەتی بەغدا بوون، ماوەیەك ناوەندەكەی گوندی (شێرەوەند ) و دواتر گواستراوەتەوە (بانزەمین ) تا ئەوكاتەی لە ساڵی (١٩٣٢ )دا (قۆرەتوو ) كراوەتە مەركەزی ناحیە و جێگای گرتۆتەوە . هاوكات لە زۆر سەرچاوەی مێژوویی و نووسراوی فەرمی چ عوسمانی و چ پاشایەتی لەعێراقدا بەڕوونی ناوی هاتووە و وەك هەڵكەوتەی جوگرافی ئەم ناوچەیە لای باكووری : گوندی باریكە و لای ڕۆژهەلأتی كلكەی كەنی زەردە . لە باشوورەوە (ملەكونار) و هەرچی لای ڕۆژئاوایەتی گوندی (كانی ماسی ) و ڕووباری سیروانە، تا ناوەڕاستی حەفتاكانی سەدەی بیستەمی ڕابردوو و دەستپێكردنی پرۆسەی تەعریب لەم ناوچەیەدا، نزیكەی (٢٥ – ٣٠ ) گوندی ئاوەدان بووە . بڕوانە : جميل موسى النجار، الادارة العثمانية في ولاية بغداد، من عهد الوالي مدحت باشا الى نهاية الحكم العثماني ١٨٦٩– ١٩١٧، (القاهرة : ١٩٩١)، ص ١٣٣، دیدەنی لەگەڵ ئیبراهیم باجەلأن، خانەقین، ٥ / ١٠ / ٢٠١٥ .

[١٦] – مێجەر ئی . بی . سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەكانی كوردستانی خواروو، ل ٣٨ .

[١٧] – مظاهر باجلان، ايل باجلان از صفوية تا عصر حاضر، مصدر پيشين، ص ٩٣ .

[١٨]– مظاهر باجلان، مصدر پيشين ، ص ٩٣ – ١٨١ .

[١٩] – محمد على سلطاني، جغرافياى تاريخى و تاريخ مفصل كرماشان (٢ )، ايلات طوايف كرمانشاهان، شامل اوضاع اقليمى، تاريخى، سياسى، اجتماعى و اقتصادى، جلد دوم و جلد سوم، ص ٨٨٤.

[٢٠] – مظاهر باجلان، مصدر پيشين ، ص ١٢٢ .

[٢١]– دكتر كريم سنجابى، ايل سنجابى و مجاهدت ملى ايران، خاطرات على اكبرخان سردار مقتدر سنجابى،(تهران : ١٣٩٣ )، ص ١٩ .

[٢٢] – علي الكعبي، عشائر دجلة والفرات، الرافدين للطباعة والنشر والتوزيع، (بيروت : ٢٠١٣ )، ص ٦٥ .

[٢٣] – تقرير دائرة الحاكم المدني في العراق (سنة ١٩١٩ ) : ملاحظات عن عشائر كردستان الجنوبية ، ص ١٩.

[٢٤] – ثامر عبدالحسن العامري، موسوعة العشائر العراقية، ج٨ ، ص ٢٦٠ .

[٢٥] – دیدەنی لەگەڵ عادیل مەجید قادر ئاغای عەزەم خانی جموور، كەلار، ٢٣/ ١٠ / ٢٠١٥ .

[٢٦] – دیدەنی لەگـەڵ حیشـمەت مەجید قادرئاغـای عـەزەم خـانی جمـوور، کـەلار، ٢٩ / ١٠ / ٢٠١٥ .

[٢٧] – دیدەنی لەگەڵ ئیسماعیل خانی کوڕی مەجید خـانی کـوڕی عـەزیزخانی سـالار سـوڵتان، کەلار، ٢٦/ ١٠ / ٢٠١٥ .

[٢٨] – ثامر عبدالحسن العامري، موسوعة العشائر العراقية، ج٨، ص ٢٦١– ٢٦٢ .

[٢٩] – مێجەر ئی . بی . سۆن، چەند سـەرنجێك دەربـارەی هۆزەکـانی کوردسـتانی خـواروو، ل ٣٥ .

[٣٠] – مێجەر ئی . بـی . سـۆن، چـەند سـەرنجێك، ل ٣٦– ٤١، تقريـر دائـرة الحـاكم المـدني في العراق (سنة ١٩١٩ ) ، ص٢٦.

[٣١] – میهرداد ئێزەدی، چەردەباسێك لەبارەی کوردانەوە، وەرگێڕانی : ئەمین شـوان، دەزگـای چاپ و پەخشی سەردەم ، (سلێمانی : ٢٠٠٧ )، ل ١٨٠ .

[٣٢] – عباس العزاوي، تاريخ العـراق بـين الاحـتلالين، حكومـة المماليـك ١٧٤٩– ١٨٣١، يتنـاول الحـوادث التاريخيـة والصـلات بـين الاقطـار والتشـكيلات الاداريـة والثقافيـة العامـة والحـالات الاجتماعية، ج٦، (قم : ١٣٨٣ )، ص ١٦٥ .

[٣٣] – عباس العزاوي ، عشائر العراق (الكردية )، (بغداد : ١٩٤٧ ) ، ص١٨٣.

[٣٤] – توفيق وهبي، الآثار الكاملة، ط٢، ص ١٥٨

[٣٥] – جمال بابان، نظرة الى تاريخ عشيرتي(پشـدر — الميراودلـيين ) وباجـەلآن (بـاجلان )، ص ٢٥١ .

[٣٦] – جمال بابان، نظرة الى تاريخ عشيرتي ، ص ٢٥٢ .

[٣٧] – محمد على سلطاني، جغرافيـاى تـاريخى و تـاريخ مفصـل كرماشـان (٢ )، ايـلات طوايـف كرمانشاهان، شامل اوضاع اقليمـى، تـاريخى، سياسـى، اجتمـاعى و اقتصـادى، جلـد دوم و جلد سوم، ص ٨٨٣– ٨٨٤ .

[٣٨] – ڕەشید باجەلآن : ساڵی (١٩٢٠) لە گوندی (تازە شـار ) ی ناوچـەی (بنکـوورە ) هاتۆتـە دونیاوە، قۆناغەکانی خوێندنی لە خانەقین و بەعقوبە و بەغدا تەواو کردووە، لەگەڵ عـەزیز پشـتیوان و محەمـەدی ئـەمین دەربەنـد فەقـەرەیی و چـەند کەسـایەتییەکی تـردا حیزبـی (برایەتی )یان دامەزراندووە، دوای هەڵوەشانەوەی پەیوەندی کـردووە، بـە حیزبـی (هیـوا ) وە و لە ڕێگای هەریەك لە سەید تـاهیری هـاشمی و ئیبراهیمـی نادرییـەوە پەیوەندییـەکانی نێوان حیزبی هیوا و لقی (ژ . ك )ی ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان لـە ناوچـەی کرماشـان و کـەڵهوڕ هاتۆتـە کایـەوە، دوای هەڵوەشـانەوەی هیـوا لـە سـاڵی (١٩٤٥) دا، بەشـداریی کـۆنگرەی دامەزرانـدنی (حیزبـی ڕزگـاری کـورد )ی کـردووە و بـە ئەنـدامی کۆمیتـەی ناوەنـدی هەڵبـژێردراوە، لـە (١٦ی ئـابی ١٩٤٦ ) دا، ئەنـدامی دەسـتەی دامەزرێنـەری (پـارتی دیموکراتی کورد ) بووە لە بەغدا و بە ئەندامی کۆمیتـەی ناوەنـدی هەڵبـژێردراوە، جگـە لـە

چالاکی حیزبی ماوەیەك پارێزەری و حاکمی شارەکانی : خانەقین، بەعقوبە، کەرکووك، شارەبان، بەسرە، حللە، عیمارە، کازمیە، روسافە بووە و لە حوزەیرانی (١٩٨٣ ) دا، خانەنشین کراوە و لە ساڵی (١٩٨٨) دا دووبارە هێنراوەتەوە ناو ژیانی وەزیفییەوە و کراوەتە قازی دادگای تاوانەکان و لە کۆتایی ساڵی (١٩٩٢ ) دا، دەستبەرداری کاری وەزیفی بووە، پاشماوەکانی ژیانی بە خوێندنەوە بەسەر بردووە و لە (١٦ شوباتی ٢٠٠١) دا، لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە بڕوانە : سدیق سالح، لە کتێبی : بەهار ڕەشید، ڕەشید باجەلان تێکۆشەرێکی دێرینی کوردایەتی ١٩٢٠– ٢٠٠١،(سلێمانی : ٢٠٠٩ )، ل ١٣– ١٦ .

(٣٩) – جمال بابان، نظرة الى تاريخ عشيرتي (پشدر – الميراودليين ) و باجەلان (باجلان )، ص ٢٥١ .

(٤٠) عبد عون الروضان، موسوعة عشائر العراق، المكتبة الاهلية ، ج١، ط٢، (بيروت : ٢٠٠٨ )، ص ٥٤ .

(٤١) – تقرير دائرة الحاكم المدني في العراق (سنة ١٩١٩ ) ، ص ٢٤ .

(٤٢) – ئیدریس عەبدوڵلا ئۆمەر گۆمەتی، لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە، (سلێمانی : ٢٠١٥ )، ل ٦٥– ٨٨ .

(٤٣) – فوئاد حەمە خورشید ، زمانی کوردی و دابەشبوونی جوگرافی دیالێکتەکانی ، و: حەمە کەریم هەورامی و عوسمان عەلی قادر ، (بەغدا: ١٩٨٥ ) ، ل٧٢.

(٤٤) – جمس بكنغهام، رحلتي الى العراق، ترجمة : سليم طه التكريتي، الجزء الثاني، ساعد المجمع العلمي العراقي على نشره، مطبعة دار البصري، (بغداد : ١٩٦٩ )، ص ٢١٣.

(٤٥) – جمس بكنغهام، رحلتي الى العراق، ج٢، ص ٢٣٣ .

(٤٦)– المصدر نفسه، ج٢، ص ٢٣٨– ٢٣٩ .

(٤٧) – المصدر نفسه، ج٢، ص ٢٣٩ .

(٤٨) – محمد بن أحمد الحسيني المنشي البغدادي، رحلة المنشىء البغدادي الى العراق، ترجمة : عباس العزاوي، (بيروت : ٢٠٠٨ )، ص ٢٧– ٣١، عەبدولعەزیز سلێمان نوار، داود پاشا والى بەغدا، و: عوسمان عەزیز عەلاف،(سلێمانی : ٢٠١٢ )، ل ٢١٢– ٢٢٢.

(٤٩)– کلاودیوس جەیمس ریچ، گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، ب٢، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە : مینە، (سلێمانی : ٢٠١٢ )، ل ٢٦٢– ٢٦٣ . محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، خانەقین لە مێژوودا، بەشی دووەم، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد )، بەرگی ٢١– ٢٢، (بەغدا : ١٩٩٠ )، ل ٣٦٣ .

(٥٠)– فەرامەرز ئاغا بەیگی، کورد لە سەفەرنامەکاندا، کوردەکانی ئێران، لە سەردەمی سەفەوییەوە تا کۆتایی پەهلەوی، (هەولێر : ٢٠١٤ )، ل ٢٤ .

(٥١)– هێنری بێندەر، سەفەرنامەی هێنری بێندەر، کوردستان، میزوپۆتامیا، ئێران، وەرگێڕانی: ئەبوبەکر خۆشناو، (سلێمانی : ٢٠٠٦ ) ل ٤١٨– ٤٢٠ .

(٥٢) – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣٠ –٤٣١ .

(٥٣) – المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، كتاب يبحث عن العراق في عهد الاحتلال البريطاني بين سنتي ١٩١٤– ١٩٢٠، نقله الى العربية : جعفر الخياط، (بغداد : ١٩٧١ )، ص ١٤١، ئی . جەی . ئارِ، پوختەی کاروباری جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی، و : مەهاباد سالّح، (سلێمانی : ٢٠١١ )، ل ١٤– ١٥، احمد عثمان ابوبكر، كردستان في عهد السلام بعد الحرب العالمية الاولى، رابطة كاوا للثقافة الكردية (بيروت : ٢٠٠٢ )، ص ١٦٠ .

(٥٤) – تقرير دائرة الحاكم المدني في العراق (سنة ١٩١٩ ) ، ص ٢١، مێجەر ئی . بی . سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ٣٧ .

(٥٥) – المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب ، ص ١٤٢ .

(٥٦) – احمد عثمان ابوبكر، كردستان في عهد السلام بعد الحرب العالمية الاولى، ص ١٥٨ .

(٥٧) – احمد عثمان ابوبكر، كردستان، ص ١٦١– ١٦٢ .

(٥٨) – المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، ص ١٤١– ١٤٤، ئی . جەی . ئارِ، پوختەی کاروباری جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی، ل ١٦– ١٨ .

(٥٩) – دیدەنی لەگەڵ ئیسماعیل خانی کوڕی مەجید خانی کوڕی عەزیزخانی سالار سوڵتان، کەلار، ٢٦ / ١٠ / ٢٠١٥ .

(٦٠) – محمد على سلطانى، جغرافياى تاريخى و تاريخ مفصل كرماشان (٢ )، ايلات طوايف كرمانشاهان، ص ٨٩٦– ٨٩٩، کاوەی بەیات، خۆرهەلآتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆی ئێراندا، و: مستەفا غەفوور، (هەولێر : ٢٠١٣)، ل ١٦٤– ١٦٦.

(٦١) – کاوەی بەیات، خۆرهەلآتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوخۆی ئێراندا، ل ١٧٩ .

(٦٢) – فاضل كريم احمد، خانقين خلال ربع قرن ١٩٠٠– ١٩٢٥، (السليمانية : ٢٠٠٥ )، ص ٣٣ .

(٦٣) – ڕەشید شەوقی : لە ساڵی (١٨٩٤ )دا، لە سلێمانی هاتۆتە دونیاوە، ماوەیەك لای شێخ عەبدوڵلای باپیری خوێندوویەتی و پاشان لە ڕوشدیەی عەسکەری سلێمانی و ئامادەیی عەسکەری بەغدا و دواتریش قوتابخانەی حەربیەی لە ئەستەمبوولّ تەواوکردووە و بۆتە مولازمی یەکەم لە سوپای دەولەتی عوسمانیدا، لە سالآنی جەنگی یەکەمدا لە ئەدرنە و چەناق قەلعەو شام و بەرەکانی عێراق و ئێراندا بەشداری کردووە . لە ماوەی حوکمداریەتی دووەمی شێخ مەحموودا ئەفسەری سوارەی تایبەت بووە، ماوەیەکیش لە ڕیزەکانی سوپای عێراقدا کاری کردووە، هاوکات لەگەڵ سالّح زەکی ساحێبقراندا گۆڤاری (دیاری کوردستان )یان لە شاری بەغدا بلآوکردۆتەوە . لە (١٨/ ١٠ / ١٩٦٧ ) دا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە . بڕوانە : ئەحمەد باوەڕ، دیاری کوردستان لاپەڕەیەکی پرشنگدارە لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا ١٩٢٥– ١٩٢٦، (سلێمانی : ٢٠٠٤ )، ل ٢٠– ٢١، سدیق سالّح، دیاری کوردستان، (سلێمانی : ٢٠٠١ )، ل ٧٣– ٧٤.

[٦٤] – سدیق ساڵح، بەسەرهاتووی کاکە ڕەشید شـەوقی (سەرگوزشـتە )، (سـلێمانی : ٢٠٠٣ )، ل ٣١٤ .

[٦٥] – سدیق ساڵح، بەسەرهاتووی کاکە ڕەشید شەوقی، ل ٣١٥ .

[٦٦] – محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، خانەقین لە مێژوودا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێـراق، (بـەرگی ٢١–٢٢))، ب٢، ل ٣٧٠.

[٦٧] – علي الكعبي، عشائر دجلة والفرات، ص ٦٥، دیدەنی لەگەڵ ئیبراهیم باجەلآن، خانـەقین، ٥/ ١٠ / ٢٠١٥ .

[٦٨] – میر شەرەفخانی بەدلیسی : ساڵی (١٥٤٣ ) لە شارۆچکەی (گروهورد )ی سەر بـە(قـوم ) لە دایك بووە، ئەمەش لە کاتێکدا بووە، کە مـیر شەمسـەدینی بـاوکی حـەوت سـاڵی تـەواو بوو، پەیوەندی بە فەرمانڕەوایانی سەفەوییەوە کردبوو، بەتایبەتی لە ماوەی حوکمڕانیـەتی شا تەهماسبی یەکەمدا، دایکی کچی (ئەمیر خانی موسلۆ ) بووە، لەوکاتەوە کـە بـاوکی لـە کاروبـاری فەرمانڕەوایـەتی دوورخرایـەوە، تـوانی بگاتـە دەسـەلآت و ماوەیـەك کاروبـاری ناوچەکانی ساڵیان و مەحموود ئاباد و گەیلانی خراوەتە ئەستۆوە، لە مردنی تەهماسب شـا بەدواوە ئیسماعیل مـیرزای دووەم بەهـەمان شـێوازی پێشـوو، بـانگی کـردە لای خـۆی لـە (قەزوین ) و پلەی (مـیری مـیران ) ی لـە ناوچـە کوردنشـینەکان و لوڕسـتان و گـۆرانی پـێ سپارد . دواتـر بـە هـۆی هەنـدێك پیلانـی کاربەدەسـتانی سـەفەوییەوە و تێکـەوتنی چـەند کەسایەتییەك لای سوڵتانی عوسمانی موڕادی سێیەم، بـەوەی موڵکـەکانیان بـۆ بگێڕنـەوە، گەڕاوەتەوە و کراوەتە فەرمانڕەوای بەدلیس و نازناوی (خان ) ی دراوەتێ، لـە (١٥٩٧ )دا، لـە کاروبـاری بـەڕێوەبردن دوورکەوتۆتـەوە و کتێبـی: (شـەرەفنامە )ی بـە زمـانی فارسـی نووسـیوەتەوە و لـە (١٦٠٣ ) دا کۆچـی دوایـی کـردووە بڕوانـە: مصـطفى احمـد النجـار، شرفخان البدليسي ومنهجه التاريخي من خلال كتابه شـرفنامه، (دهـوك : ٢٠٠٧ )، ص ٣٦– ٤١، محمد علي الصويركي، معجم اعلام الكرد، (السليمانية : ٢٠٠٦ )، ص ٣٤٣ – ٣٤٤

[٦٩] – محمد على سلطانى، جغرافيـاى تـاريخى و تـاريخ مفصـل كرمانشـاهان، ايـلات و طوايـف كرمانشاهان، شامل اوضاع اقليمى تاريخى سياسى اجتماعى و اقتصـادى، جلـد دوم و جلـد سوم، ص ٨٨٦ .

[٧٠] – مصدر پیشین، ص ٨٨٦ .

[٧١] – جمال بابان، نظرة الى تاريخ عشيرتي، ص ٢٥٠– ٢٥١، توفيق وهبي، الآثـار الكاملـة، ص ١٥٣ .

[٧٢] – عبد الرقيب يوسف، حدود كردستان الجنوبية تاريخيـا وجغرافيـا خـلال خمسـة الاف عـام وماترتب على الحاقها بالعراق، (السليمانية : ٢٠٠٥ )، ص ١٤٣ .

[٧٣] – محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ب١– ب٢، (سـلێمانی : ٢٠٠٠ )، ل ٢٥٨ .

(٧٤) – ئیلی بانیستەر سۆن : سیاسەتمەدار و گەڕیدە و ئەفسەرێکی بەریتانی بووە، لە (١٦/ ٨ /١٨٨١ ) دا لە کنزنگتن لە دایك بووە، لە ساڵی (١٩٠٢) دا، هاتۆتە ئێرانی قاجاری و شار و ناوچەکانی : تاران، یەزد، بوشەهر و شیراز گەڕاوە، ماوەیەکیش بۆتە ژمێریاری بانکی شاهنشاهی و لە ساڵی (١٩٠٥ )دا، بۆتە موسڵمانی شیعە و لە شاری کرماشانیش کراوەتە بەڕێوەبەری بانکی شاهنشاهی، لێرە بەدواوە فێری زمانی کوردی دەبێ و . ماوەیەك حاکم یان جێگری حاکمی شارەکانی (قەسری شیرین ١٩١٣ )، (دیزفول ١٩١٦ )، (خانەقین ١٩١٧)، هەروەها بەمەبەستی لێکۆڵینەوە بەناو بەختیاریدا گەڕاوە و زانیاری کۆکردۆتەوە . جگە لە هەموو ئەوانەش بایەخێکی گەورەی بە بارودۆخی کوردستان داوە و بەشێوازێکی شۆفاری و بەناوی خواستراو و خۆگۆڕی (متنکر )ی میرزا غولآم حوسێنی شیرازییەوە، زۆر ناوچەی کوردستان گەڕاوە و لە ساڵی (١٩١٩) وە، کراوەتە حاکمی شاری سلێمانی و جێگای مێجەر نۆئێڵی گرتۆتەوە، پاشان بەهۆی نەخۆشی (سیل )ەوە، لە (٢٤ی شوباتی ١٩٢٣ ) دا، کۆچی دوایی کردووە بڕوانە : مێجەر ئی . بی . سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل١٥– ٢٢.

(٧٥) – تقرير دائرة الحاكم المدني في العراق، (بغداد )، (سنة ١٩١٩ ) ، ص ٢٣– ٢٥، عبدالرقيب يوسف، حدود كردستان الجنوبية تاريخيا وجغرافيا خلال خمسة الاف عام وماترتب على الحاقها بالعراق، ص ١٤٢ .

(٧٦) – زولفخار جلاير، فتوحات ايرانيان به فرماندهی نادرشاه افشار، انتشارات سخن گستر، (مشهد : ١٣٨٥ )، ص ١١٦– ١١٧ .

(٧٧) – مێجەر ئی . بی . سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ٣٨، مريم براتی فريز هندی، تاريخ جنگ های روسيه ايران ١٢٤٤– ١٢١٨، شركت مطالعات ونشركتاب پارسه، چ٢ (تهران : ١٣٨٧ )، ص ١٩.

(٧٨) – مريم براتی فريز هندی، تاريخ جنگ های روسيه ايران ١٢٤٤– ١٢١٨ ، ص ١٩ .

(٧٩) – زولفخار جلاير، فتوحات ايرانيان به فرماندهی نادرشاه افشار، ص ١١٧ .

(٨٠) – مصدر پيشين ، ص ١١٧– ١١٨ .

(٨١) – محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ب١– ب٢، ل ١٤٨ – ١٥٢.

(٨٢) – محمد بن احمد الحسيني المنشىء البغدادي، رحلة المنشىء البغدادي الى العراق، ص ٦١– ٦٢، ئیدریس عەبدوڵلآ ئۆمەر گۆمەتی، لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە، (سلێمانی : ٢٠١٥ )، ل ٤٨ .

(٨٣) – محمد بن احمد الحسيني المنشىء البغدادي، رحلة المنشىء البغدادي الى العراق، ص ٦١– ٦٢ .

[٨٤] – کارستین نیبور، سەفەرنامەی نیبور لە سەدەی هەژدەدا، و: ئەردەلآن عەبدوڵلآ، (هەولێر : ٢٠١٣ )، ل ١٠٦.

[٨٥] – بڕوانە : عباس پور ایران، روابط ایران و عثمانی درعهد صفویان، نشردستور، (مشهد : ١٣٨٥ )، ص ١٤٢، علي شاكر علي، تاريخ العراق في العهد العثماني ١٦٣٨– ١٧٥٠، دراسة في احواله السياسية، مطبعة اوفسيت الشعب، (الموصل : ١٩٨٤ )، ص ٧٣– ٧٩، ئەحمەد حەمەدەمین و دڵشاد مەحموود، کاریگەریی پەیماننامەی زەهاو (١٦٣٩ ) لە سەر کوردستان، دەزگای توێژینەوەو بلآوکردنەوەی موکریانی، (هەولێر : ٢٠١١ )، ل ٣٨– ٣٩ .

[٨٦]– عبد الرقيب يوسف، حدود كردستان الجنوبية، ص ١٤٢ .

[٨٧] – مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی : لە ساڵی (١٩١٣ )دا، لە گوندی (فەرقان )ی ناوچەی (قەرەحەسەن ) لە دایك بووە، خوێندنی سەرەتایی ئاینی لای باوکییەوە دەسپێکردووە و . لە ساڵی (١٩٢٢ ) دا، کە شێخ مەحموود لە دوورخراوەیی دەگەڕێتەوە، مەلا ئەحمەدی باوکی لەگەڵ خۆیدا دەباتە سلێمانی و بۆ ماوەیەك، دەبێت بەئیمامی مزگەوتی گەورەی شار و مەلا جەمیل لەوێ بەشێك لە زانستەکانی دی دەخوێنێ، دوای دەسەلآتی شێخ مەحموود دووبارە دەگەڕێنەوە ناوچەکەی خۆیان و لێرە بەدواوە مەلا جەمیل لە گوندی (باداوە ) دەچێتە قوتابخانەی فەرمی دەوڵەت و لە پۆلی چوارەم وەردەگیرێت . دواتر بە مەبەستی خوێندن دەچێتە کەرکووك و پردێ و هەولێر و لە (١٩٣٤ ) دا، باوکی دەکوژرێ و لە (١٩٣٥ ) دا، دێتە شاری کفری و لەساڵی (١٩٣٧ )دا، دەگەڕێتەوە شاری کەرکووك و دەبێتە جێنشینی مەلاڕەزای واعیز لە مزگەوتی (قیردار ) و لە ساڵی (١٩٤٢ ) دا، ئیجازەی زانستی وەردەگرێ، بەهۆی هەڵوێستە نیشتمانییەکانیەوە چەندین جار دەخرێتە زیندانەوە یان دوور دەخرێتەوە بۆ : حەویجە، نوگرە سەلمان، ناسریە، خورماڵ، بەسرە، عیمارە و لەساڵی ( ١٩٦٣ ) دا پەیوەندی دەکاتە شۆڕشی کوردستانەوە و لەساڵی (١٩٦٤ ) بەدواوە دەچێتە ئێران و لە ڕادیۆی کوردی تاران دادەمەزرێت، تا ڕووخانی سیستەمی پەهلەوی لەوێ دەبێ و پاشان دەگەڕێتەوە بەغدا . ماوەیەك لە (کۆڕی زانیاری کورد) و دواتر (دەستەی کورد)ی کۆڕی زانیاری عێراق کار دەکا و لە (٢٧ ئایاری ٢٠٠١ )دا، لەناو ماڵەکەی خۆیدا لە شاری بەغدا تیرۆر دەکرێت . بڕوانە : شێرزاد محەمەد ئەمین ڕۆژبەیانی، کورتەی ژیاننامەی شەهیدی خامە مەلاجەمیلی ڕۆژبەیانی، ئەدگار، پاشکۆی کوردستانی نوێ، ژمارە (٥٩٩٤ )، دووشەممە، ٤/ ٢ / ٢٠١٣ .

[٨٨] – محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، خانەقین لە مێژوودا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، (بەرگی ٢١– ٢٢ )، ل ٣٧٣.

[٨٩] – فاضل كريم احمد، خانقين خلال ربع قرن ١٩٠٠– ١٩٢٥، ص ١٩ .

[٩٠] – الشيخ رسول الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، نقله عن التركية : موسى كاظم نورس، دار الكتاب العربي بيروت، مكتبة النهضة، (بغداد: بلا )، ص١٨٦،

عباس العزاوي، تاريخ العراق بين الاحتلالين، حكومة المماليك ١٧٤٩– ١٨٣١، ج٦، ص ١٠١، محمد امين زكي، تاريخ السليمانية وانحائها، ت : محمد جميل بندي الروزبياني، (بغداد : ١٩٥١ )، ص ١٢٢.

(٩١) – عبدالرقيب يوسف، حدود كردستان الجنوبية، ص ١٤٣ .

(٩٢) – عبدالرقيب يوسف، حدود، ص ١٤٠ .

(٩٣) – عەبدولفەتاح پاشای باجەلآن : دەبێتە کوڕی گەورەی ئیبراهیم پاشای باجەلآن، لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی والیی بەغدا سلێمان پاشا و بەتایبەتی لە ساڵی (١٧٨٦ )دا، پاشایەتی (دەرنەو باجەلآن ) لە ئەستۆ دەگرێت . بەلآم دوای ماوەیەك و لە دەرئەنجامی ئەوەی بەهێزی سوپایی باجەلآنەوە هاوکاری تەواوی والی نەبووە، لە هێرشکردنە سەر سلێمانی شاوی و سوینی شێخی مونتەفیکدا، هەر بۆیە لەکاروباری دەسەلآت دووری دەخاتەوە و لەشوێنی ئەو عەبدولقادر پاشای بابان دەستنیشان دەکات . بڕوانە : جمال بابان، نظرة الى تاريخ عشيرتي ....، ص ٢٥٧ .

(٩٤) – الشيخ رسول الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، نقله عن التركية : موسى كاظم نورس، دار الكتاب العربي بيروت، مكتبة النهضة، (بغداد: بلا )، ص١٨٦ .

(٩٥) – عباس العزاوي، تاريخ العراق بين الاحتلالين، حكومة المماليك ١٧٤٩– ١٨٣١، يتناول الحوادث التاريخية والصلات بين الاقطار والتشكيلات الادارية والثقافية العامة والحالات الاجتماعية، ج٦، ص ١٠٠– ١٠١، الشيخ رسول الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ص ١٨٦، عبدالرقيب يوسف، حدود كردستان الجنوبية، ص ١٤٣ .

(٩٦)– عبدربه سكران ابراهيم الوائلي، تاريخ الامارة البابانية الكردية، (بغداد : ٢٠١٢ )، ص ٢٠٣.

(٩٧) – حسێن نازم بەگ، مێژووی میرایەتی بابان، و: حسێن حەسەن کەریم و سدیق ساڵح، (سلێمانی : ٢٠١٣ )، ل ٢٨٥.

(٩٨) – عبدربه سكران ابراهيم الوائلي، تاريخ الامارة البابانية الكردية ، ص ٢٠٤.

(٩٩) – الشيخ رسول الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ص٢٥٢، محمد امين زكي، تاريخ السليمانية وانحائها، ت : محمد جميل بندي الروزبياني، (بغداد : ١٩٥١ )، ص ١٢٢.

(١٠٠) – حسێن نازم بەگ، مێژووی میرایەتی بابان، ل ٢٨٨ .

(١٠١) – عبدربه سكران ابراهيم الوائلي، تاريخ الامارة البابانية الكردية ، ص ٢٠٥.

(١٠٢) – الشيخ رسول الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ص٢٥٣ – ٢٥٤، بەختیار سەعید مەحموود شوانی، کەرکووك لە سەدەی نۆزدەهەمدا، لێکۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی ڕامیاری و ئابووری، (سلێمانی : ٢٠٠٩ )، ل ٨٦.

(١٠٣)– حسێن نازم بەگ، مێژووی میرایەتی بابان، ل ٢٩١، عبدربه سكران ابراهيم الوائلي، تاريخ الامارة البابانية، ص٢٠٦.

(١٠٤) – الشيخ رسول الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء ، ص٢٥٢

(١٠٥) – تقرير دائرة الحاكم المدني في العراق، (بغداد )، (سنة ١٩١٩ )، ص ٢٤، مێجەر ئی . بی . سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەكانی كوردستانی خواروو، ل ٣٨ – ٣٩ .

(١٠٦) – عبدالعزيز سليمان نوار، العلاقات العراقية الايرانية، دراسة في دبلوماسية المؤتمرات، مؤتمر ارضروم ١٨٤٣– ١٨٤٤، دار الفكر العربي، (القاهرة : ١٩٧٤)، ص ٧٧– ٧٨ .

(١٠٧) – نەجاتی عەبدوڵڵا، كوردستان و كێشەی سنووری عوسمانی– فارسی ١٦٣٩– ١٨٤٧، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكریانی، (هەولێر : ٢٠٠١ )، ل ١١٥– ١١٦،

(١٠٨) – تقرير دائرة الحاكم المدني في العراق ، ص ٢٤، مێجەر ئی . بی . سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی، ل ٣٨ – ٣٩ .

(١٠٩) – ينظر : فاضل كريم احمد، خانقين خلال ربع قرن ١٩٠٠– ١٩٢٥، ص ١٩.

(١١٠) – سلێمان فایەق بەگ : ساڵی (١٨١٢ ) لە دایك بووە، بەرەسەن لەو مەملووكییانە بووە، كە لەسەردەمی عوسمانیدا هێنراونەتە عێراق و بەزۆری لە بەغدا ژیاوە، لە ژیاندا جگە لە نووسین، كە زۆربەیانی بەزمانی توركی نووسیوە، گەلێك پۆستی ئیداری وەرگرتووە و دەبێتە باوكی هەریەك لە : نەشئەت بەگ، راغیب بەگ، نەعمان بەگ، مەحموود شەوكەت پاشای سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ حیكمەت سولەیمانی سەرۆك وەزیرانی عێراق لە سەردەمی پاشایەتیدا و لە ساڵی (١٨٩٦ )دا، كۆچی دوایی كردووە و لەو مزگەوتەدا نێژراوە كە باوكی نزیك موتەسەرفیەتی بەغدا بونیادی نابوو، لە بەرهەمەكانی : (تاريخ بغداد )، (تاريخ المنتفك )، (تاريخ بغداد المسمى مرآة الزوراء )، (حروب الايرانيين في العراق )، (تاريخ الكولمند– المماليك ) . ينظر : سليمان فائق بك، تاريخ المماليك (الكولمند) في بغداد، نقله الى العربية : محمد نجيب ارمنازي، مطبعة المعارف، (بغداد: ١٩٦١)، ص ٦– ٧ .

(١١١) – عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج١٠، ط٧، (بغداد : ١٩٨٨ )، ص ٢٨٢ .

(١١٢) – عباس العزاوي، تاريخ العراق بين الاحتلالين، حكومة المماليك ١٧٤٩– ١٨٣١، يتناول الحوادث التاريخية والصلات بين الاقطار والتشكيلات الادارية والثقافية العامة والحالات الاجتماعية، ج٧، (قم : ١٣٨٣ )، ص ١٤٣، سليمان فائق بك، تاريخ المماليك (الكولمند ) في بغداد، ص ٥– ٦، محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، خانەقین لە مێژوودا، گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق، (بەرگی ٢١–٢٢ )، ب٢، ل ٣٥٩ .

(١١٣) – ينظر : عباس العزاوي، تاريخ العراق بين الاحتلالين، حكومة المماليك ١٧٤٩– ١٨٣١، ج٧، ص ١٦٥– ١٦٩.

(١١٤) – نەوشیروان مستەفا ئەمین، كوردستانی عێراق سەردەمی قەڵەم و موراجەعات ١٩٢٨– ١٩٣١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، (سلێمانی : ١٩٩٩ )، ل ٢٠، عبدالرقيب يوسف، حدود كردستان، ص ١٥٧– ١٥٩ .

## ملخص البحث

هذا البحث المعنون بـ (باجلان والإمارة الباجلانية في سياسة الدولة العثمانية والسلطات الحاكمة في إيران)، يسلط الضوء على جانب مهم من تاريخ الكورد في العصر الحديث عموما وتاريخ عشيرة باجلان والإمارة الباجلانية الكوردية المنسية بشكل خاص، التي تشكلت في القسم الشرقي الحالي من كوردستان (إيران)، إبان حكم الدولة العثمانية طوال القرن التاسع والعاشر والحادي عشر للهجرة، بحسب قول جمع من المؤرخين والرحالة الغربيين ، من أمثال كلوديث جيمس ريج (١٧٨٧– ١٨٢١ )، جيمس بكنجهام (١٧٨٦–١٨٥٥ )، ئيلى بانيستر سون (١٨٨١ – ١٩٢٣ ) والمؤرخ الكوردي الملا جميل الملا أحمد بندي الروزبياني (١٩١٣ – ٢٠٠١ ). وقاعدة هذه الإمارة الرئيسة هي مدينة (زهاب) التي بناها أحد الأمراء الباجلانيين في سهل زهاب، الذي كان مركزا مهما للصراع والتحدي العسكري المتواصل بين كل من الإمبراطورية العثمانية والسلطات الحاكمة في إيران من جهة، وكذلك صورة للأطماع والتدخلات الخارجية وخصوصا البريطانية – الروسية من جهة أخرى .

اعتمدت في كتابة هذا البحث على عدد من المصادر باللغات العربية والفارسية والكوردية المتنوعة وكذلك على بعض الكتب الوثائقية المترجمة. ناهيك عن بعض المقابلات الشخصية المتعلقة بالدراسة . ينقسم البحث إلى عدة محاور رئيسة : يتضمن المحور الاول تسمية باجلان والباجلانيين بحسب بعض الآراء والمصادر ودائرة المعارف التاريخية الرصينة . أما المحور الثاني فهو حول تواجد عشيرة باجلان في المناطق المتعددة في إيران وشرقى كوردستان، في حين يتناول المحور الثالث كيفية التوزيع السكاني والقبلي لعشيرة باجلان في المناطق والمحافظات العراقية، على سبيل المثال في محافظة نينوى، أربيل، كركوك ومركزهم الرئيسي في محافظة ديالى ولاسيما داخل الشريط الحدودي بين كل من العراق وإيران ناهيك عن (سهل بنكورة– بنقدرة ) التابع لقضاء خانقين . أما المحور الرابع والأخير فهو يركز على الإمارة الباجلانية ومتصرفية درنه وباجلان، حدودها، أمرائها، أبرز متصرفيها وكذلك على كيفية علاقتها مع الدولة العثمانية والسلطات الحاكمة في إيران، منذ عهد الدولة الصفوية (١٥٠١ – ١٧٣٦ ) إلى نهاية الحكم القاجاري عام (١٧٩٢– ١٩٢٥ ) ومجيء السلطة الشاهنشاهية البهلوية بقيادة رضاخان المازندراني (١٨٧٥– ١٩٤٤).

## Abstract

This research entitled: (Bajalan and The Emirate of Albajalani in the Ottoman state policy and the ruling authorities in Iran), sheds light generally on an important aspect of Kurds history in the modern century and the history of Bajalan clan and the forgotten Kurdish Emirate of Albajalani in particular, which formed in the recent eastern part of Kurdistan (Iran), during the rule of the Ottomani Empire throughout the ninth, tenth and eleventh hijri century, this is according to a group of historians and the western foreign travelers, like Claudet James Rigg (1787-1821), James Benjham (1786-1855), Eli Bannister Sun (1881-1923), as well as the Kurdish historian Mullah Jamil Mullah Ahmed Bundy Alrozhbaiani (1913 to 2001). The Emirate base home, was Zahab which built by one of the Albajalani's prince in Zahab area, in which it was an important center, from one hand, for the conflict and military challenge that continued between each of the Ottomani Empire and the authorities ruling in Iran as well as for the greed and foreign interventions especially by British - Russian on the other.

To compose this research, I depended on different Arabic, Persian and Kurdish sources, some published and translated documentary books, as well as some personal interviews related to the study. This research is divided into several main axes: the first axis includes: Naming of Bajalan and Albajalanis according to some views, sources and the discreet historical Encyclopedia (circle of knowledge).The second axis: it is about the presence of Bajalan clan in multiple areas of Iran and the east of Kurdistan, while the third axis: devoted to talk about the tribal and demographical distribution of Bajalan clan in the regions and provinces of Iraq, for example in Naynawa province, Erbil, Kirkuk and their main center in Diyala province and especially within the borderline between both Iraq and Iran, and not to mention (Bnkurah plain- Binkidra) of Khanaqin. The fourth and the last axis: It focuses on Albajlania Emirate and Drnna Provincial and Bajalan, its borders, princes, the most prominent provinces as well as how was their relationship with the Ottomani Empire and the ruling authorities in Iran, since the reign of the Safavid State (1501 - 1736) to the end of Qajari rule in (1792 -1925) and the beginning of Pahlavi power led Reza khan Almazindrani (1875-1944).

# بارودۆخی ئابووریی شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی (١٩٧٥- ١٩٩١)

م.ی. قارەمان حەیدەر رەحمان
کۆلێژی ئەدەبیات – زانکۆی سەلاحەددین

م.ی. ئارەزوو یوسف حەسەن
کۆلێژی ئەدەبیات – زانکۆی سەلاحەددین

**پوختە:**

ئەم بابەتە بریتییە لە توێژینەوەیەکی مێژوویی دەربارەی ڕەوشی ئابووریی شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٧٥–١٩٩١، کە تیایدا هەوڵدراوە کاریگەرییەکانی چالاکی کشتوکاڵ و ڕەوشی بازرگانی پیشەگەری و پیشەسازی و لایەنی گەشتوگوزاریی شارەکە بە ڕێبەری زانستی کاری لەسەر بکرێت. ئەم توێژینەوە بەگشتی پێکهاتووە لە پێشەکییەك و سێ تەوەر.

لەم توێژینەوەدا زیاتر تیشك خراوەتە سەر ڕەوشی ئابووریی شاری هەولێر لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٥–١٩٩١)، ئەو هۆکارە یارمەتیدەرانەی کە ڕەنگدانەوەیان هەبووە لەسەر هەڵکشان و داکشانی ئەو لایەنە. هەر بۆیە لە تەوەری یەکەمدا : باس لە کاریگەرییەکانی چالاکی کشتوکاڵی لەسەر شارەکە کراوە، هەر لەم سۆنگەیەشەوە هەوڵدراوە بایەخی ئەو هۆکارانەی بخەینە ڕوو کە کاریگەرییان هەبووە بۆ فەراهەمکردنی چالاکی کشتوکاڵی ناوچەکە، وێڕای باسکردنی سیستەمی ئاودێری کشتوکاڵی و سەرچاوەکانی ئاو و ئەو پرۆژانەی بۆ سوودی ئەو کەرتە ئەنجامدراون، کە دواتر هەریەکیان لەلای خۆیانەوە بەئاستی خۆی ڕێگا خۆشکەر بوونە بۆ گەشەکردنی لایەنی ئابووری لە شاری هەولێر. وێڕای باسکردنی سامانی ئاژەڵداری لە سنووری ناوچەکانی دەوروبەری شاری هەولێر و سوود وەرگرتنی خەڵکی شارەکە لە بەرهەمەکانی ئەو سامانە نەتەوەییە.

تەوەری دووەم : تایبەت کراوە بە کەرتی دووەمی ئابووری، کە ئەویش پیشەسازی و پیشەگەرییە لە شاری هەولێر بەپێی قۆناغی مێژوویی و چۆنیەتی

سەرهەڵدانی پیشەگەری و پیشەسازی و جۆرەکانی پیشەسازی لە شاری هەولێر بەپێی زنجیرەی مێژوویی باسیان کراوە.

تەوەری سێیەمی: توێژینەوەکە دابەشی سەر دوو لق کراوە. لە سەرەتا بە پوختی باس لە ڕەوشی بازرگانیی ئەو شارە و بایەخ و لایەنی بازرگانی شاری هەولێر لە ڕووی هاوردەکردن و هەناردەکرنی کەلوپەل و پێداویستی ناوچەکە کراوە، دواتر باس لە کەرتی گەشتوگوزار کراوە و کە تێدا ئەو هۆکارانەی بوونەتە پاڵنەر و یارمەتیدەر بۆ بووژانەوە و پەرەپێدانی کەرتی گەشتیاری دەستنیشان کراوە، ئەمەش بە هۆی بوونی شوێنەوارە مێژوورییەکان و مەزارگەی پیاوە ئاینییەکان و هونەری فۆلکلۆری لە شارەکە هەبووە. هەرچەندە بەشێکی ناوچە گەشتیارییەکانی ئەو شارە کەوتوونەتە سنووری پارێزگای هەولێر لە سنووری جوگرافی شاری هەولێر دەرچوونە، بەڵام بەهۆی کاریگەرییان لەسەر ڕەوشی ئابووریی شارەکە بە گوێرەی پێویست تیشکیان خراوەتە سەر. لە کۆتایی توێژینەوەکەدا، گەیشتووینەتە چەند دەرئەنجامێك کە لە تۆی چەند خاڵێکدا ئاماژەیان پێکراوە. لەگەڵ پوختەی توێژینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی.

**پێشەکی :**

بارودۆخی ئابووریی هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٧٥-١٩٩١ کە تایبەتە بەو ماوەیەی کە حکومەتی ناوەندی پیلانی گۆڕینی دیمۆگرافیای دانیشتوانی کوردستان و شار و شارۆچکەکانی تێدا داڕشتووە، هاوکات ئەو سیاسەتەش سنووری هەولێریشی گرتووەتەوە، کە ئەمەش ڕاستەوخۆ کاریگەری کردووەتە سەر ڕەوشی ئابووریی شاری هەولێر. کە ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لە سەر پێشکەوتن و دواکەوتنی کۆمەڵگا.

ڕەوشی ئابووریی شاری هەولێریش لەم ماوە مێژووییەدا بە بەشێکی گرینگی مێژووی شارستانیەتی ئەو شارە هەژمار دەکرێت، بووژانەوە و گەشەسەندنی توانای ئابووریی شارەکەش تاڕادەیەکی زۆر پەیوەست بووە بە بارودۆخ و ڕەوشی سیاسیی عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەت، هەربۆیە وردبوونەوە و هەڵسەنگاندنی لایەنی ئابووریی شاری هەولێر لە ڕوانگەی بایەخ و قۆناغە مێژووییەکان کارێکی سەخت و دژوارە. لە هەمان کات پێویستییەکی مێژووییە بۆ پڕکردنەوەی کەلینە مێژووییەکانی شارەکە.

سەبارەت بە بایەخی ئەو توێژینەوە کە ڕەوشی ئابووریی شاری هەولێر بەگشتی لە نێو ڕووداوە سیاسییەکانی عێراقدا ڕوونکراوەتەوە، تەواوی لایەنەکانی ئابووریی ناوچەی هەولێر بەپێی ئەو زانیاری و داتایانەی کە لەبەردەستدا هەن خراوەتە ڕوو. ئەمەش بەپێی ڕەوتی مێژوویی باس لە چالاکی و کەرتە بنەڕەتییەکانی ئابووریی شارەکە کراوە.

لەگرفتەکانی ئەو توێژینەوەیە: کەمیی زانیاری و سەرچاوەی تایبەت بە شاری هەولێر و کەمی و هەژاریی سەرچاوەکان لە ڕوانگەی بایەخی مێژووی ئابووریی شارەکە. ئەو زانیارییانەش کە بەردەست بوونە زیاتر لە ڕێگای بابەت و لێکۆڵینەوە گشتییەکانی کوردستانەوە بووە. بۆیە سۆراغکردن و لێکۆڵینەوە لە ڕەوتی ئابووریی شاری هەولێر تاڕادەیەك کارێکی سەخت و دژوارە. سەرباری کەم و پەرش و بڵاویی زانیاری و داتاکان.

ناوەڕۆکی توێژینەوەکە پێکهاتووە : لە پێشەکییەك و سێ تەوەری سەرەکی و ئەنجامی توێژینەوەکە. هەریەك لەتەوەرەکانیش چەندین بابەتی لە خۆیەوە

گرتووە. لە تەوەری یەکەمدا : تیشك خراوەتە سەر چالاکیی کشتوکاڵ لە شاری هەولێر و سیستەمی ئاودێری کشتوکاڵی و سەرچاوەکانی ئاو لەو شارەدا، جگە لە باسکردنی سامانی ئاژەڵداری.

تەوەری دووەم : تایبەتە بە پیشەسازی و پیشەگەرییەکانی لە شاری هەولێر بەپێی قۆناغی مێژوویی و چۆنیەتی سەرهەڵدانی پیشەگەری و پیشەسازی و جۆرەکانی لە شاری هەولێردا. تەوەری سێیەمی توێژینەوەکەش پۆلین کراوە بۆ سەر دوو لق. لە سەرەتادا بە پوختی باس لە ڕەوشی بازرگانیی ئەو شارە و بایەخ و گرینگی لایەنی بازرگانی شاری هەولێر بۆ هاوردەکردن و هەناردەکردنی کەلوپەل و پێداویستیی ناوچەکە کراوە، دواتریش ئاماژە بە بایەخی ناوچەکە کراوە لە بواری کەرتی گەشتوگوزارییەوە، لەم لایەنەوەش تیشك خراوەتە سەر ناوچەکانی سنووری پارێزگای هەولێر و کاریگەرییەکانی لەسەر ڕەوشی ئابووریی شارەکە. لە کۆتایی توێژینەوەکەدا دەرئەنجامەکان خراوەتە ڕوو.

لەم توێژینەوەیەدا زیاتر پشت بەو تێز و نامە زانستی و ئەکادیمییانە بەستراوە کە لە بەشەکانی ئابووری لە کۆلێژی کارگێڕی و ئابووری، هەروەها بەشی جوگرافیا لە کۆلێژی ئەدەبیات لە زانکۆی سەلاحەددین و زانکۆکانی دیکەی کوردستان و عێراق نووسراون لە بەر ئەوەی داتای ورد و پشت ڕاستکەرەوەیان خستۆتە ڕوو. لە هەمان کاتیشدا سوود لەو سەرچاوە کوردی و عەرەبییانە وەرگیراوە کە لە سەر ئابووریی کوردستان بەگشتی و ناوچەکە بە تایبەت نووسراون. وەك : (سەلاحەددین حەفید، ئابووری کوردستان (١٩٧٧ – ١٩٩٠ )، (کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، جیۆگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق)، (مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە، ب١)، لە سەرچاوە عەرەبییەکانیش ( حلاو حسین کریم، الصناعات الغذائیة في محافظة اربیل – دراسة في جغرافیة الصناعة )، (یاسین رسول یونس، تحلیل مسار الصناعات التحویلیة في محافظة أربیل للمدة (١٩٧٥– ٢٠٠٢)، (یاسمین حاجی صوفی، واقع القطاع السیاحي وآفاق تطوره في اقلیم کوردستان – العراق / أربیل حالة دراسیة )، هەروەها سوودمان لەو زانیارییانە وەرگرتووە کە هاوچەرخی ڕووداوەکان بوونە لە نێو لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بە شێوەی وتار و توێژینەوە نووسراون وەك ڕۆژنامەی هاوکاری و کاروان و گۆڤاری هەولێر.

**تەوەری یەكەم : ڕەوشی ئابووریی شاری هەولێر:**

دوای گۆڕانكارییەكانی ناوەڕاستی حەفتاكانی سەدەی بیستەم، شاری هەولێر وەك مەڵبەندی ناوەندی ناوچەی ئۆتۆنۆمی كوردستان دەركەوتووە، ئەمەش وای كردووە لە ڕوانگەی ئابووری و كۆمەڵایەتی و خزمەتگوزارییەوە زیاتر پێش بكەوێت [1]. هەر بۆیە چالاكی كەرتەكانی ئابووری شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٧٥– ١٩٩١ ، لە ژێر كاریگەری بارودۆخی سیاسیی وڵاتدا بەردەوام لە گۆڕاندا بووە. بەشێوەیەك بارودۆخی سیاسی و كۆمەڵایەتی لە قۆناغی( ١٩٧٥ – ١٩٨٠ ) تەواو جیاواز بووە، لەگەڵ قۆناغەكانی دوای خۆیدا. هۆكاری ئەمەش بە پلەی یەك دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران كە لە ١٩٨٠/٩/٤– ١٩٨٨/٨/٨ درێژەی هەبووە، هەر بۆیە حكومەتی عێراق لە پێناو بەدەستهێنانی سەركەوتن لەو جەنگەدا بەشی هەرە زۆری داهاتەكانی دەوڵەت دەخاتە خزمەتی سوپاكەی[2].

شەڕی نێوان عێراق و ئێرانیش ڕاستەوخۆ كاریگەریی نەرێنی لەسەر ڕەوشی ئابووریی عێراق بەگشتی و شاری هەولێر بە تایبەتی دروست دەكات. وێڕای بەردەوامبوونی حكومەتی عێراق لە سیاسەتی سەركوتكردنی كورد و بەردەوامیدان بە سیاسەتی ڕاگواستن و خاپووركردنی گوندەكانی كوردنشین لە سنووری پارێزگای هەولێر، بە ئامانجی سەركوتكردنی شۆڕشی كورد لە باشووری كوردستان، هەرچەندە ئەو گوندانە سەرچاوەی سەرەكی بەرهەمهێنان و پڕكردنەوەی پێداویستی ڕۆژانەی بازاڕ بوون، هاوكاتیش دەرفەتێكی زۆری كاركردنیان ڕەخساندبوو بۆ ئەو جووتیار و كرێكارانەی كە لە بواری كشتوكاڵیدا كاریان دەكرد، لەگەڵ دەستەبەركردنی كەرەستەی خاو بۆ دامەزراوە پیشەسازییەكان[3]. ئەمەش لە چوارچێوەی سیاسەتەكانی حكومەتی عێراق لەسەر كەرتەكانی ئابووری (كشتوكاڵ، پیشەسازی، بازرگانی و گەشتوگوزار ) بەڕوونی بەدیاردەكەون.

- **كەرتی كشتوكاڵ.**

چالاكی كشتوكاڵی ڕۆڵێكی گرنگی هەبووە لەسەر ئابووریی وڵاتان و بە یەكێك لە كەرتەكانی بەرهەمهێنان دادەندرێت لە پاڵ پیشەسازی و كانزاكان. ئەم كەرتە

لە زۆربەی وڵاتاندا داهاتێکی زۆری دەستەبەرکردووە. کشتوکاڵ جگە لەوەی کەرەستەی خاوی پیشەسازی دابین کردووە، هاوکات دەرفەتی کاری بۆ ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانەکان فەراهەم کردووە. لە کۆتاییشدا بەروبوومی کشتوکاڵی پشتیوانییەکی بە هێز بووە بۆ گوزەرانی دانیشتوان و سەرچاوەی داهات و گرنگترین ڕەگەزەکانی هاوردەکردن بووە[٤]. لەو ماوە مێژووییەدا چالاکی کشتوکاڵ بنەمای سەرەکی ئابووری دانیشتوانی گوندنشینی سنووری قەزا و ناحیەکانی دەوروبەری شاری هەولێر بووە، چونکە بارودۆخە سروشتییەکەی خۆی لە بوونی ڕووبەرێکی گەورەی زەوی شیاوی کشتوکاڵی دەبینێتەوە[٥].

شاری هەولێر، بەهۆی شوێنە جوگرافییەکەی کە دەکەوێتە سەر هێڵی پانی (٣٥- ٣٧) و هێڵی درێژی (٤٣-٤٥)، دەکەوێتە ناوەڕاستی ناوچەیەکی بە پیت بەسەر بانێکی تەختانییەوە کە نێونجی بەرزاییەکەی ١٣٠٠ پێیە. ئەم بانە پێیدەگوترێ قەزای هەولێر، هێڵی دابەشکردنی هەردوو زێی گەورە و بچووکە[٦]، زۆرترین داهاتە ئاوییەکانی شاری هەولێر دابین دەکات و بۆ مەبەستە شارستانییەکان سوودیان لێ وەرگیراوە[٧]. لە هەمان کاتدا ئەو دوو رووبارە بەرزاییەکەیان لە ئاستی ڕووی دەریاوە گەیشتۆتە ٣٩٠م [٨]، ئەو ناوچەیە دەکەوێتە هەرێمی مام ناوەند لە گەرمیدا سیستەمی باران بارینەکەی سەر بە دەریای ناوەڕاستە [٩]. باران بارینی ئەو ناوچەیە لە مانگی پایز و زستان و بەهاردا دەبێت، بە جۆرێك ڕێژەی باران بارین نزیکەی ٥٥ ڕۆژ بووە لە ساڵێکدا[١٠].

زەویی کشتوکاڵی هەولێر. بەپێی دابەشکردنی جۆر و تایبەتمەندیی خاکەکەی زیاتر لەو جۆرانە بووە کە بەکەڵکی کشتوکاڵ و چاندنی بەروبوومەکان هاتووە، بەشی زۆری ڕووبەری زەوییەکەی بۆ کشتوکاڵ بەکارهاتووە هەروەها بەشێکیش بۆ لەوەڕگا بەکارهاتووە. ئەو ڕووبەرەی کە بۆ داچاندن سوودیان لێوەرگیراوە بەشێوەیەکی گشتی پۆلێن کراوە بۆ سەر چەند جۆرێك ئەوانیش خاکی بەروبوومی زستان و هاوینە، لەوەڕگای کشتوکاڵ و خاکی کشتوکاڵی هەمیشەی (باخ و بێستان)ەکانە. بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستن، لە سنووری پارێزگای هەولێر ڕووبەری بەروبوومی کشتوکاڵ ٥١،٧ ٪ بووە، زەوی لەوەڕگا ٢٥، ٦ ٪ بووە، کەچی ڕووبەری بەروبوومی زستانە و هاوینە ٤،٣٪

بووە[١١]. بۆ نموونە بەپێی داتاکانی ساڵی ١٩٥٧ ئەوە دەردەکەوێت کە لە کۆی گشتی دانیشتوانی ئەو گوندنشینانەی کەکەوتوونەتە سنووری قەزا و ناحیەکانی سنووری پارێزگای هەولێر زیاتر لە ٦٨٪ بوونە، ئەمانەش لە ڕووی ئابوورییەوە بە چالاکی کشتوکاڵ خەریك بوونە. بەڵام وێڕای بوونی ئەو ڕێژە زۆرە لە دەستی کار و هۆکارە سروشتییە یارمەتیدەرەکان، سەرباری هەموو ئەمانەش ناوچەکە دواکەوتوو بووە لە ڕووی بەکارهێنانی ئامێری پێشکەوتووی کشتوکاڵی. ئەم بارودۆخە بەردەوام بووە، تاوەکو لە ساڵی ١٩٧٧ بە دواوە ڕێژەی بەشداری چالاکی کشتوکاڵ لە کەرتی ئابووری دابەزیوە و گەیشتۆتە نزیکەی ٣٥،٥٪ هۆکاری نزمبوونەوەی ڕێژەی چالاکی کشتوکاڵیش لەم ماوەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی کورد، دوای نسکۆی ١٩٧٥ کە دەرئەنجامەکانی دەبێتە هۆی ئەوەی زۆرێك لە گوندنشینەکان ناوچەکانی خۆیان جێ بهێڵن و کۆچ بکەن بۆ ناوچە ئارامەکان، بەتایبەتی شارەکان کە تاوەکو ڕادەیەك لە ناوچەی گەرمی شەڕ بە دوور بوونە [١٢]، وێڕای ئەوەی کە حکومەتی عێراق بە بیانوی دروستکردنی پشتێنەی ئەمنی ژمارەیەکی زۆری گوندنشینەکانی ڕاگواستووە بۆ ناو ئۆردووگا زۆرەملێیەکان کە بە گوندی هاوچەرخ ناوی بردوون، ئەمەش کاریگەریی نەرێنی لەسەر چالاکییەکانی ئابووری بەگشتی و کشتوکاڵ بە شێوەیەکی تایبەت دروست کردووە[١٣].

لە سەرەتاکانی١٩٨٠ دۆخەکە تاوەکو ئاستێك گۆڕانکاری بەسەردادێت بە جۆرێك ڕووبەری گشتی زەویوزاری کشتوکاڵی لە پارێزگای هەولێر دەکاتە (٥٧٧١٢٠٠) دۆنم زەوی، لەو ڕووبەرەدا (١٩٦٩٣٢٣) دۆنم زەوی بەراو بووە و (١٩٤٣٥٩٧) دۆنم زەوی دێمی بووە ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی لەم ماوەیەدا لەو ناوچەیە چالاکی کشتوکاڵ ڕووەو گەشەسەندن چوو[١٤].

جێگای ئاماژەیە ئەو گۆڕانکارییەش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بایەخدانی حکومەتی عێراقی بە کەرتەکانی ئابووری بەگشتی و کەرتی کشتوکاڵ بەشێوەی تایبەت، لە چوارچێوەی پلان و نەخشەکانی حکومەت بۆ بەرەو پێشەوەبردنی کەرتی کشتوکاڵ، بەگوێرەی پلان و پرۆگرامی کشتوکاڵ لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی ساڵانی ١٩٨٠ – ١٩٨١ هەولێ داوە زیاتر سوود لە پرۆژەکانی وەبەرهێنان

وەربگرێت. لە نموونەی ئەوەشدا هەوڵی بەرفراوانکردنی پانتاییەکانی ئەو زەوییانەی داوە کە بەروبوومی زستانە و هاوینەی سەوزە بووە[١٥]. هەموو ئەمانە بە هۆکاری ڕێژەی زۆری باران بارین بووە لە ناوچەکەدا [١٦]، بە پیتیی خاکەکەی و گونجاویی کەش و هەوایەکی دەستەبەرکراو[١٧]. لە لایەکی دیکەوە بۆ ئاسایشی خۆراك لە ناوچەکە زیاتر پشتی بەستراوە بە بەرهەمی خۆماڵی لە دابینکردنی پێداویستییەکانی ناوەخۆیی[١٨]. بەم شێوەیە لەئەنجامی کاریگەربوونی ئەو ناوچەیە بەئاووهەوای دەریای ناوەڕاست، چالاکییەکانی دەرامەتی کشتوکاڵی بەشێوەیەکی بەرچاو تێدا ئەنجام دراوە. بەتایبەتی لەدوای دەرچوونی یاسای ژمارە ٩٠ ی ساڵی ١٩٧٥ لە بارەی ڕێکخستنی موڵکداری کشتوکاڵی لە باشووری کوردستان( ناوچەی ئۆتۆنۆمی) [١٩]، کە جووتیاری لەژێر دەستی دەرەبەگەکان ڕزگارکرد و بووە پاڵنەرێك بۆ چالاکبوونی بواری کشتوکاڵی و ڕەنگدانەوەی ئەرێنی لەسەر ڕێژەی بەرهەمهێنان لە سنووری شارەکە دروست کردووە [٢٠].

لە ماوەی نێوان ساڵانی(١٩٧٥ — ١٩٩١ ) پارێزگای هەولێر یەکێك بووە لە باشترین پارێزگاکانی عێراق کە ڕووبەرێکی زۆری زەوی بەکارهێناوە بۆ چاندنی بەروبوومەکانی کشتوکاڵیی زستانە و هاوینە وەکو گەنم و جۆ و برنج و تووتن و گوڵە بەڕۆژە و بەروبوومی پاقڵەمەنی[٢١]، بۆ نموونە ئەو گەنمەی لە هەولێر چێندراوە هەمە جۆر بووە، هەر ناوچەیەك جۆرێکی تایبەتی بەرهەم هێناوە لە دیارترین جۆریان (زەردکە و بەهارە و سیپکە) بووە، هەریەك لەمانە تایبەتمەندیی خۆی هەیە. لەوانەش لە سنووری گوندنشینەکانی دەوروبەری هەولێر گەنمی (قەندەهاری- سابیر بەگ ) چاندراوە [٢٢]، هەرچی بەرهەمهێنانی جۆ بووە، ئەوا لە دوای گەنم لە زۆربەی گوندنشینەکانی قەزای هەولێر چاندراوە بە هەردوو جۆری سپی و ڕەشەکەیەوە، لە هەمان کات لە ڕووی کشتوکاڵەوە چاندنی برنج لە ناوچەکەدا تاڕادەیەك کەمتر بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ گوند بەرهەم هێنراوە بۆ نموونە لە سەعداوە و شەمامك [٢٣].

هەر لەم ماوەیەدا یەکێك لە بەرهەمە بایەخدارەکانی دیکەی کشتوکاڵی، تووتن بووە. بێگومان تووتن بەرهەمێکی بەربڵاوە تەنیا لە کوردستان چێنراوە، هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەو ناوچەیەدا دۆخێکی گونجاو هەیە بۆ

چاندنی ئەو بەرهەمە، هەولێر لە دوای سلێمانی بە پلەی دووەم هاتووە لە بەرهەمهێنانی توتن، هەربۆیە توتن وەك كەرستەیەكی سەرەكی هەر لەسەرەتای دامەزراندنی پیشەسازی لە هەر دوو شاری هەولێر و سلێمانی بۆ دروستكردنی جگەرە پشتی پێ بەستراوە. لەلایەكی دیكەوە چاندنی بەروبوومی كونجی و گوڵە بەڕۆژە بە هەمان شێوە كە دوو پێكهاتەی سەرەكی بوونە لە پیشەسازی ڕۆنی ڕووەك سوودی لێوەرگیراوە[٢٤].

حكومەتی عێراقی لە ناوەڕاستی حەفتاكاندا لە پێناو زیادكردن و باشكردنی بەرهەم هەوڵی زۆری داوە بۆ پێشكەشكردنی خزمەتگوزارییەكان لە پێدانی قەرزی كشتوكاڵی لە ڕێگای دامەزراندنی بانقێكی تایبەت بە كەرتی كشتوكاڵ[٢٥]. دابەشكردنی پەینی كیمیایی بەسەر جووتیاران و دامەزراندنی چەندان كۆمەڵەی جووتیاری و هەرەوەزی بۆ سەرپەرشتی كردنی ئەو كەرتە[٢٦]. بەڵام بەهۆی ئەو ڕووداوە سیاسییانەی كە لەم ماوەیەدا هەبووە، بەرهەم هەڵكشان و داكشانی گەورەی بە خۆیەوە بینیوە [٢٧]. بۆ نموونە كە باس لە بەرهەمهێنانی گەنم دەكرێت كە سەرچاوەی سەرەكی دانیشتوان بووە لە ماوەی ١٩٧٥- ١٩٩١ هەمیشە لە بەرزبوونەوەدا بووە، لە ساڵی ١٩٨١، ڕێژەی بەرهەمهێنانەكەی ٣،٩٪ بووە لە ساڵێكدا، لە ساڵی ١٩٩٠ ڕێژەی ساڵانەی١٨،٢ ٪ [٢٨].

هەرچەندە حكومەتی عێراقی لە دوای بەستنی كۆنگرەی نۆیەمی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراكی لە حوزەیرانی ساڵی١٩٨٢، هەوڵی داوە بۆ باشتركردنی كەرتی كشتوكاڵی لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە[٢٩]. بەڵام ئەم هەنگاوانەی حكومەت لە كوردستاندا تەواو پێچەوانەی ئامانجەكانی بووە. بەجۆرێك لە ماوەی دیاریكراودا ناوچەكانی كوردستان بە گشتی و هەولێر بەتایبەتی ڕووبەڕووی گەورەترین شاڵاوی ڕاگواستن و كاولكردنی گوندەكان و پرۆسەی ئەنفال و كیمیاباران بۆتەوە، كە ئەمەش كاریگەریی نەرێنی لەسەر بواری كشتوكاڵ لەو پارێزگایەدا دروستكردووە [٣٠]. بۆ نموونە وێرانكردن و ڕاگواستنی نزیكەی ٩٢٪ گوندەكانی كوردستان. بە جۆرێك حكومەتی ناوەندی لە چوارچێوەی پرۆسەكانی ئەنفالدا (٣٩٥٨) گوندی خاپووركرد، لەو ژمارەیەشدا پارێزگای هەولێر ڕێژەی نزیكەی ٣٠٪ ی بەركەوتووە. كە بەتەنها لە مەڵبەندی هەولێر، ناحیەكانی عەنكاوە

٣٧ گوند و قوشتەپە ١١٢ گوند و خەبات ١٦ گوند بوونە [٣١]. هەموو ئەو سیاسەتانەی کەوا حکومەتی عێراق لەو ماوەیەدا لە دژی کورد ئەنجامی دا، دوای سەپاندنی ئابلۆقەی ئابووری لە ساڵی ١٩٩٠ بەسەر عێراق، باری ئابووری ئەو وڵاتەی تووشی دارِمان کردووە[٣٢]، جگە لەوەی کە جەنگی عیراق و ئێران کە لەو ماوەیەدا ڕووی داوە بۆتە هۆی ئەوەی کەوا ژمارەیەکی زۆری لاوانی گوندنشینی کورد بچنە ریزی سوپای عیراقی و لە جەنگ بەشداری بکەن و بەشێکی زۆریشیان لە ناو یەکە سەربازییە غەیرە نیزامییەکان (الافواج الخفيفة) وەك چەکدار دامەزرێنران[٣٣]، ئەمەش بووە هۆی کەمبوونەوەی دەستی کارکەر لە کەرتی کشتوکاڵی، لەگەڵ ئەمەشدا ناوچە سنوورییەکانی شاری هەولێر زۆر کات بوونەتە گۆڕەپانی جەنگ لە نێوان هەردوو سوپای عێراق و ئێران، بەهۆی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشیش لە باشووری کوردستان، سوپای عیراق چەندین کرداری سەربازی بۆ سەر ناوچەکە ئەنجامداوە، کە ئەمیش بۆتە هۆی وێرانکردنی ڕووبەرێکی زۆری زەویی کشتوکاڵی بەهۆی بۆردومان و کارە جەنگییەکان، سەرەڕای هەموو ئەمانەش لەکاتی شەڕی عێراق و ئێران بەهۆی هەڵاتنی زۆربەی کوردەکان لەشەڕ و خۆحەشاردانیان لە ناوچە دوورە شارەکان، کە ئەمەش کاریگەری هەبووە لەسەر کەمبوونەوەی دەستی کار لە بواری کشتوکاڵ[٣٤].

لەلایەکی دیکەشەوە ناوچەی هەولێر بە هۆی تایبەتمەندیی جۆری خاك و ئاو و هەواکەی لە ڕووی گژوگیای کێوی و ڕووەکی خۆڕسك دەوڵەمەند بووە، ئەمەش سەرچاوەیەکی دیکەی ئابووریی ناوچەکە بووە، لەبەر ئەوەی هەروەك جوگرافیاناس و ئابووریناسان ئاماژەی بۆ دەکەن کە گژوگیای خۆڕسك لە هەموو دونیادا بە سەرچاوەیەکی گەورەی ئابووری دادەندرێت چ وەك بەکارهێنانی خۆراکی یان وەکو داو و دەرمان و جۆری رازاندنەوە و بۆن و بەرامە جوانکارییەکان. شاری هەولێریش هەر لەکۆنەوە لەم چەشنە دەرامەتە ئابووریيە دەوڵەمەند بووە، بەتایبەت لە وەرزی بەهار و پایز. بۆ نموونە ئەو ڕووەکانەی کە وەکو خۆراك لە ناوچەی هەولێر بەکارهاتوون بریتی بوونە لە (کاردی، تۆڵکە، کەنگر ) کە تاوەکو ئێستاش لە ناوچەکەدا وەك سەرچاوەیەکی خۆراکی بەهارە بەکار دەهێندرێت، هەندێ لەو ڕووەکانە وەك چارەسەری سروشتی و دروستکردنی

دەرمان بەکارهاتوون، بریتی بوونە لە ( ڕەشکە، گیابرینە، بەیبوون، پوونگ، ڕۆنیاس، برایم بۆگەنی، دارگەز) بووە[٣٥].

**ئاودێری لە شاری هەولێر:**

سەرچاوە سەرەکییەکانی ئاو لە پارێزگای هەولێر بەشێوەیەکی گشتی لە داهاتە سروشتییەکانی ئاو پێك هاتووە، وەك باران و ئاوی سەرزەوی و ئاوی ژێرزەوی، کە سەرچاوەی سەرەکیی ئاوی خواردنەوە و کشتوکاڵی بوونە، ئاوی ژێرزەوی هەر لەکۆنەوە بە دوو شێوە لە زەوی دەرهێندراوە، ئەوانیش بە ڕێگای بیرەکان و کارێزەکان بووە[٣٦]، کارێزەکان لە دەوروبەری ناو شاری هەولێر هەبوونە خەڵکی ناوچەکە بە تەواوەتی پشتیان پێ بەستووە [٣٧]. بەلاَم زۆربەی زەوییە کشتوکاڵییەکانی دەشتی هەولێر کە بۆ کشتوکاڵی زستانە بەکارهێنراوە پشتی بە ئاوی باران بەستووە، بەشێکی کەمی ئەو زەوییانە بۆ بەروبوومی هاوینە بەکارهاتووە، کە پشتی بە ئاوی ژێرزەوی بەستووە [٣٨]. لە دوای ساڵی ١٩٧٥ سیستەمی ئاودێری زیاتر پەرەی سەندووە جووتیارەکان (پەمپی ) ئاویان بەکارهێناوە بە تایبەت لەو شوێنانەی ئاستی ئاوی زەوییان زۆر قووڵ نەبووە، بۆ نموونە لە نزیك شاری هەولێر (٣) بیری ئاوی هەبووە تا (٢٠) مەتر ڕۆیشتووە، بۆ ئاودێری بەروبوومە کشتوکاڵییەکان سوودیان لێوەرگیراوە [٣٩].

لەلایەکی دیکەوە حکومەتی عێراق لە پێناو زیادکردنی بەرهەم و زاڵبوون بەسەر گرفتی کەمی ئاوی کشتوکاڵی دێمی لە هەولێر، سێ پرۆژەی گرنگی ئاودێری خستۆتە بواری جێبەجێکردن، بەلاَم لە ئەنجامی بارودۆخی جەنگی عێراق و ئێران ئەم پرۆژانە تەواو نەکراون. وەك پرۆژەی ئەزموونگەری گەشەپێدانی کشتوکاڵی دێمی لە ناوچەی بەحرکە لە عەینکاوە، کە لە ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن ژمارەیەك لە شارەزا و جووتیاری باشووری ئوسترالیا دامەزراوە، ٩ ملیۆن دۆلاری تێچووە، توانی ٢٠٠٠٠ دۆنم زەوی گەنمی تێدا بچێنێ، بەلاَم ئەم پرۆژەیە بەردەوام نەبووە لە سۆنگەی هەلومەرجی ڕاگواستنی زۆرەملێ، پرۆژەکە پەکی کەوت [٤٠]. لە ساڵی ١٩٨١پرۆژەی ئاودێری تەواوکاری لە دەشتی هەولێر (مشروع الري التكميلي في سهل أربيل ) بە ڕێژەی ٤٠٪ ئەنجامداوە، ئەمیش بەهۆی

ناسەقامگیریی بارودۆخی ئەمنی پڕۆژەکە لەساڵی ١٩٨٥ ڕاگیراوە و بەردەوام نەبووە [٤١].

- **ئاژەڵداری لە هەولێر :**

شاری هەولێر بەپێی ئاماژە مێژووییەکان، هەر لە کۆنەوە بەهۆی هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافی و گونجاوی ئاووهەوا و زۆری لەوەڕگاکان بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ و پەلەوەری ماڵی لەبار بووە [٤٢]. هەموو ئەمانەش هۆکار بوونە بۆ ئەوەی زیاتر بایەخ بە بەخێوکردنی ئاژەڵ بدرێت، لە دیارترین ئەو ئاژەڵانەی لە سنووری گوندنشینەکانی ئەو شارە بەخێوکراون، بە پلەی یەکەم مەڕ بووە. بە پلەی دووەم بزن و مانگا دێت بەڕێژەیەکی کەمتریش بەخێوکراون. بەخێوکردنی مەڕی (حەمدانی ) کە جۆرە مەڕێکی کوردیی ناوچەی هەولێرە، بە باشی و گەورەیی قەبارەکەی ناسراوە، کە زیاتر لە ناوچەکانی قەریەتاغ و سەعداوە و تەرجان و شەمامك بەخێوکراون[٤٣].

لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەم زیاتر بایەخ بە بەخێوکردنی پەلەوەر دراوە. و بەتایبەت بەخێوکردنی مریشك بۆ گۆشت، گرینگیدان بە بەرهەمەکانی پەلەوەر و پێشکەوتنی ئەم لایەنە دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی چەند پەلەوەر کە هەر لە ساڵی ١٩٧٣ لە ناوچەی باکووری شاری هەولێر دامەزرا، لە سەر رووبەری (٣٧٥٠) دۆنم، کە نزیکەی (١١٠٠) کرێکار کاریان تێداکردووە[٤٤]. لە ساڵانی ١٩٨٣–١٩٨٧ پرۆژەکانی بەخێوکردنی پەلەوەر بە هەردووکەرتی تایبەت و میری رووی لە زیادبوون کردووە[٤٥]. لە ساڵی ١٩٨٧ لە هەولێر ژمارەیان بووەتە(١٧) پرۆژە[٤٦]. بەڵام بە هۆی خەرجی زۆری حکومەت لەو شەڕەی لە بەرامبەر وڵاتی ئێرانی ئەنجامی ئەدا، لە نیوەی دووەمی هەشتاکانەوە دەستی کردووە بە فرۆشتنی هەندێك لە پرۆژە ستراتیژییەکانی بە کەرتی تایبەت لەنێوانیشیاندا یەکێك لەو پرۆژە گرنگانەی کە پێشتر باسمان لێوەی کرد، پرۆژەی بەخێوکردنی پەلەوەری هەولێر بوو لە ساڵی ١٩٨٨ وەك هەندێ لە پرۆژەکانی دیکەی ئابووری بە بڕیاری ٦٢٦ وەزارەتی کشتوکاڵ لە ڕێککەوتی ٢٨/ ٦/ ١٩٨٨ بەکەرتی تایبەت فرۆشراوە [٤٧].

لەلایەکی دیکەشەوە کەرستەی خاوی ئاژەڵداری بەتایبەت بەرهەمی مەڕ و بزن و مانگا زیاتر بۆ پیشەسازی شیرنەمەنی و قوتووبەندکردنی گۆشت و چنین و پیشەسازی سوودیان لێوەرگیراوە[٤٨]. حکومەتی عێراق لە پێناو هاندانی جووتیاران و پارێزگاریکردن لە بەکاربەر، نرخی لەسەر بەرهەمە خۆماڵییەکان داناوە[٤٩]. ئەم هەنگاوەش ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر ئابووریی شارەکە هەبووە، بەتایبەت کە لەم لایەنەوە بووەتە ناوەندێك بۆ بەکاربردنی بەرهەمە ناوەخۆییەکان. هەر بۆیە هاوردەکردنی بەرهەمە بیانییەکانی بۆ ناوەخۆی ولات سنووردارکردووە[٥٠]، بەلام هەندێك جار بەهۆی پڕنەکردنەوەی بازاڕەکان بە بەرهەم و پێداویستییەکانی، بە تایبەتی لە سامانی ئاژەڵ وەکو گۆشتی سوور و سپی، حکومەت ناچاربووە پەنابەرێتە بەر هاوردەکردنی ئەو بەرهەمە لە دەرەوەی ولات[٥١].

## تەوەری دووەم : پیشەسازی:

سەبارەت بە چالاکی ئابووری لەکەرتی پیشەسازیدا، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە شاری هەولێر هەر لەکۆنەوە لە بواری پیشەگەریدا چالاك بووە. بەهۆی ئەوەی کەوتۆتە سەرەڕێی ئەو کاروانە بازرگانییانەی پێیدا تێپەڕیون بۆ ولاتە دراوسێکانی وەك ئێران و سوریا و تورکیا. خەڵکی شارەکە لەکاتی بەیەکگەیشتنیان لەگەڵ ئەو کاروانانە و هاوبەشی کردنیان لە سەودا بازرگانییەکاندا تێکەڵاوی یەکدی دەبوون و لەو تێکەلاوییانەشدا زۆر لەو پیشەسازییانە فێربوون کە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا سوودیان لێوەرگرتووە[٥٢]. لەلایەکی دیکەوە گەشەکردنی کەرتی کشتوکاڵ هۆکارێك بووە بۆ زیادبوونی داهاتی کەرتی پیشەسازی بەتایبەت شمەکی بەرهەمهێن لە کشتوکاڵ ئەمەش پاڵنەرێك بووە بۆ فراوانبوونی بازاڕی پیشەسازی بەواتایەکی دیکە نەشونماکردنی کشتوکاڵ گەشەکردنی کەرتی پیشەسازییە [٥٣].

لێرەدا دەتوانین بڵێین پیشەگەرانی هەولێر دەست ڕەنگین بوونە. هەر لەژێر ڕۆشنایی ئەو زانیارییانەی کە هەن لەسەرچاوەکاندا تیشك دەخەینە سەر هەر دوو بواری پیشەگەری و پیشەسازی لە شاری هەولێر :

- **پیشەگەری و (کاری دەستی) لە شاری هەولێر:**

پیشەگەری بە یەکێك لە کۆنترین کارە دەستییەکان دادەندرێت، مێژووی ئەو پیشانەش لە شاری هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی کۆن، بوونی بازاڕ و جۆراوجۆری چین و توێژەکان و کارکردن تیایدا هۆکارێکی دیکە بووە لە بەرەوپێشخستنی ئەو پیشەگەرانە، هەروەها ئەو پەیوەندییە ئابوورییانەی نێوان شار و دێهاتەکان لە دروستکردنی پێداویستی کشتوکاڵی ئاژەڵداری و هتد.... وای کردووە زیاتر بایەخ بەو لایەنە بدرێت.

لە دیارترین شێوازە بلاّوەکانی ئەو پیشانەش زیاتر بریتی بوونە لە دووکان و شوێنی کاری بچووك لە نێوان گەڕەکەکانی شار. کە زیاتر تاکە کەس خاوەنیان بووە، پاشان حکومەت دەستی بەدامەزراندنی چەندین پرۆژەی پیشەسازی کردووە لە عێراق بەشێکیش بەر ئەو شارە کەوتووە[٥٤]. لەوانە ئاشی دانەوێڵە و نانەواخانەکان و ڕستن و چنین و پەڕەکردن و نەخشاندن و دوورمان، دروستکردنی خشت (کەرپووچ) [٥٥].

ئەو پیشانەی کە باو بوونە زیاتر پیشە دەستییەکانی وەکو دارتاشی و ئاسنگەری و چەخماخسازی و کورتان دووریین و گلکاری و سپڵ و پێستە خۆشکردن و کتێب بەرگکردن و شەکرچی و چەندانی تر بوون [٥٦]. هەر لەو کاتەوەش بەشێك لە پیشەوەرە لێهاتووەکانی شاری هەولێر چالاکی پیشەگەرییان لەچوارچێوەی پیشەسازییە بچووکەکاندا لەناو دووکانەکانی خۆیان ئەنجامداوە. هەندێك لەمانە کە پێیان گوتراوە (کارگەچی یان لبادکەر)، لە خوری بەرخ، ڕایەخ و سەربەرگی نایابیان بۆ دانیشتوانی شار و دێهات و خێڵە کۆچەرییەکانی کوێستانەکان دروستکردووە، سەرەڕای دروستکردنی لبادی جۆراوجۆر بۆ ڕاخستن و سەرکلاّوی سەپانان و فەرەنجی و کەڕکی شوانان و چەندان شتی تر[٥٧].

لە شاری هەولێردا کوورەی دروستکردنی کەرپووچ و چەندان پیشەسازیی تریش هەبووینە[٥٨]. لە دیارترین ئەو کەسانەی لە کوورەچیەتی کاریان کردووە لە شاری هەولێر، (سەلیم تۆپاڵ لە نزیك مەحەتە، شەهاب سلێمان، شەهاب میکائیل، مەجیدحاجی بکر و حەمید حاجی بەکر) بوونە [٥٩]. هەر لەو پیشە دەستیانەشدا دروستکردنی پیشەی گۆزەگەری بووە، بۆ دروستکردنی گۆزە و جەڕەی گەورەی

ئاو بۆ ساردکردنەوە بەکارهاتووە ، ئەم جۆرە پیشەگەرییە لە شاری هەولێردا بینراوە، بەشێوەی ئەندازەی جوان دروست کراوە، دەست ڕەنگین و هونەرکاری تێدا بەکارهاتووە، لە گەڕەکە دەوڵەمەندەکانی شاری هەولێر لە ساڵانی حەفتاکاندا دۆڵابی گەورە و ڕەنگاو ڕەنگ بۆ بنەماڵە دەوڵەمەندەکان دروست کراوە لەبەر ئەوەی نرخیان بەرزبووە هەمووکەسێك توانای کڕینی نەبووە، لە ساڵی ١٩٧٥ دروستکردنی ئەو جۆرە سندووقە ڕەنگاو ڕەنگانە گۆڕاوە بە (باوڵی تەنەکە). هەر لە پاڵ ئەو جۆرە پیشانە دارتاشەکان وەك بەشێك لە پیشەگەرەکانی ئەو شارە، (سندووقی بووکێنی) و( لانك)یان دروست کردووە، هەندێ لەمانەش کورسی داریان دروست کردووە، لەبازاڕی ناوەندی هەولێریش فرۆشراون، لە پاڵ ئەو پیشانەش چەندین پیشەی تر لە ناوچەی هەولێر باو بووە، لە نموونەی ئەوانەش وەك باس دەکرێت پیشەی دروستکردنی عەرەبانە و دروستکردنی شەنەی دار و دەسکی دەستکرد و جەنجەڕ بوونە کە زیاتر بۆ دێهاتەکان دروست کراوە. هەموو ئەو پیشەگەرییانە لە بازاڕی گەورەی هەولێر لە ساڵانی ١٩٧٧–١٩٨٨ بوونی هەبووە ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە هێشتا خەڵکی کوردستان ئەو کەلوپەلانەیان بەکاریان هێناوە داواکاریی بازاڕی لەسەر بووە، کەواتە بازاڕ لەم لایەنە پردی پەیوەندیی نێوان دێهاتەکان و خەڵکی شار بووە[٦٠].

- جۆرەکانی پیشەسازی لە شاری هەولێر :

شاری هەولێر، لە ناوەڕاستی حەفتاکان لە بواری پیشەسازی پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینیوە، بەهۆی زیادبوونی داهاتی نەوت و تەرخانکردنی پارەیەکی زۆر بۆ بووژاندنەوەی کەرتی پیشەسازی لە عێراق بە گشتی و لەنێوانیشیاندا شاری هەولێر[٦١]. کەرتی پیشەسازی لە شاری هەولێریش بە بەراوردکردن لەگەڵ قۆناغەکانی پێشووتر بووژانەوەی باشی بەخۆیەوە بینیوە لەبەر ئەوەی حکومەتی عێراقی هەر لە سەرەتای شەستەکانەوە لە چوارچێوەی پلانی بووژاندنەوەی ئابووری لە ڕێگای وەزارەتی کار و نیشتەجێبوون بایەخی تەواوی بەو کەرتە داوە. لە سەرەتای شەستەکانەوە چەند کارگەیەکی سەرەتایی لە شاری هەولێر دامەزراون لەوانەش پیشەسازی خۆراکی هاوچەرخ و سپیایی و کارگەی ساردەمەنی و کارگەی بەفر تا ساڵی ١٩٧٠ نزیکەی (١٥) کارگە دامەزراوە[٦٢].

بەلأم گەشەکردنی کارگەکان لە رووی ژمارە و قەبارە جێگیرنەبووە، بەڵکو بەپێی ئەو هەلومەرجەی بەسەر ناوچەکە و شارەکەدا هاتووە، لە کاتێکدا بۆ کاتێکی دیکە لە گۆڕاندا بووە. بەتایبەت لە سالأنی حەفتاکان و هەشتاکاندا ئەم هەڵچوون و داچوونەش بەشێوەی راستەوخۆ کاری لەسەر چالاکیی پیشەسازی کردووە[٦٣].

لە نموونەی ئەوانەش پیشەسازی گۆڕاو بووە. لە ماوەی نێوان سالأنی (١٩٧٦–١٩٨٠ ) ناسەقامگیرییەکی روون لە گەشەی پرۆژەی پیشەسازی روویداوە، هەر بەو هۆیەشەوە لە پاڵ پرۆژە بچووکەکان. ژمارەیەك پرۆژەی پیشەسازی گەورە سەریان هەڵداوە، لەوانە لە ساڵی ١٩٧٦ ژمارەی پرۆژەی گەورەکان لەو شارە گەیشتووەتە نزیکەی (٣٠) پرۆژە، ئەو رێژەیە لە ساڵی ١٩٧٩ زیادی کردووە بۆ (٥٢) پرۆژە، سەیر دەکەیت بەپێچەوانەوە لە ساڵی ١٩٨٠ پرۆژەکان دابەزیوە بۆ (٤٥). لەلایەکی دیکەوەش پرۆژەی پیشەسازییە بچووکەکانیش لە ساڵی ١٩٧٩ گەیشتۆتە (١٥٧٣) پرۆژە، کەچی لە ساڵی ١٩٨٠ دابەزیوە بۆ (١٥٢٩) پرۆژە، ئەم دابەزینەش زیاتر پەیوەندی بە هۆکاری سیاسی و بارودۆخی ناوچەکەوە هەبووە[٦٤].

لەسەر ئەو بنەمایەش قەبارەی هێزی کار بۆ بەرهەمهێنانی شمەك و خزمەتگوزاری ئابووری لە ریزی دانیشتوانی شاری هەولێر بە( نێر و مێ ) لە سالأنی نێوان ١٩٧٧– ١٩٨٧ دا ژمارەی کارگەران لە رووی ئابووری بە شار و لادێوە (١٧٣,٧٥٢)کەس بووە و ژمارەی ناکارکەر( ٥٩٦,٦٨٧ )کەس بووە، لە ساڵی ١٩٨٧ رێژەی پیاوان زیاتر بووە لە ئافرەتان، بەلأم سەبارەت بە ناوەندی شارەکە کرێکاری ئافرەت زۆرتر بووە [٦٥].

لە هەمان کاتیشدا دابەشبوونی کەرتی پیشەسازی لە چوار چێوەی پلانی(١٩٧٦–١٩٨٠) بۆ پەرەپێدانی پیشەسازی پێشکەوتووە حکومەتی عێراقی هاوکار بووە بە پێدانی قەرز بە سوودێکی سادە بە رێژەی ٤٪ ئەمەش راستەوخۆ دوای دامەزراندنی هەر پرۆژەیەکی پیشەسازی پێشکەش کراوە. لە چوارچێوەی ئەو هەنگاوانەش چەندین دامەزراوی پیشەسازی لە عێراق بەگشتی لەوانەش لە شاری هەولێر سەریان هەڵداوە[٦٦]. لە دیارترینیان :

**أ– دامەزراندنی کارگەی جگەرەی هەولێر:**

کارگەی جگەرە لە ساڵی ١٩٧٣ لە هەولێر بەبڕی شەش ملیۆن دۆلار لە رێگای کۆمپانیای (ساسیب) ی ئیتاڵی دامەزراوە. یەکەمین بەرهەمی ئەزموونی ئەو کارگەیەش لە ١٩٧٣/٤/١ بووە، ئەم دامەزراوە سەر بەدامەزراوی گشتی وەبەرهەمهێنانی جگەرە بووە لە بەغدا[٦٧]. مەبەست لە دامەزراندنی کارگەی جگەرە دوو لایەنە بووە، بە پلەی یەکەم بۆ ئەوەی پەرە بە بەرهەمهێنانی تووتن بدرێت و لە بازاڕی ناوەخۆ بفرۆشرێت و لە هەمان کاتیشدا سنوورێك بۆ هاوردەکردنی جگەرە لە دەرەوە دابندرێت[٦٨]. لە ساڵی ١٩٧٩ زۆربەی ئامێر و پێویستییەکانی نوێ کراوەتەوە لەڕێگای کۆمپانیای (شرموند)ی ئەڵمانی. ئەم کارگەیە بەشێوەیەکی رێکخراو بەردەوام بووە لە بەرهەمهێنان تاوەکو ساڵی ١٩٩٠ بەڵام دوای شەڕی دووەمی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١ و گەمارۆی ئابووری و نەبوونی کەرستەو پێداویستیی بەرهەمهێنان و نەبوونی بازاڕی ناوەخۆی وەك پێویست ئاستی بەرهەمهێنانی بەرەو لاواز و نەمان چووە[٦٩].

**ب– کارگەی قوتووبەندی هەریر:**

ئەم کارگەیە لە ساڵی ١٩٧٩ دامەزراوە بەرهەمی کارایی لە ساڵی ١٩٨٠بووە، بەرهەمەکانی بریتی بوونە لە مورەبا، میوە پارێزراوەکان (کەمپوت)، گوشراوی میوە و سرکە [٧٠]. پرۆژەی مورەبای قوتوو، کە بە گوژمەی ٢،٢٠٠،٠٠٠ هەزار دینار لە لایەن کۆمپانیایەکی بولگاری جێبەجێکراوە، نزیکەی ٢٥٠ کەس کاریان تێداکردووە[٧١].

**ت– کارگەی گشتی ئەلبان– سپیایی:**

کارگەی ئەلبانی هەولێر لە دوای رێککەوتنامەی ١١ ئازاری ١٩٧٠ وەك پرۆژەیەکی سادەی بەرهەمهێنانی سپیایی دامەزراوە[٧٢]، کە سەر بە دامەزراوی گشتی ئەلبان بووە لە بەغدا کە لە ساڵی ١٩٥٨ دامەزرا بوو[٧٣]، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٥ بۆ یەکەمین جار پرۆژەکە فراوان کراوە حکومەتی عێراق بڕی ١٠٠ هەزار دیناری ئەوسای عێراقی بۆ ئەو پرۆژەیە تەرخان کردووە، هەر بەو هۆیەشەوە ئاستی بەرهەمهێنانی کارگەکە بەرەو زیادبوون رۆیشتووە بەڕادەیەك تواندراوە لە رۆژێکدا پێنج تەن ماست و ٢٠٠ کیلۆگرام قەیماغ بەرهەم بهێندرێت، بە شێوەیەکی

گشتی کارگەی گشتی ئەلبانی هەولێر پشتی بە بەرهەمی شیری خاوی ئاژەڵی ناوچەکە بەستووە بۆ بەرهەمهێنانی بەروبوومە سپیاییەکان[٧٤].

**پ– کارگەی ئالیك (علف) لە هەولێر:**

ئەم کارگەیە بە یەکێك لە پرۆژە سەرەکییەکانی پرۆژەی گشتی پەلەوەر دادەندرێت لە ناوچەکەدا کە رۆڵێکی گرنگی بینیوە لە دابینکردنی ئالیك لە پارێزگای هەولێر، مێژووی دامەزراندنی ئەو پرۆژەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٦، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨ بەهۆی خراپی باری ئابووری و سیاسیی وڵات بەکەرتی تایبەت فرۆشراوە، ئەم کارگەیە زیاتر پشتی بە کەرستە سەرەتاییەکانی ناوەخۆ بەستبوو بۆ بەرهەمهێنانی ئالیك بەتایبەت گەنم و جۆ[٧٥].

٢– پیشەسازی چنین و جلوبەرگ بووە ئەم لقەش زیاتر دامەزراوی بەرهەمهێنەکانی خوری و حەریر و مافوور و چنین دەگرێتەوە، بەڵام پیشەسازی جلوبەرگ زیاتر پیشەسازییەکانی دوورمان و نەخشکاری و پێستە و پێڵاو دەگرێتەوە. لەوانە:

**أ_ پیشەسازی ڕستن و چنینی خوری لە هەولێر:**

ئەم پیشەسازییە بە یەکێك لە گرینگترین جۆری پیشەسازی دادەندرێت کە پشتی بەکەرستەی خاو بەستووە. وەك پەمۆ، لۆکە، خوری. ئەو کارگەیە لە ساڵی ١٩٧٥ لە بەشی باشووری شاری هەولێر بووە بە تێچووی ٩،١١١،٠٠٠ دیناری عێراقی بونیادنراوە، لە ١٩٧٩/٧/٣٠ دەستی بە بەرهەمهێنان کردووە. بەڵام بەرهەمی بازرگانی لە ١٩٨٠/٧/١ دەستی پێکردووە بە وزەی ١٦٩,٨٠٠م درێژی کوتاڵی زستانە و هاوینە، ئەوپەڕی توانای بەرهەمهێنانی ئەو کارگەیە گەیشتۆتە ١،٢٠٠،٠٠ هەزار مەتر درێژی[٧٦]، ئەم کارگەیەش لە سەرەتادا بە کارگەی رستن و چنینی دهۆك بەستراوە بەڵام لە ساڵی ١٩٨٧ لەیەکتر جیابوونەتەوە. هەرچی پیشەسازی مافووریشە هەر بەشێك بووە لە پیشەسازی ڕستن و چنین. ئەم پیشەسازییە لە چەندین شوێنی جۆراو جۆری پارێزگای هەولێر دامەزراوە لەوانە مەڵبەندی هەولێر، کەسنەزان ڕەواندز و بەحرکە[٧٧]. کە مێژووی کارگەی مافووری دەستکردی هەولێریش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٤[٧٨].

ب– هەرچی پیشەسازی پێستەیە، دروستکردنی پێڵاو و دروستکردنی هەندێ کەلوپەلی بەکارهێنراوی وەك دێمكە و كوندە بەكارهاتووە، لە پیشەسازی زین و كیفەی دەمانچە و تفەنگ و ڕەختی فیشەك و دروستکردنی جەنتاش بەكار هاتووە. بەڵام بەهۆی پەرەسەندنی تەكنەلۆجیاوە پیشەسازی پێستە بەرەو لەناوچوون و پووكانەوە چووە[٧٩].

**٣– پیشەسازی خانووبەرە و كەرستەی بیناسازی :**

كە لە پیشەسازییە دێرینەكانی ئەو شارە دەژمێردرێت بەرهەمەكانیشی بنچینەیەكی خێرا و باشی ئابووری دابین دەكات، لە بەرهەمەكانی ئەو پیشەسازییەش چیمەنتۆ و ڕوخام و كاشی و بلۆك و ئەلەمنیۆم بووە. لە دیارترین كارگەكانیش:

**أ– كارگەی مەرمەڕی هەولێر:**

ئەم كارگەیە لە باكووری شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٧٤ لەلایەن كۆمپانیای ((Gregory) كریكوری ئیتاڵی دامەزراوە بەرهەمی تاقیكردنەوەیی لە ساڵی ١٩٧٦ بە توانای ١٠٠،٠٠٠ مەتر دووجا لە ساڵێكدا، ئەم كارگەیە ٧٧ كرێكار كاریان تێدا كردووە. دواتر ئاستی بەرهەمهێنانی بەرز دەبێتەوە تاوەكو لە ساڵی ١٩٨٩ دەگاتە ٦٠,٨٨٨ كم٢[٨٠]. لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٨–١٩٨٨ زۆربەی ئامێرەكانی بە تەكنەلۆژیای ئەڵمانی نوێ كراوەتەوە، تا ساڵی ١٩٨٩ پێشكەوتنی باشی بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام دواتر بەهۆی نەبوونی ئامێر و كەرستەی یەدەگ و نەبوونی بەردی (لووسكردنی بەرد) و ئامێری بیبڕ (منشار)ی بەرد بڕین لە كاركەوتووە [٨١].

لەلایەكی دیكەوە ژمارەیەك دامەزراوی پیشەسازی تایبەت بە كەرەستەی بیناسازی لە ماوەی ساڵانی حەفتاكان و هەشتاكاندا دامەزراوە، ژمارەی ئەو دامەزراوە سەرەكییانە لە پارێزگای هەولێر تا ساڵی ١٩٨٠ گەیشتۆتە (٥٦) كارگە، لەوانە (٤١)یان لە ناو شارەكە بوونە، بۆ نموونە (٢٨) كارگەی بلۆك و (١٢) كارگەی بەردشكاندن و یەك كارگەی (كەرپووچ) بووە[٨٢]. هەرلەم ماوەیەشدا كارگەی خشتی سوور لە هەولێر دامەزراوە [٨٣]. بەڵام لەدوای ساڵی ١٩٨٠ بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی عیراق و ئێران، ئەم كردارە كەمێك خاو و سست بۆتەوە

بەهۆی تەرخانکردنی پارەیەکی زۆر لە بودجەی دەوڵەت بۆ جەنگ. ئەم ڕەوشە زیاتر کاری کردە سەر دامەزراوە گەورە[٨٤]، ناوەندییەکان، تا دامەزراوە بچووکەکانیش[٨٥].

ب- **پیشەسازیی چاپ و کاغەز** : ئەم جۆرە زیاتر تایبەت بووە بە پیشەسازی ( چاپ و کاغەز) لە نموونەی ئەم پیشەسازییەش، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە لە ساڵی ١٩٧٤ دامەزراوە.کە تایبەتمەندە بە چاپکردنی کتێبی قوتابخانەکان، هەروەها چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین کە پێشتر لە ساڵی ١٩٦٧ لە سلێمانی دامەزراوە دواتر لە ساڵی ١٩٨١گوازراوەتەوە بۆ هەولێر [٨٦]. چاپخانەی سێیەم چاپخانەی ڕۆشنبیری بووە، مێژوووی دامەزراندنی ئەم چاپخانەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٢ دوای هێنانی ئامێرەکانی چاپ لە ڕێگای (دار الحرية للطباعة والنشر) لە بەغدا لەلایەن تیمی شارەزای ئەڵمانی دەست کراوە بە دانانی ئامێرەکان لە ١٩٨٤/١/٤بەفەرمی کەوتووتە کار، ئەم چاپخانەیە تایبەت بووە بە چاپکردنی ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب [٨٧].

ڕووبەری زەوی پیشەسازیی شاری هەولێر لە ماوەی نێوان (١٩٧٥-١٩٨٥) هەڵکشانی بەخۆیەوە بینیوە. بەشێوەیەك لە ساڵی ١٩٧٥ تەنها ٥٪ ی ڕووبەری شاری هەولێری داگیرکردووە، بەڵام ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ١٩٨٥ گۆڕانکاری گەورەی بە خۆیەوە بینیوە و گەیشتووەتە ٢٠٪، پیشەسازییەکانی شاری هەولێر چەندان جۆر و شێوە بووە، بەگوێرەی پێداویستیی خەڵك و دانیشتوان، بەتایبەتی ئەوانەی کەوا پەیوەندییان بە خۆراکەوە هەبوو، لەوانەش پیشەسازی نان و سپیاتی و پەلەوەرو گۆشت و شیرنەمەنی و کەلوپەلی ناوماڵ. بێگومان زانکۆی سەلاحەددین لە شاری هەولێر ڕۆڵێکی کاریگەری بینیوە لە گەشەکردنی لایەنی پیشەسازی و ژێرخانی ئابووری لە شارەکەدا[٨٨]. بەهۆی پێگەیاندنی ژمارەیەکی زۆر لە شارەزایانی بواری پیشەسازی جگە لە پێدان و پێشکەشکردنی دەیان پرۆژە و توێژینەوەی زانستی لەکەرتی پیشەسازیدا. لە ساڵی ١٩٨٠ پارێزگای هەولێر لە کۆی دامەزراوە پیشەسازییەکانی هەرێمی کوردستان، بەڕێژەی ٤٢٪ لە دامەزراوەکانی ناوەنجی وبەڕێژەی ٤٧٪ لە دامەزراوە گەورەکان پێشەنگ بووە[٨٩]. بە شێوەیەك لەو ماوەیەدا لە هەولێر ١١ کارگەی چنین و ١٠ کارگەی

دروستکردنی خۆراك و ٤ کارگەی کانزایی و ١ کارگەی دار و ١ کارگەی کاغەز هەبووە [٩٠].

لە ساڵی ١٩٨٨ ڕێژەی دامەزراوە پیشەسازییەکان لە شاری هەولێر گۆڕانی بەسەرداهات و دەبنە (١٠١٣) دامەزراوەی بچووك، کە ژمارەی کارکەرانی( ٢٣١٨ ) کرێکار بووە، هاوکات ١٥ دامەزراوەی گەورەش هەبووە کە ژمارەی کارکەرانی (٣١٥) کرێکار بووە [٩١]. ئەو دامەزراوە پیشەسازییانە وێڕای دابینکردنی پێداویستەکانی ناوەخۆ هۆکارێکیش بوونە بۆ کەمکردنەوەی بێکاری و بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی دانیشتوانی شارەکە.

بەسەرنجدان بە بارودۆخی سیاسیی عێراق بەگشتی و کاریگەرییەکانی لەسەر پێشخستن و شێوازەکانی بەرهەمهێنان دەکرێت بووترێت لەسەرەتای حەفتاکانەوە رەوتی ئاراستەی دامەزراوە پیشەسازییەکان لە کوردستان بەگشتی و هەولێر بەتایبەتی تاڕادەیەك باش بووە بەهۆی دەستکەوتەکانی حکومەت لە خۆماڵیی نەوت و داهاتەکانی و سەقامگیری بارودۆخی سیاسی هەر بۆیە دابەشبوونی کەرتی پیشەسازی لەماوەی ١٩٧٦–١٩٨٠ جوولانەوەی دیاری بەخۆیەوە بینیوە بەڵام لە هەشتاکان بەتایبەت لە ماوەی نێوان ١٩٨٠–١٩٨٨ گەشەو پەرەپێدانی کەرتی ئابووری بەگشتی و پیشەسازیش وەك بەشێکی لایەنی ئابووری لەسەرەخۆ بووە، ئەمەش زیاتر بەهۆی بارودۆخی شەڕ و تێچوونەکانی بووە لەبەر ئەوەی بەشی زۆری خەرجییەکان، بۆ بواری سەربازی تەرخان کراوە. لەلایەکی دیکەوە سەرچاوەکانی کەرستەی خاو بەرەو سست بوون ڕۆیشتووە ئەمەش کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی لەسەر دامەزراوە پیشەسازییەکاندا هەبووە [٩٢].

**تەوەری سێیەم:**

**أ– چالاکی بازرگانی:**

بازرگانی بەلایەنێکی گرنگی چالاکی ئابووری دادەندرێت، لەهەمان کات ڕۆڵێکی بنچینەیی هەیە لە بنیادنانی ژێرخانی ئابووری وڵاتدا، لەبەر ئەوەی بازرگانی کردارێکە پەیوەندی بە بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕکردنی کەلوپەلەوە هەیە لە نێوان بازاڕی ناوچەکاندا. لەو نێوەندەشدا شوێنی جوگرافیی هەولێر ڕۆڵێکی

سەرەکی بینیوە لە گەشەسەندنی ئەو چالاکییە لەبەرئەوەی خاڵی بەیەکگەیشتنی دوو ئابووری لێکچوو بووە، ئابووری چیا بەدارستان و بەرهەمەکانییەوە، لەگەڵ ئابووری دەشت بە بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی و کەرەستە پیشەسازییەکانییەوە، لەتەك کرداری گەشەپێدانی کەرتی ئابووری بەتایبەتی لە قۆناغی حەفتاکاندا [٩٣].

لەلایەکی دیکەشەوە لەبەر ئەوەی شوێنی جوگرافیای شاری هەولێریش هۆکارێك بووە بۆ خاڵی بەیەکتری بەستنەوەی زۆرێك لەو ڕێگا گرنگە کە باکووری عێراق بە ناوەڕاست و باشوورییەوە و لەو ڕێگایەشەوە بەرەو ناوچە شاخاوییەکان، گرنگی و بایەخی ئابووریی زۆری بە شارەکە بەخشیوە، هەر بەهۆی ئەو خاسیەتەوە شاری هەولێر هەر لەکۆنەوە بۆتە مەڵبەندێکی بازرگانی چالاك بۆ کاروانە بازرگانییەکان ، ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر پەیوەندیی بازرگانی لە نێوان هەولێر و وڵاتانی دەوروبەری [٩٤]. جگە لەمەش هەر لە ڕووی بازرگانییەوە بەهۆی بەستنەوەی ناوچەی چیایی و دەشتایی بە یەکترییەوە، پاش چاککردن و دروستکردنی چەندان ڕێگای قیرتاو بۆ هاتوچۆکردن شارەکە بایەخی زیاتر بووە[٩٥].

لەلایەکی دیکەشەوە یەکێك لە خەسڵەتەکانی شارە کوردییەکان بەگشتی بریتی بووە لە شاری بازاڕی لە سەرچاوەکاندا شارە کوردییەکان بە سیمای شاری بازاڕی ناو بردراون، پیشەی سەرەکی دانیشتوانی ئەو شارانە تاڕادەیەکی زۆر پەیوەست بووە بەو خزمەتگوزارییانەی کە خەڵکی گوندەکان یان کۆچەرەکان پێشکەش بە شارەکانیان کردووە، بازاڕەکان گرنگترین تەوەری پێکەوە بەستنی ئابووری بووە لە نێوانیاندا بۆ هاوردەکردن و کڕین و فرۆشتنی کاڵاو پێداویستییەکان [٩٦]، لەم لایەنەشەوە شاری هەولێر بنکەیەکی گرنگی بازرگانی و بەرهەمهێنان بووە، چەندین جۆر پیشەی بازرگانی لەم شارە بوونیان هەبووە کە پێویستییەکانی کشتوکاڵ و بازرگانی دابینکردووە، بازاڕی ئەو شارەش بۆتە مەڵبەندێکی سەرەکی بۆ بازرگانی ناوەخۆ [٩٧]. دامەزراوە بازرگانییەکانی شاری هەولێر بە دامەزراوەی فرۆشتنی تاك و کۆ بوونە، هەروەها دەرمانخانەکان و وێستگەکانی بەنزین و دامەزراوەکانی ڕابواردن، جگە لە هۆتێل و چێشتخانە و قاوەخانەکان [٩٨].

لەکۆنەوە مەڵبەندی بازرگانی شارەکە، زیاتر کەوتۆتە دەوروبەری قەڵای هەولێر و ناو بازاڕی قەیسەری. بازاڕی قەیسەری دەکەوێتە بەشی خوارەوەی

ڕۆژئاوای قەڵاتی هەولێر کۆنترین بازاڕی شارەکەیە کە بە تەرزێکی بیناکاریی گرنگ و دەگمەن دروست کراوە و بە شێوەیەکی لوولەیی دەردەکەوێت [٩٩]، قەیسەری گەورە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە، بەشی یەکەمی چەند بازرگانێکی ناودار کاریان تێداکردووە، کە کاری چنینی دەستیان تێدا ئەنجام داوە، وەك (بەڕە، مافوور، لێفە، جاجم، دووگورد، جەواڵ، تێڕوتاڵ' بەشی ناوەڕاست بە (خەفاف ) ناسراوە، بەشی سێیەمیشی لە کاتی خۆی جوولەکەکان کاریان تێدا کردووە. قەیسەری دووەم پێی گوتراوە (قەیسەری بەرگدرووان — قيصرية الخياطين ) کە دەکەوێتە خوارووی قەڵات و بازاڕی بەزاز و عەتارەکان لەگەڵ قەیسەری گەورە لێکیان جیادەکاتەوە [١٠٠]. هەر ناو بازاری قەیسەری ڕیزە دووکانێکی لێبووە کە خەریکی زیاتر لە جۆرێك لە مامەڵەی بازرگانی بوونە، ئەوانەش بە چینی (بەقاڵ) ناسراوبوون، کە زیاتر خەریکی ئاڵوگۆڕی دانەوێڵە و پێویستی ژیان و بەرهەمی سروشتی بوونە، ئەو بەرهەمانەیان لە گوندنشینەکانی دەوروبەری شاری هەولێریان دەکڕی و دەیانفرۆشتەوە خەڵکی شارەکە[١٠١].

دارتاشەکانیش سەرباری پیشەی سەرەکی خۆیان، مامەڵەی داروباری دارتاشییان کردووە، داری گوێز وچنار و... شەق کردووە و کردوویانەتە تەختەدار و فرۆشتوویانەتەوە دارتاشەکانی تر. هەندێکیان خاوەن کۆزی ئەسپیندار‌بوون، لە شەقڵاوە و هیران و نازەنین و دێهاتەکانی تر، ئەو دار ئەسپیندارانەی کە تەواو گەورەدە بوون هێناویانەتە شار و دەیانفرۆشتەوە دارتاشەکانی تر [١٠٢]. لە ناوجەرگەی شاری هەولێریش بازاڕی مالاّت هەبووە کە بازرگانی بە فرۆشتن و کڕینی مریشك و مەڕ و مالاّت کراوە، ئەو بازاڕەش بە بازاڕی مەیدانی مالاّت ناسراوە لە بەیانیان زوو تا نیوەڕۆ هەبووە، بەشێك لە بازرگانەکان مریشکیان لەو مەیدانە کڕیوە و ڕەوانەی شاری مووسڵ کراوە [١٠٣].

لەگەڵ ئەوانەش جموجۆڵە بازرگانییەکانی ناوەخۆی شاری هەولێر چەندان لایەنی تری وەکو بەرهەمەکانی زێڕنگری و ئاسنگەری و.... هتد گرتۆتەوە [١٠٤]. جگە لەمانەش بازرگانی هەولێر لەو بەرهەمە دانەوێڵانەی کە لەگوندنشینەکانیان کڕیوە لەگەڵ خوری و پێستەی ئاژەڵ هەناردەی شارەکانی ناوەڕاست و و خوارووی عێراقیان کردووە لەوێشەوە بۆ دەرەوە هەنارده کراون[١٠٥].

لە ساڵی ١٩٧٦حکومەتی عێراق لە بواری بازرگانی دەزگای (بازرگانی گەلە فرۆشی) داناوە، وەك تۆڕێکی دەزگای کاروباری بازرگانی ناوەخۆیی، ژمارەیەك

لەفەرمانبەری میری لەم کەرتە کاریان کردووە. لە شارە گەورەکاندا کۆگای گەورەی میری هەبووە بەناوی (فرۆشگای عێراقی – ئۆرزدی باك ) لەو بازاڕەدا کەرستەی پیشەسازی و خۆشگوزەرانی بیانی و خواردنی قوتووبەندی تێدا فرۆشراوە، لەشاری هەولێر ئەو بازاڕە بۆتە مەڵبەندی بازرگانی کە شوێنەکەی کەوتبووە بەرامبەر بینای دادگای کۆن لە بەشی خوارەوەی قەڵاتی هەولێر [١٠٦].

سەرباری هەموو ئەوانەش ژووری بازرگانی، هەر لەگەڵ دروستبوونیدا لەساڵی ١٩٦٦ڕۆڵێکی پڕ بایەخ و گرنگی لە ژیانی ئابووری شاری هەولێردا هەبووە. بەهۆی بەستنەوەی بازرگان و کارەکانی بواری ئابووری بە جیهانی دەرەوە و دامەزراوەکانی ئابووری لە دەرەوە.، بازرگانەکانی هەولێر پەیوەندییان هەبووە بە ژووری بازرگانی، ئەم ژوورە بەهاوکاریی خوالێخۆشبوو جەلیل کە ناسراوە بە جەلیل **خیاط** (١٩٢٦-١٩٩٨) و بەیارمەتی شێخیل حاجی حەسەن لە ساڵی ١٩٦٦ لە شاری هەولێر دامەزراوە [١٠٧]. لەدیارترین ئەو بازرگانانەی هەولێر کە هەر لە ساڵی ١٩٧٥لەو ژوورە بوون (ئەنوەر ساڵح، نەجمەدین نورەدین بەقاڵ، جەلال عەبدوڵلا بەقاڵ، جەلال خەلیل، ئەحمەد مەلا قادر بەزاز، جەمال عوسمان و محەمەد مستەفا، موفتی چەلەبی، کەنعان جەبار بەقاڵ، ئازاد یحیی بەزار، کەریم جەلال خەلیل، عەبدوك شێخ محەمەد بەقاڵ، محی الدین عەبدولرەزاق، بیلال ئیسماعیل خەیات، ئەیوان شیلیمون، رەشاد ئەحمەد، بەهجەت، عوسمان نەجار، ئیبراهیم سۆفی بەزاز ) بوونە [١٠٨]. لە هەمان کاتدا ژمارەی بازرگانەکانی ئەو شارە بەدرێژایی ماوەی توێژینەوەکە لە بەرزبوونەوەدا بووە، بەشێوەیەك تەنها لەماوەی نێوان (١٩٧٥- ١٩٨٤ ) لە (١٠١٥ ) بازرگان گەیشتۆتە (٨٢٩٦) بازرگان[١٠٩].

لە ساڵی( ١٩٨٥-١٩٩١) پێشکەوتنی زیاتری بەخۆیەوە بینیوە، ژمارەی ئەندامانی ژووری بازرگانی گەیشتە ( ٦٤٨٣) ئەندام. کە لە( ٦٤ ) چالاکیی بازرگانی جیاجیادا بەشداربوونە. لەم ژمارەیەدا (٢٤١١) بازرگان لە بواری بازرگانیکردن بە کەرەستەی خۆراك کاریان کردووە، واتە بەڕێژەی ٣٧,١٩٪ ی سەرجەم بازرگانەکانی پارێزگای هەولێر. کەواتە ئەم بازرگانانە بە پلەی یەکەم دێن لە بواری چالاکی بازرگانیدا. بازرگانەکانی کوتاڵ بە پلەی دووەم دێن و ژمارەیان لە هەمان ماوەدا ١٩٨٦ کەس بووە، واتە ١٥,٢١٪ ی سەرجەم بازرگانەکانی پارێزگای هەولێریان پێکهێناوە. بازرگانەکانی کەرەستەی

تەندروستی و بیناسازی بە پلەی سێیەم دێن و ژمارەیان ٣٨٧ کەس بووە، واتە بە ڕێژەی ٦٪، بازرگانەکانی کەرەستەی یەدەگی ئۆتۆمۆبێل بە پلەی چوارەم دێن و ژمارەیان ٢٧٩ کەس بووە، واتە بەڕێژەی ٤,٣٪[(١١٠)].

بازرگانی دەکرێ بە دوو بەشەوە : بازرگانیی ناوەخۆ و بازرگانی دەرەوە. هەرچی پەیوەندی بە بازرگانیی ناوەخۆ هەیە، لەم ماوەیە پێکهاتووە لە بازرگانی تاك و کۆ، بە هەردوو شێوەکەش لە هەلومەرجی ئابلۆقەی ئابووری سەپێنراو بەسەر عێراقدا هەموو جۆرە کەلوپەلێکیان بۆ بازاڕی شارەکە دەستەبەر کردووە، بەتایبەت لەو ساتانەی زۆربەی کارگەکانی عێراق بە هۆی بارودۆخی شەڕەوە لەکار کەوتبوون. بازرگانی ناوەخۆ کەلوپەل و خزمەتگوزارییەکان لەناو سنووری جوگرافیایی دەوڵەتدا بۆ بەکاربەر دابین کردووە.

أ ) هاوردن ( الاستيراد) : لە ماوەی توێژینەوەکەدا یەکێك لەو هۆکارانەی بووەتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی هاوردەکردن، دابەزینی نرخی دراوی ئەوسای عێراق و خراپی ڕەوشی ژیان و ئابووری بووە، لە هەمان کات دابەزینی ئاستی گوزەران بەتایبەت چینی هەژار و کەم دەرامەت هۆکارێکی دیکە بووە، بە سوود وەرگرتن لەم بارە ناهەموارەش هاوردەکەران بە دوو شێواز کەلوپەلیان هاوردە کردووە، یەکەمیان لە ڕێگای بازرگانەکانەوە کە بەشی زۆری کەلوپەلەکانیان لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیاوە هێناوە، ڕێگای دووەمی هاوردەکردن لە ڕێگای دەوڵەتەوە ئەمەش بە هۆی بانکەکانەوە بووە، بەڵام نەتواندرا پێداویستیی ناوەخۆ دابین بکات، کاڵای هاوردە زیاتر لە ڕێی بەغداوە هاتووەتە هەولێر ئەوانیش بریتی بوونە لە ( کووتاڵ، کەرستەی خۆراك و کەرستەی کۆگا و جلوبەرگی ئامادە، فەرش و کومبار، پێڵاو و پێستە، سەعات و پارچەکانی، کەرستەی کارەبایی ) بوونە. سەبارەت بە هاوردەکردن لە شاری هەولێر کوتاڵ بە پلەی یەکەم هاتووە، بەجۆرێك ١٤٢ بازرگان کاری هاوردەکردنی کووتاڵیان کردووە، زۆربەی ئەو کووتاڵانەش کووتاڵی ژنانەی ڕەنگاو ڕەنگ بووە، کەرەستەی کۆگا وەك ( خاولی... چەرچەف..... بەتانی...هتد) بە پلەی دووەم هاتووە و ژمارەی ئەو بازرگانانەی ئەو بابەتانەیان هاوردە کردووە لە ساڵی ١٩٨٢ دا ٢٢ بازرگان بوونە، هاوردەکردنی خۆراکیش بە پلەی سێیەم هاتووە و ١٨ کەس بازرگانییان پێوەکردووە، هاوردەی جلوبەرگی ئامادەش لە هەمان ساڵدا ژمارەیان نزیکەی ١٥ بازرگان بووە.

ب ) ناردن ( تصدیر ) : هەناردن کردارێکی گرنگە بۆ دەستخستنی دراوی قورس و گۆڕینەوەی کاڵاشە لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا، شاری هەولێر بەهۆی ئەوەی لەو قۆناغەدا بەرهەمی پیشەسازی گرنگی وەك بەرهەمەکانی کارگەی جگەرە و ڕستن و مەڕمەڕی تێدابووە، بۆیە لەم بوارانەشدا چالاك بووە لە ناردنی ئەو بەرهەمانە بۆ دەرەوەی سنووری شارەکە [111]. تووتنی کوردستان یەکێکە لەو تووتنە چاکانەی لە بازاڕە جیهانییەکاندا پەسندکراوە و هەر لە ساڵانی شەستەکانەوە هەناردەی وڵاتانی وەکو ئەردن و میسر و ژاپۆن کراوە [112].

**ب- گەشتوگوزار.**

گەشتوگوزاریش یەکێکە لەم بوارانەی کە دەچێتە نێو داهاتی ئابووری و هۆکارێکە بۆ گەشەکردنی بواری ئابووریی وڵات، لەسەر ئەو بنەمایەش پێشخستن و تواناکانی ئەو کەرتەش تاڕادەیەکی زۆر پابەند بووە بە سەقامگیریی سیاسی و بووژاندنەوەی کەرتەکانی دیکەی ئابووری، لە ساڵانی ١٩٧٠-١٩٨٠ کە بە دۆخی سەقامگیری سیاسی ناسراوە، حکومەت توانیویەتی توانا ئابوورییەکانی خۆی ببووژێنێتەوە بە تایبەت دوای خۆماڵیکردنی نەوت لە ساڵی ١٩٧٢ ئەمە هەنگاوێك بوو، بۆ ئامادەسازیی حکومەت بۆ چەند پرۆژەیەکی گەشتوگوزاری کە خۆی لە دروستکردنی هوتێل و ڕێگای قیرتاوکردن دەبینییەوە، بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە خزمەتگوزارییەکان لە ئاستی پێویستدا نەبوونە [113]. ئەم بایەخدانەی حکومەت لە ناوەڕاستی حەفتاکان بۆ گۆڕینی ئاستی گوزەرانی خەڵك زیاتر بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناو شارەکاندا بووە، بۆیە گوندەکان و ناوچە خزمەتگوزارییەکان وەك پێویست گەشەیان نەکردووە [114].

لە هەنگاوی دواتردا حکومەتی عێراق بەمەبەستی بایەخدان بە گەشتوگوزار لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥ ئەنجومەنی بەرزی گەشتیاری دامەزراندووە [115]، ئەمەش وای کردووە ناوچەکانی کوردستان بەگشتی بە هۆی توانا سروشتەکەی لە بواری گەشتوگوزارییەوە ناوبانگێکی زۆرتر پەیدا بکەن. نەك تەنیا هەر لە عێراق، بەڵکو لە تەواوی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا [116]. ئەم هەنگاوەی میری لە ماوەی (١٩٧٥ - ١٩٨٠) خزمەتێکی زۆری بە شاری هەولێر و هاوینەهەوارەکانی گەیاندووە، لەو ڕێگەیەشەوە لە ساڵی ١٩٧٥ چەندان شوێنی گەشتیاری نوێ لە ناو شار و لە دەرەوی شارەکە بەتایبەت لە هاوینەهەوارەکانی پیرمام[117] و

شــەقڵاوە [١١٨]. کراوەتــەوە،١٢٠ خــانوو و کۆمــەڵگای گەشــتیاری لــە هاوینــە هــەوارەکانی پیرمـام و سـەری ڕەش و شـەقڵاوە و حـاجی ئۆمـەران دروسـتکراون لەلایەن کۆمپانیایەکی فەرەنسی، لە ساڵی ١٩٧٦، خانووی دیکە لە شارۆچکەکانی پیرمام و شەقڵاوە و حاجی ئۆمەران دروستکراون، ئەم خانووانە بە کرێ دراونەتە گەشتیاران [١١٩].

لەلایەکی دیکەوە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەمەبەستی پەرەپێدانی زیاتری ئـەو کەرتـە لـە سـاڵی ١٩٧٧دا یاسـای ژ(٤٩)ی دەرکـردووە، بـەپێی ئـەو یاسایەش بڕیار لەسەر دامەزراندنی دامەزراوەیەکی گشتی گەشتوگوزار دراوە، وەك دامەزراوێکی ڕاستەوخۆ بە ئەنجومەنی وەزیـران بەسـتراوە لـە پێنـاوی بونیادنـانی کەرتی گەشتیاری نوێ لە هـەرێمی کوردسـتان بەتایبـەت لـە هـەولێر و سـلێمانی و دهۆك. لەئەنجامی ئەو سیاسەتەی حکومەت ژمارەیەك شوێنی گەشتیاری و هوتێل و شوێنی یاریکردن لەلایەن کۆمپانیـای بیـانی و جیهـانی تایبـەت بەگەشـتوگوزاری وەك کۆمپانیای فرەنسی و سویسری و هۆڵەندی و بەلجیکی و ئیتـاڵی کراوەتـەوە، لە هەمان کاتیشدا حکومەت هانی کەرتی تایبـەتی داوە بـە تـەرخانکردنی زەوی و ئاسانکاری گەشـتیاری تـاوەکو پـرۆژەی گەشـتیاری دابمـەزرێنن، بـەڵام لـە سـاڵی ١٩٨٦ ئــەو دەزگایــە هەڵوەشــێندراوەتەوە لــە شــوێنی ئــەو بەڕێوەبەرایــەتی گەشتوگوزاری گشتی داندراوە کە دەزگایەکی ئیداریی بچووك بوو [١٢٠].

لەگـەڵ ئـەوەی کـەرتی خزمەتگوزارییـەکان ڕۆڵێکـی گـەورەی لـە گەشـە و زیندووکردنەوەی ناو شار گێڕاوە تـا سـاڵی ١٩٨٧ زیـاتر لـە ٧٨٪ هێـزی کـار لـەم کەرتەدا بووە، ئەمـەش بـە بـەراوردکردن بـە هێـزی کـاری پیشەسـازی ڕێژەیـەکی بەرزە [١٢١]. لەبەر ئەوەی ئەو دەزگایە لە هاوینەهـەوار و ناوچـە گەشـتیارییەکان نرخی کاڵا و شتومەکی دیاریکردووە، لە پێناو ڕاکێشانی ڕێژەی زیاتری گەشتیاران بـۆ ناوچـەکە[١٢٢]. وێـڕای پێـدانی پێشـینەی گەشـتیاری بـەو خەڵکانـەی پـرۆژەی گەشتیارییان پێشکەش کردووە [١٢٣].

سەبارەت بە گەشتوگوزاری شاری هەولێریش لە پاڵ شـوێنە گەشـتیارییەکان شـوێنەوارە دێرینـەکانی دەرەوەی شـارەکە و لـەناو چـەقی شـارەکەش چـەندین شوێنەواری مێژوویی و دێرین هەبوونە بوونەتە جێگای سەرنج بـۆ گەشـتیاران وەك قـەڵای هـەولێر و منـارەی مزەفەرییـە کـە ناسـراوە بـە (منـارەی چـۆلی)، ڕۆڵێکـی بنچـینەیان بینیـوە لـە ڕاکێشـانی گەشـتیاران بـۆ ناوچـەکە[١٢٤]. شـوێنەوارە

مێژووییـەکانی و مەزارگـەی ئـاینی و گـۆڕی پیاوچاکان و پیشەسازی و هونـەری فۆلکلـۆری و دەسـتەبەربوونی چـەندان شـوێنی گەشـتیاریی وەك میوانخانـە و چێشـتخانە و گـازینۆی گەشـتیاری بوونەتـە هۆکـارێکی بـەهێز بـۆ ڕاکێشـانی ژمارەیـەکی زۆری گەشـتیاران بـۆ شـارەکە و گەشـتکردنیان بـە ناوچـەکە، بـە تایبەتیش گەشتیارانی عەرەب کـە لـە ناوەڕاست و باشووری عێراقـەوە دەهاتنـە ناوچەکانی گەشتوگوزاری لە پارێزگای هەولێر [١٢٥].

شوێنە ئاینییەکانیش هۆکاری کاریگەرن بۆ پەرەپێدانی گەشتیاری بەتایبـەت مەزارگـە و شـوێنە پیرۆزەکـانی ئـاینی. مەزارگـە و تەکییـەکان لـە چوارچـێوەی خزمـەتگوزاری دامـەزراوی ئـاینی لـە سـاڵانی نێـوان ١٩٧٧- ١٩٨٧ بـەردەوام لـە بەرەو پێشچـوون بـووە بـە جۆرێك تەکییـەکان پلـەی سـێیەمیان وەرگرتـووە لـە بواری خزمەتگوزارییـەکان ژمارەیـان گەیشـتۆتە ( ١٨) تەکیـە، بـەڵام مەزارگـەکان سەرەڕای زیادبوونی ژمارەیـان کەچـی ڕێـژەی بەشـداریکردنیان دابـەزیوە[١٢٦]، لـە دیارترین تەکییەکانی شاری هەولێر کە زۆرترین ڕێـژەی خـەڵك سـەردانی کـردوون، مزگەوت و تەکییەی حاج محەمەد سالح کە پـێش ٢٠٠ سـاڵ لەمەوبـەر بنیـادنراوە، مەرقەدی سوڵتان مزەفەرەدین گوگبری مێژووی دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٦٣٠ھ[١٢٧]. تەکییـەی شـێخ جەلالـەدین لـە گـەڕەکی تـەعجیل، تەکییـەی شـێخ محێـدین و تەکییـەی شـێخ عـارف لـە گـەڕەکی عارەبـان، تەکییـەی خانـەقا و تەکییەی شێخ مستەفا لە گەڕەکی خانەقا، تەکییەی شێخی چۆلی کە ئێسـتا بۆتـە مزگـەوت لـە نـاو بـازاڕی هـەولێر [١٢٨]. دروسـتکردنی نوێژگـە بەشـێکی دیکـەی خزمەتگوزارییەکان بووە، لە ساڵی ١٩٨٤ یەکەمین نوێژگە لەسەر ڕووبـەری (٠،٠٢) هیکتار دروست کراوە کە دەکەوێتە نـاو گـەراجی گواسـتنەوەی بـاکوور لـە شـاری هەولێر[١٢٩].

کەنیسـەش وەك شـوێنی ئـاینی مەسـیحییەکان بەشـێکی دیکـە بـووە لـە خزمەتگوزارییە ئاینییەکان لەبەر ئەوەی شاری هەولێر لە ڕووی پێکهاتەی ئـاینی و نەتەوەیی جیاواز بووە، ئەمەش وایکردووە بایـەخی شـوێنەوارە ئاینییـەکان زیـاتر بەدەرکەوێت لەبواری گەشتوگوزارییەوە، یەکەم کەنیسەش لـە شـاری هـەولێر لـە ساڵی ١٩٧٣ لە گەڕەکی سەلاحەددین لە سـەر ڕووبـەری( ٠،١٥ )هیکتـار بـە نـاوی کەنیسـەی مـارگۆرگیس دروسـت کـراوە [١٣٠]. لـە نێـوان ١٩٧٨-١٩٨٠ کەنیسـەی ماریوسـف لەلایـەن پـەتریارك ئەسـتیڤان بابـەك دامـەزراوە و شـوێنێکی ئـاینی

مەسیحییەکان بووە کە خەڵکانێکی زۆریش بۆ سەردانی کردن لە ناوچەکانی دیکەوە سەردانی ئەو شوێنەیان کردووە [١٣١].

گەشەکردنی کەرتی گەشتوگوزاری لە شاری هەولێر و سنوورەکانی دەرەوەی شارەکەش گەڕاوەتەوە بۆ شوێنی جوگرافی و تۆبۆگرافیای ناوچەکە و کەشوهەوای گونجاو و زۆری دەرامەتەکانی ئاو کە سەرچاوەی سەرەکی دروستبوونی کۆمەڵێك تاڤگە و کانیاو بوونە وەکو تاڤگەکانی گەلی عەلی بەگ [١٣٢]. بێخاڵ و کانیاوەکانی جوندییان و حاجی ئۆمەران کە بایەخی ناوچەکەیان زیاتر کردووە [١٣٣].

لە ماوەی نێوان ١٩٧٥–١٩٨٠ بەهۆی ئەو سەقامگیرە رێژەییەی هەبووە لە عێراق، لایەنی گەشتوگوزاری لە عێراق و هەرێمی کوردستان بەرەو هەڵکشان هەنگاوی ناوە شاری هەولێریش مەڵبەندی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بووە لە رووی گەشتوگوزارەوە رێژەکەی بەرز بۆتەوە بۆ ٢٩٪ شوێنی حەوانەوە و هوتێلەکانیش رێژەی سالآنەی ٢٦٪ زیادی کردووە بەلآم ئەو رێژەیە جێگیر نەبووە لە ١٩٨٠–١٩٨٦ بە رێژەی ٣٪ لایەنی گەشتوگوزاری کەمی کردووە ئەمەش پەیوەست بووە بە بارودۆخی شەڕ و ناسەقامگیریی سیاسی [١٣٤]. هۆکاری دابەزینی ئاستی ئەو رێژەیەش لە سالآنی ١٩٨٠_ ١٩٩٠ دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی عێراق و ئێران ئەگەرچی سەرباری ئەو ناسەقامگیرییە سیاسییەش ژمارەیەك پرۆژەی گەشتوگوزاری دروست کراوە، دەست کراوە بە قیرتاوکردنی رێگای نوێ کە هەندێ لەمانە بە ئامانجی سەربازی بووە، بەلآم توانیویانە خزمەت بە بواری گەشتوگوزاریش بکەن بە تایبەت دوای ئەوەی حکومەتی عێراق گەشتکردنی بۆ دەرەوەی ولآت قەدەغەکرد، ئەمەش وای کرد کە بایەخی ئەو شوێنە گەشتوگوزارییانەی ناوەخۆ زیاتر بەدەر بکەوێت بە تایبەت لەناوەوەی عێراق لە سێ مانگی هاویندا روویان لەم هاوینە هەوارانە کردووە [١٣٥].

**ئەنجام :**

لە ڕێگای ئەم توێژینەوەیە دەگەینە چەند ئەنجامێك كە لەم خاڵانەی خوارەوە دیاریان دەكەین :

١- شاری هەولێر بەهۆی هەڵكەوتەی شوێنی جوگرافیایی و گونجاویی ئاو و هەواو بە پیتی و تایبەتمەندی جۆری خاكەكەی لە بواری كشتوكاڵ و بەروبوومی زستانە و هاوینە و تەنانەت لە بواری ئاژەڵداریش بەشداری كارای لە داهاتی ئابووری هەبووە، لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٥-١٩٩١ كەرتی كشتوكاڵ لە هەڵكشان و داكشاندا بووە، بە تایبەت لە ساڵانی هەشتاكان ئەمەش زیاتر بەهۆی شەڕ و سیاسەتی حكومەتی عێراقی بووە بەرامبەر بە ناوچە كوردنشینەكان بەگشتی لە نێوانیشیاندا شاری هەولێر. هەر بەو هۆیەشەوە ڕێژەی كەرتی كشتوكاڵ بەرەو لاواز و سست بوون ڕۆیشتووە.

٢- لە بواری پیشەوەری و پیشەسازییەكان شاری هەولێر هەر لە كۆندا چەندین جۆری پیشەوەر و كەسانی دەست ڕەنگینی هەبوونە. ئەم كەرتەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر بووژانەوەی بە خۆیەوە بینیوە بە تایبەت لە ساڵانی حەفتاكاندا چەندین پیشەسازی لە ناو شاری هەولێر دامەزراون، كە ڕۆڵی سەرەكییان هەبووە لە بنیادنانی ژێرخانی ئابووریی شارەكە. ژمارەیەكی زۆری خەڵكی ناوچەكەش لەم كەرتە كاریان كردووە بە تایبەت دوای ئەوەی حكومەتی عێراق دەستی كردووە بە ڕاگواستن و وێرانكردنی گوندەكان.

٣- هەرچی لایەنی بازرگانییە بەهۆی تایبەتمەندیی شاری هەولێر لە ڕووی جوگرافیایەوە، وای كردووە لە سەر ئاستی ناوچەكە زیاتر خۆی وەك مەڵبەندێكی بازرگانی ببینێت و بۆ هاوردە و هەناردەكردنی كەلوپەلی بازرگانی. بە هەمان شێوە ڕێژەیەكی دیار لە خەڵكی شارەكە بەو كارەوە خەریك بن. تەنانەت لە ژووری بازرگانی و بازاڕی گەلە فرۆشیی تاك و كۆ لەم شارە دەورێكی باڵایان هەبووە لە چالاكی بازرگانیی ئەو شارە.

٤- شاری هەولێر هەر لە كۆنەوە سیمایەكی جوانی گەشتیاری هەبووە كە بووەتە جێگای سەرنجی زۆرێك لە گەشتیاران لە وانەش گەشتیارانی ناوەخۆی عێراق بەتایبەت لە ساڵانی هەشتاكان زۆرترین گەشتیار لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق ڕوویان لەم شارە كردووە. هۆكاری یارمەتیدەری پەرەسەندنی گەشتیاریش لە پاڵ شوێنە گەشتیارییەكانی سنووری پارێزگای هەولێر. بوونی

شـوێنەواری مێـژوویی و مەزارگـە و شـوێنەواری ئـاینی و هونـەری فۆلکلـۆریی شارەکە بوونە. هەموو ئەوانەی باس کران وایان کردووە شاری هەولێر لە پـاڵ ئەوەی هەر لە کۆنەوە کە شوێن و پێگەیـەگی سیاسـی و شارسـتانی گرینگـی مێژوویی هەبووە، بایەخ و تایبەتمەندییەکی دیاری ئابووری هـەبێت لـە عێـراق بەگشتی و لە کوردستانیش بە تایبەت.

**سەرچاوە و ژێدەرەکان :**


١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : عەبدوڵڵا غەفور، جوگرافیای باشووری کوردستان، ج٢، چـاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢، ل٢٦٧.

٢- سـەروەر عەبـدولڕەحمان عومـەر، مێـژووی یـەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان (١٩٧٥– ١٩٧٦)"دامەزرانـدن و دەسـتپێکردنەوەی شـۆڕش"، بەشـی یەکـەم، چـاپخانەی هێڤـی، (هەولێر:٢٠١١)، ل٩٧.

٣- محسن ابراهيم أحمد، واقع القطاع الزراعـي في أقلـيم كردسـتان العـراق وسـبل تنميتـه خـلال المدة (١٩٧٤–١٩٩٣)، رسالة ماجسـتير مقدمـة الى مجلـس كليـة الادارة والاقتصـاد في جامعـة صلاح الدين – أربيل، ١٩٩٤، ص ٩٥.

٤- سـەلاحەددین حەفیـد، ئـابووری کوردسـتان (١٩٧٧ – ١٩٩٠ )، بڵاوکراوەکـانی سـەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، (سلێمانی : ٢٠٠٠)، ل ١١١.

٥- ساسان حکمەت عەلی، شیکردنەوەیەکی جوگرافی بۆ دابەش بوونی دانیشتوان لە پارێزگـای هـەولێر، نامـەی ماسـتەر" بڵاونـەکراوە"، پێشـکەش بـە زانکـۆی سـەلاحەددین کۆلێـژی ئەدەبیات – بەشی جوگرافیا کراوە، ٢٠٠٨، ل ١٤٠.

٦- سەلاحەددین حەفید، س.پ، ل ١٠٣ .

٧- عمـادەدین عومـەر حەسـەن، پێداویسـتەکانی ئـاو بـۆ شـاری هـەولێر تـا سـاڵی ٢٠٢٥، هەولێر"گۆڤار"، هەولێر، ژ(٥)، زستانی ٢٠٠٠، ل١١.

٨- عبدالباقي عبدالجبار الحيـدري، الاثـار الاجتماعيـة و الديموغرافيـة للنمـو الحضـري في العـراق "محافظة أربيل"، (تونس : ٢٠٠٢ )، ص٢٧٧.

٩- جەلال سنجاوی، جوگرافیای شاری هەولێر و دەوروبـەری، هـەولێر (گۆڤـار)، ژ (٣)، هـاوینی ١٩٩٩، ل ٥٧ – ٥٩ .

١٠- عمادەدین عومەر حەسەن، س، پ، ل١١.

١١- بـەختیار سـابیر محەمـەد، داهـاتی ئـابووری کشـتوکاڵ لـە پارێزگـای هـەولێر، سـەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، (گۆڤار)، ژ(٣)، ساڵی نۆزدەهەم، تشرینی دووەم، ٢٠١١، ل ٨٥.

١٢- ساسان حكمەت عەلی، س.پ ، ل ١٤٠.
١٣– چیا، ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێ كوچكەی بەعس یان " تەرحیل، تەعریب، تەبعیس"، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای ناوەندی رۆشنبیری كۆمەڵە، ئایاری ١٩٧٨، ل ٢١٤.
١٤- محسن ابراهيم أحمد، م . س، ص ٤٣.
١٥- بڕوانە : شۆڕشی كشتوكاڵ، " گۆڤار "، ژ(٥)، ساڵی سێ یەمی ١٩٨١، ل٣٣.
١٦- كمال محمد سعيد خياط، القطاع الزراعي في العراق، مسح شامل لموارده وتقييم اساليب تنميته، ط١، مطبعة العاني، (بغداد : ١٩٧٠)، ص ٧.
١٧- جەلال سنجاوی، س . پ ، ل ٦٠ .
١٨- جزا توفيق طالب، المقومات الجيوبولتيكية للامن القومي في اقليم كردستان، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، (السليمانية :٢٠٠٥ )، ص٢٨١.
١٩- العراق (الجريدة)، بغداد، العدد (١٦٧)، ١٩٧٦/٩/٥، ص٣.
٢٠- كۆمەڵێك مامۆستای زانكۆ، جیۆگرافیای هەرێمی كوردستانی عێراق، و: ئاسۆ كەریم، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی كوردستانی عێراق، (هەولێر : ١٩٩٩)، ل٢٠٤ .
٢١- سەلاحەدین حەفید، س . پ، ل١٢١.
٢٢- كۆمەڵێك نووسەر، س،پ، ٢٠٤.
٢٣- چاوپێكەوتن لەگەڵ ئەرسەن موسا رەشید (پ.دكتۆر)، هەولێر، ٢٠١٥/١١/٢٤.
٢٤- كۆمەڵێك نووسەر، س،پ، ٢٠٤.
٢٥- بڕوانە : أسماعيل ياسين محمود، أتجاهات السياسة الزراعية في العراق للفترة (١٩٦٨–١٩٨٨)، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس معهد الدراسات القومية والاشتراكية في الجامعة المستنصرية، (بغداد : ١٩٨٩)، ص ٤٣ .
٢٦- بڕوانە : الجمهورية (جريدة)، العدد (٥٠٩٧)، ١٩٨٣/٨/٨ .
٢٧- بڕوانە : أسماعيل ياسين محمود، م.س، ص ٤٣ .
٢٨- محەمەد عبداللە عمر، پێویستەكانی پارێزگای هەولێر بۆ گەنم تا ساڵی ٢٠٠٥، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٩)، زستانی ٢٠٠٠، ل ١٨٠.
٢٩- بەختيار، الريف الكردستاني، الواقع الاقتصادي — الاجتماعي وملاحظات بشأن اعمار القرى الكردية، منشورات أعلام المركز الرابع للاتحاد الوطني الكردستاني، د . م، ١٩٩٢، ص ٥ .
٣٠- جەلال سنجاوی، س.پ، ل ٦٢ .
٣١- چیا، س، پ، ل٢١٤ .
٣٢- محسن ابراهيم أحمد، م. س، ص ٩٥.
٣٣- المصدر نفسه، ص١٠١.
٣٤- جزا توفيق طالب، م . س، ص٣٥.

٣٥- بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ناو و جۆری ڕووەکەکان بڕوانە : ئازاد حەمە شەریف، گژوگیای کێوی ناوچەی هەولێر، ئینسکلۆپیدیای هەولێر، پ١، چ١، چاپخانەی گرین گالۆری– لوبنان، ٢٠٠٩، ل ١١١.

٣٦- کاریزەکان لەسەردەمی ئەتابەکیدا ژمارەیان ٣٦٥ کاریزبووە بەڵام لە ساڵانی ١٩١٨– ١٩٢٠ تەنیا (٦٠) کاریز ماوەتەوە، لە ناوەڕاستی نەوەدەکان بووەتە (٢٥) کاریز، هۆکاری ئەمەش نەبوونی خزمەت و پشتگوێ خستنی بووە هەر ئەمەش وای کردووە وردە وردە بەرەو لەناوچوون و رووخان بینەوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : بەختیار سابیر محەمەد، داهاتی ئابووری کشتوکاڵ ....، ل ٩٢.

٣٧- هەمان سەرچاوە، ل٨٥،٩٥،٩٠ .

٣٨- بڕوانە : سەلاحەدین حەفید، س.پ، ل١٢١.

٣٩- لیژەك ژیگیل، کۆمەڵی لادێی کوردستانی هاوچەرخی عێراق بەرامبەر بە نوێ بوونەوە، و. عەزیز گەردی، چ١، کتێبی سەنتەری برایەتی، (سلێمانی –١٩٩٩). ل ٤٩.

٤٠- سەلاحەدین حەفید، س.پ، ل١٢٨.

٤١- أریك دافیس، م . س، ص ٢٨١ ؛ سەید نەجات سەید مستەفا محی الدین، (پەیوەندی تەلەفۆنی)، هەولێر، ٢٠١٤/٢/١٤. ناوبراو لە ساڵی ١٩٤٥ لە شاری هەولێر لە دایك بووە، خوێندنی ئەندازیاری لەشاری بەغدا لە ساڵی ١٩٧٦ تەواو کردووە، لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٠–١٩٨٦ بەڕێوەبەری فەرمانگەی ئاودێری بووە لە هەولێر، ئێستاش خانەنشینە و دانیشتووی شاری هەولێرە.

٤٢- سەلاحەددین حەفید، س،پ، ل١٢٨.

٤٣- لیژەك ژیگیل، س.پ، ل ١٣٨.

٤٤- شیرزاد احمد شهاب، تقدیر وتحلیل دالتي الانتاج والكلفة لفرع لحوم في حقول دواجن محافظة أربیل لسنة ٢٠٠٧، رسالة ماجستیر " غیر المنشورة"، مقدمة الى مجلس كلیة الادارة والاقتصاد – جامعة صلاح الدین، (أربیل :٢٠٠٩)، ص ٣٨. " سەلاحەددین حەفید، س،پ، ل ١٤١.

٤٥- محمد شكرى محمد سعید ملاپیر، م، س،ص ٩٤.

٤٦- بڕوانە : لقاء السید ابراهیم زنگنه محافظ اربیل، (الحكم الذاتي – ئۆتۆنۆمی )، (مجلة)، اربیل، العدد(٥٦)،١٩٨٧، ص١٧.

٤٧- محمد شكرى محمد سعید ملاپیر، م، س،ص ٩٤.

٤٨- کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، س، پ، ل ٢٠٦.

٤٩- بڕوانە : العراق، العدد (١٦٩)، ١٩٧٦/٩/٧، ص٤.

٥٠- بڕوانە : الجمهوریة، العدد (٧١٤٨)، ١٣/نیسان/ ١٩٨٩، ص ٨ .

٥١- بڕوانـە : فريدون عبدالكريم عبدالله و محمد ابراهيم أحمد، تشخيص معوقات انتاج الـدواجن في العراق وتوقعات الطلب على لحوم الدواجن ولحوم الحمراء وبيض المائدة لغاية عـام ١٩٩٥، الابحـاث (مجلـة )، العـدد (٢،٣)، مطبعـة التعلـيم العـالي، (أربيـل: كـانون الثـاني ١٩٩٠ )، ص٣٣٦ .

٥٢- مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە،ب١، بەغدا، ١٩٩١، ل ١٧١.

٥٣- سـلێمان عەبـدوڵڵا، یـەکتر تـەواوکردنی کشـتوکاڵی – پیشەسـازی ، سـەنتەری برایـەتی " گۆڤار" هەولێر، ژ(٥)، ئایاری ١٩٩٩، ل ١٣٨.

٥٤- حلاو حسين كريم، الصـناعات الغذائيـة في محافضـة اربيـل – دراسـة في جغرافيـة الصـناعة، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الاداب جامعة صلاح الدين – اربيل، ٢٠٠١، ص٧٥-٨٣.

٥٥- کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ س.پ، ل ١٩٧.

٥٦- جابر پیرداود، پیشەسازییە دەستییەکانی هەولێر لە سییەکان و چلەکاندا، هـەولێر، ژ(٣)، هاوینی ١٩٩٩، ل ١٥٨.

٥٧- مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە،ب١، بەغدا، ١٩٩١، ل ١٧١.

٥٨- هـ . س، ل ١٧٥.

٥٩- پیرداود مەخموری، گەشتێك بە ناوی هەولێردا، ئینسکلۆپیدیای هـەولێر، بەشـی پێنچـەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی گرین گالۆری- لوبنان، ٢٠٠٩، ل٢٢٢٦.

٦٠- حلاو حسين كريم، المصدر السابق، ص**٧٥-٨٣.**

٦١- سەڵاحەدین حەفید، س.پ، ل ١٤٣ .

٦٢- نجم الدين عبدالله اسماعيل، بارودۆخی سیاسی شاری هـەولێر لـە نێـوان سـاڵانی (١٩٧٠- ١٩٧٩)- لێکۆڵینەوەیـەکی مێژووییـە، نامـەی ماسـتەر، " بڵاونـەکراوە"، پێشـکەش بـە زانکۆی سەلاحەددین کۆلێژی ئەدەبیات – بەشی مێژوو کراوە، ( هەولێر- ٢٠١٤)، ل ١٨.

٦٣- لیژەك ژیگیل، س.پ، ل ١٤٠ .

٦٤- ياسين رسول يونس، تحليل مسار الصـناعات التحويليـة في محافظـة أربيـل للمـدة (١٩٧٥- ٢٠٠٢)، أطروحة دكتورا مقدمة الى مجلس كليـة الادارة والاقتصـاد في جامعـة صـلاح الـدين – أربيل، ٢٠٠٥، ص ٢٠.

٦٥- عەبدولحەمید بەرزنجی، نیشانەکانی هێزی کارگـەر لـە پارێزگـای هـەولێر، هـەولێر ، ژ(٢)، بەهاری ١٩٩٩، ل ٦٧،٦٥،٥٩.

٦٦- یادگار خدر رشید، شیکردنەوەی جوگرافی دابەشبوونی پیشەسازی لە پارێزگـای هـەولێر، نامەی ماستەر " بڵاونەکراوە"، پێشـکەش بـە زانکـۆی سـەلاحەددین کۆلێـژی ئـەدەبیات – بەشی جوگرافیا کراوە، ( هەولێر- ٢٠١٤)، ل ١٣.

٦٧- ياسين رسول يونس، م.س، ل١١٤.

٦٨- کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، س،پ، ل ٢١٣ .

٦٩- یاسین رسول یونس، م.س، ص ١١٤.
٧٠- حلاو حسین کریم، المصدر السابق ، ص**٧٥-٨٣**.
٧١- هاوکاری، (ڕۆژنامە )، ژ (٢٨٤ )، ١٢-١٩ /٩ / ١٩٧٥، ل ٤ .
٧٢- (هاوکاری)، ژ(٢٨٤)، ١٢- ١٩/ ٩/١٩٧٥،ل ٤.
٧٣- فؤاد مراد حسین، دراسة اقتصادیة لبعض مصانع الألبان فی جمهوریة العراق، رسالة ماجستیر مقدمة الی مجلس کلیة الزراعة — جامعة عین شمس، بغداد — ١٩٨١، ص٣٠.
٧٤- (هاوکاری)، ژ(٢٨٤)، ١٢- ١٩/ ٩/١٩٧٥،ل ٤.
٧٥- محمد شکری محمد سعید ملاپیر، تجربة خصخصة القطاع الصناعي في محافظة اربیل للمدة ١٩٨٥-٢٠٠٥ (دراسة تحلیلیة )، رسالة ماجستیر "غیر المنشورة"، مقدمة الی مجلس کلیة الادارة والاقتصاد — جامعة صلاح الدین، (أربیل :٢٠٠٥)، ص ١٥٨.
٧٦- زکي حسین قادر، تقدیر دالة العمل الصوفي من أربیل وتقویمها، رسالة ماجستیر"غیر منشورة" مقدمة الی مجلس کلیة الادارة والاقتصاد — جامعة صلاح الدین، (أربیل :١٩٩٥)، ص ٧٩-٨١.
٧٧- حلاو حسین کریم، المصدر السابق، ص**٧٥-٨٣**.
٧٨- ساکار بهاالدین عبدالله، الانماط السکنیة في مدینة اربیل، رسالة ماجستیر" غیر المنشورة"، مقدمة الی مجلس کلیة اداب — جامعة صلاح الدین، (أربیل : ٢٠١١ )، ص١٥٣.
٧٩- کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، س.پ، ل ٢١٤.
٨٠- هەمان سەرچاوە، ل ٢١٩.
٨١- محمد شکری محمد سعید ملاپیر، م.س ١٥٨؛ کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، س.پ،، ل ١٨١ ؛ هاوڕێ یاسین محەمەد ئەمین، لێکۆڵینەوەیەك لە جوگرافیای هەرێمی کوردستان، چاپخانەی کارۆ، (سلێمانی : ٢٠١٣)، ل٢٧٥.
٨٢- ساکار بهاالدین **عبدالله**، م.س، ص١٥٣.
٨٣- هاوکاری، ژ (٢٨٤ )، ١٢-١٩ /٩ / ١٩٧٥، ل ٤ .
٨٤- دامەزراوە گەورەکان : ئەو پیشەسازییانە دەگرێتەوە کەوا بە ئامانجی تێرکردنی بازاڕ و بازرگانی ئەنجام دەدرێ، بە ڕێژەی (١٠ — ٢٩ ) کرێکاری تێدا بەکاردەهێنرێ، بڕوانە : یاسین رسول یونس، م. س ، ص ٢٠.
٨٥- دامەزراوە بچووکەکان : ئەو پیشەسازییانە دەگرێتەوە کە تەنها بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی تاکەکان لە بازاڕ ئەنجام دەدرێت بە ڕێژەیەکی کەمی کارکەر لە نێوان (١- ٩)، بڕوانە : ن . م، ص ٢١؛ جزا توفیق طالب، م . س، ص٢٨١.
٨٦- جەلال سنجاوی، س.پ، ل ٦٢ ؛ کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، س.پ، ل ٢٢٣.
٨٧- بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی پێکهاتە و توانای بەرهەم هێنانی چاپخانەکە بڕوانە : فەریق سلێمان ڕەمەزان، هەڵسەنگاندنی توانستی بەجێهێنانی چاپخانەی ڕۆشنبیری هەولێر

لـەماوەی نێـوان ( ٢٠٠٣-٢٠٠٨)، کۆلێـژی کـارگێڕی و ئـابووری - زانکـۆی سـەلاحەددین، ٢٠٠٩، ل١٧.

٨٨- خليل أسماعيل محمد، أربيل دراسات أقتصادية - ديمغرافية، ط١، مطبعة الثقافة، أربيـل، ٢٠٠٣، ص٩٠.

٨٩- کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ س.پ . ل ٢٠٢.

٩٠- بڕوانە : سميرة كاظم الشـماع، المنـاطق الصـناعية في العـراق، دار الرشـيد للنشـر، (بغـداد : ١٩٨٠ )، ص ٣٦٢- ٣٨٢ .

٩١- کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، س.پ، ل ٢٠٠ .

٩٢- یادگار خدر رشید،س.پ . ل ١٤.

٩٣- هاشم خضر الجنابي، مدينة أربيل دراسـة في جغرافيـة الحضـر، مديريـة دار الكتـب للطباعـة والنشر،(جامعة الموصل : ١٩٨٧)، ص٩١.

٩٤- أميد ابراهيم جوزەلی، الحياة العلمية في اربيل من القرن السادس حتى منتصف القرن السابع للهجرة، مطبعة رۆژهەلات،(أربيل :٢٠٠٨ )،ص ٣٥ ؛ خليل أسماعيل محمد، م .س، ص٢٠٢.

٩٥- عبـدالباقي عبـدالجبار أمـين الحيـدري، ألتجديـد الحضـري لقلعـة أربيـل، مطبعـة جامعـة الموصل،(الموصل :١٩٨٥)، ص٥٨.

٩٦- مراد حەکیم محەمەد، ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسەتی ڕاگواستنی کـورد لـە عێـراق لـە سەردەمی بەعسدا، بلاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینـەوەی سـتراتیجی کوردسـتان، سـلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٨٨.

٩٧- لیژەك ژیگیل، س.پ، ل ١٣٨.

٩٨- خليل أسماعيل محمد، أربيل دراسات ....، ص١٨٨.

٩٩- جـەلال سـنجاوی، هونـەری بیناسـازی و نـەخش و نیگـار لـە بـازاڕی قەیسـەری و قـەڵاتی هەولێر،" هەولێر"، ژ(١٦)،٢٠٠٢، ل٧٦-٧٧.

١٠٠- مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لە نێوان ساڵانی (١٩٢٦-١٩٣٩) چـاپخانەی حـاجی هاشـم، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٣٢.

١٠١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە، بەشی یەکەم، ل٧٦، ل ١٠٩.

١٠٢- هـ . س، ل ١٠٢.

١٠٣- لیژەك ژیگیل، س.پ، ل ١٤٨.

١٠٤- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە، بەشی یەکەم، ل ٧٦- ١٢٦.

١٠٥- نجم الدين عبدالله اسماعيل، س.پ، ل ٢٠.

١٠٦- لیژەك ژیگیل، س.پ، ل ١٣٨.

١٠٧- مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە،ب١،، ل ١٣٤.

١٠٨- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : برهان یارلی، أوراق من ملفات أربیل، مطبعة أرابخا، (كركوك :٢٠٠٩)، ص٢٤.

١٠٩- خلیل أسماعیل محمد، أربیل دراسات ...، ص١٨٨.

١١٠- سەلاحەددین حەفید س.پ، ل١٦٥.

١١١- هـ . س، ل ١٦٢ .

١١٢- دلێر شاوەیس، بارودۆخی ئابووری لە كوردستانی عێراق، سەنتەری برایەتی "گۆڤار"، ژ(٥)، ئایاری ١٩٩٩، ل ١٣٨.

١١٣- خالید هادی چاوشلی، گرنگی و سیمای گیروگرفتی گەشتوگوزار لە هەرێمی كوردستان و چۆنیەتی چارەسەركردنی، "سەنتەری برایەتی، ژ(٩) ، كانوونی یەكەم، ١٩٩٨، ل ١٥٨.

١١٤- هیوا تاڵەبانی، سیاسەتی ئابووری عێراق ١٩٦٨- ١٩٩٠، سیاسەتی دەولی ، ژ(٣)، ساڵی دووەم، تشرینی یەكەم، ١٩٩٣، ل ١٣.

١١٥- هاوكاری، ژ (٢٦٦)، ٩ - ١٦/ ٥/ ١٩٧٥، ل٤.

١١٦- سلێمان عەبدوڵلا ئیسماعیل، باران لە هەرێمی كوردستانی عێراقدا، سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی كوردستان - سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٣١.

١١٧- ئەم هاوینە هەوارە لەسەر چیای (پیرمام )ە، ١٠٩٠م لەسەر ئاستی دەریاوە بەرزە، بەرزترین پلەی گەرمای بە هاوین ٣٦ پلە بوو، ٣٢كم لەشاری هەولێرەوە دوورە، دوو میوانخانەی پلە یەكی تێدابووە كە ناویان ( سەڵاحەدین و پیرمام ) بووە، دواتر ناوەكەی كراوەتە مەسیف سەلاحەدین، هاوكاری ، ژ (٢٦٤)، ٢٥ /٤/١٩٧٥، ل٤.

١١٨- شەقلاوە : تەنیا ١٨ كم لە هاوینە هەواری سەڵاحەدین و ٥٠كم لە شاری هەولێرەوە دوورە، لەسەر چیای سەفینە و بەرزی لەسەر ڕووی دەریا ٩٦٦م و پلەی بەرزی گەرمای بە هاوین ٣٥ پلەیە و میوانخانەی بەناوبانگی ئەم هاوینە هەوارە میوانخانەی (خانزاد)ە و چەندین گازینۆی گەشتیاری خۆشی تێدا بووە، بڕوانە : یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی، مێژووی شاری هەولێر"لەكۆنەوە تا ساڵانی شەست"، لە بلاوكراوەكانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، (سلێمانی: ٢٠٠٢)، ل١٧٣.

١١٩- هاوكاری، ژ(٣٦٧)، ١١/٥/١٩٧٧، ل ٧ ؛ هاوكاری، ژ (٣٠٢)، ٣٠/ ١ / ١٩٧٦، ل٦؛ كاروان، (گۆڤار)، ژ(١٠)، تەموز ١٩٨٣، ل ١٤٢ .

١٢٠- ادریس سلیمان عبدالله، العوامل المؤثرة في تطویر السیاحة بمحافظة اربیل وتحلیلها، رسالة ماجستیر "غیر المنشورة"، مقدمة الی مجلس كلیة الادارة والاقتصاد - جامعة صلاح الدین، (أربیل :٢٠٠٥)، ص٨٤.

١٢١- هیوا ئەمین جەلال شوانی، شیكردنەوەی جوگرافی بۆ گەشەی شارنشینی لە پارێزگای هەولێر، نامەی ماستەر، زانكۆی سەلاحەددین، ٢٠٠٧، ل ١٢٠

١٢٢- هاوكاری، ژمارە (٢٧٥)، ١١- ١٨/ ٧ / ١٩٧٥، ل ٥.

١٢٣- هاوكاری ، ژماره (٢٧٤)، ٧– ١١/ ٧ / ١٩٧٥، ل ٨.

١٢٤- ياسمين حاجي صوفي، واقع القطاع السياحي وآفاق تطوره في اقليم كوردستان – العراق / أربيل حالة دراسية، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الادارة والاقتصاد – جامعة صلاح الدين، (أربيل :٢٠١٤)، ص ٩٠.

١٢٥- خليل اسماعيل محمد، أربيل دراسات ....، ص ٢٠٥ .

١٢٦- امير قادر عەزيز، هەڵسەنگاندنێكی جوگرافی بەكارهێنانەكانی زەوی لە شاری هەولێر بە بەكارهێنانی سیستەمی زانیارییە جوگرافیاییەكان GIS، نامەی ماستەر " بڵاونەكراوە"، پێشكەشی زانكۆی سەلاحەددین – كۆلێژی ئەدەبیات بەشی جوگرافیا كراوە. ل ٦٢.

١٢٧- ياسمين حاجي صوفي، م.س، ص ٩١.

١٢٨- فاتیح یاسین مودەریس، تەكیە و خانەقاكانی شاری هەولێر، ئینسكلۆپیدیای هەولێر، پ٥، چ١، چاپخانەی گرین گالۆری– لوبنان، ٢٠٠٩، ل ٢١٨٥.

١٢٩- امير قادر عەزيز، س.پ، ل ٦٢

١٣٠- ادريس سليمان عبدالله، م .س، ص١٠٥.

١٣١- نوری پەترۆس، عەنكاوە، ئینسكلۆپیدیای هەولێر، پ١، چ١، ل ٢٤٥.

١٣٢- ئەو ڕێڕەوەی كە بەرەو ڕەواندز دەچێت (٦٠)كم لە شەقڵاوە دوورە . بڕوانە: زوبێر بیلال ئیسماعیل، جوگرافیای پارێزگای هەولێر، ئینسكلۆپیدیای هەولێر، بەشی یەكەم، ل ٤٥.

١٣٣- خليل اسماعيل محمد، أربيل دراسات ....، ص ٢٠٥ .

١٣٤- جزا توفيق طالب، م. س، ص٣٤٢–٣٤٣.

١٣٥- خالید هادی چاوشلی، س.پ، ل ١٥٨.

## ملخص البحث

حاولت في هذا البحث أن ألم بالسمات العامة عن للحالة الاقتصادية لمدينة أربيل للفترة مابين (١٩٧٥–١٩٩١)، وبحثتُ فيه مؤثرات الأنشطة الزراعية وانعكاساتها التجارية مع بيان أهم الحرف والصناعات، إضافة إلى ابراز دور السياحة فيها، من خلال التعامل مـح حشد من الروايات والوقائع التأريخية.

يتكون البحث من مقدمة وثلاثة مباحث ونتائج توصل اليها الباحث خلال كتابة الموضوع. تناول المبحث الأول بإيجاز أهم مؤثرات الأنشطة الزراعية في تللك المدينة من خلال تسليط الأضواء على الحالة الاقتصادية مع الإشارة الصريحة إلى حالات المد والجزر في العمليات التجارية فيها، اضافة إلى ذكر الأسباب التي تساعد على توسيع الزراعة، والتركيز على نظام الري في المناطق التي تتبع هذا النظام. علاوة على اعطاء تصورٍ مقتضب عن الثروة الحيوانية التي تعتمد أطراف أو ضواحي أربيل على منتجاتها التي تدخل في ناتج الدخل القومي.

أما في المبحث الثاني فقد جرى تشخيص بعض المهن والحرف بدءاً بالصناعات الفردية وأخرى تدخل في حقل التجارة مع ذكر أنواع الصناعات التي اشتهرت بها المدينة المذكورة خلال تللك الحقبة التاريخية.

وقد خصص المبحث الأخير لكيفية تنشيط العملية التجارية والتعامل معها سلباً وإيجاباً، من خلال استيراد و تصدير السلع والمواد والبضائع التجارية من والى المدينة السالفة الذكر. هذا ماجرى تناوله في أحد محاور هذا المبحث، في حين تحدث المحور الأخر عن تراث وتأريخ الأماكن القديمة، مثل مراقد الرجال الصالحين، وسلط الضوء على بعض فنون المدينة، فضلاً عن التطرق إلى التراث الفولكلوري لقاطنيها والتركيز على بعض المناطق السياحية التي تقع في الرقعة الجغرافية لتوابع أربيل، التي تُجبى من ورائها أموال اقتصادية وفيرة، وتضمن توظيفها بشكل ايجابي، فستدر ربحاً وفيراً على مدخولات المدينة. توصل الباحث في نهاية البحث إلى جملة من الاستنتاجات يمكن الانتفاع منها، هذا وتضمن البحث ملخصاً باللغتين العربية والانكليزية مع ثبت بالمصادر والمراجع.

## Abstract

This topic is a historical research about economic situation of Erbil city during (1975- 1991 ). It consists a trying to doing a scientific methods on the agrarian activity , industrial situation and tourism affairs and their effects on the Erbil city.this research consists from an introduction and three chapters. The research is more focuses on the economic situation in Erbil city between 1975- 1991 and the helping reasons which had effectors on the increasing and decreasing that situation.

Therefore in the first chapter we will talk about the influence of the agrarian activity on the city.On that score , we will tried to point out the significance reasons which had impact on the doing agrarian activities in this area. In addition the agrarian activities in this area. In addition, the agricultural irrigation system, the water sources and the projects which had benefits, for that time were pointed out in the first chapter. Furthermore , the animal resource in the rural and the area which located around Erbil city and the benefits from this national resource to the residents were revealed.

In the second chapter we will discuss the second section of the economy , which the industry and artisan of the Erbil city during the historical era , also we will point out how and which type of industry was existing in the city.

The third chapter has been divided to two parts . At the first a brief mention of the trade situation and its importance for the Erbil city, also the exports and imports goods to the area , has been discussed. After that the tourism sector and the reasons which help to growth and developing of this sector will be point out. This was because of the existence of the archeological areas , the religious shrine and the folklore arts of the city and their impact in the economic situation for the Erbil city.

Finally we have got some results and point out with the abstract of the research in Arabic and English.

# مافی بەدەستهێنانی زانیاری
# لە هەرێمی کوردستان
## لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری

م. ی: مەجید ساڵح عەزیز

**پوختە:**

ئامانجی ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری و مێژووی سەرهەڵدانی و پراکتیزەکردنی ئەو یاسایە لە وڵاتانی دونیا و پرەنسیپە نێو دەوڵەتییەکانی، هەروەها لە رێگەی بەراوردکردنی هەردوو یاسای بەدەستهێنانی زانیاری لە هەرێمی کوردستان و تورکیا و رادەی رەچاوکردنیان بۆ پرەنسیپەکانی رێکخراوی ماددەی 19. بۆ ئەم توێژینەوەیە رێبازەکانی شیکاری-بەراوردکاری بەکارهاتووە و کەڵک لە کتێب و گۆڤار و راپۆرتی پەیوەندیدار وەرگیراوە بۆ هەڵێنجانی کۆمەڵێک دەرئەنجام. لە ئەنجامی بەراوردکارییی نێوان هەر نۆ پرەنسیپەکانی رێکخراوی ماددەی 19 بۆ مافی بەدەستهێنانی زانیاری، یاساکەی هەرێمی کوردستان توانیویەتی هەشت پرەنسیپی جێبەجێ بکات و لە چاو یاساکەی تورکیاشدا یاسایەکی پێشکەوتووترە.

**وشە کلیلییەکان:**

رێکخراوی ماددەی 19، یاسای مافی دەسکەوتنی زانیاری لە هەرێمی کوردستان – عێراق، یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە تورکیا، ئاوارتە، شەفافیەت.

- **پێشەکی:**

ئەوەی مرۆڤەکانی ئەمڕۆ لەوانەی دوێنێ و سبەینێ و دووسبەی جیا دەکاتەوە ئاستی هەستکردنیان بەدەوروبەر و رادەی زانینیانە بەو رووداوانەی دەگوزەرێت، لەم سەردەمەدا زانیارییەکان وەک کاڵا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت و یاساکانی بازاڕیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت. دامودەزگاکانی حکومەت و بوارە گشتییەکان بەردەوام زانیاری بەرهەم دێنن و کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکەن، زۆرجاریش بە هۆی

گرنگییانەوە دەدزرێن یان بەمەبەست دەشاردرێنەوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە "هەموو کەسێک هەر لە مامۆستا و پزیشک و ئەندازیار و رۆژنامەنووس و سەرباز و سیاسیەتمەدار، بگرە تا دەگاتە هاولاتییەکی سادە، لە بواری کارەکانیاندا پێویستییان بە زانیاری هەیە، هەر لە بەر ئەوەیە ئەم سەردەمە پێی دەوترێت سەردەمی زانیارییەکان و کۆمەڵگای نوێش بە کۆمەڵگای زانیاری ناوزەد کراوە"[(١)].

لە هەرێمی کوردستانیشدا کە ئێستا بە قۆناغی گوزەر بەرەو دیموکراسیدا تێپەڕدەکات، تادێت خواست لە سەر زانیاری فراوانتر دەبێت و کاردەکرێت بۆ ئەوەی زانیارییەکان لە حەشارگە و شوێنە نهێنییەکانەوە دەربهێنرێت و بخرێنە بەر دیدی هەمووان، کۆمەڵێک هۆکار لە پشت ئەو خواستەوەیە، سەرەکیترینیان ئەوەیە نوخبەی" دەستەبژێری" رووناکبیر و هەندێ لە سیاسەتمەدارانی کوردستان گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی هەرگیز کوردستان بە بێ بوونی هاولاتییەک کە زانیاریی راست و دروستی لە لابێ، ناتوانێ شەفافیەت پەیڕەو بکات و کار بۆ بنبڕ کردنی گەندەڵی بکات؛ چونکە لە ژینگەیەکی کراوە و پڕ لە زانیاریدا هاولاتیان دەتوانن بۆچوونەکانی خۆیان بە شێوەیەکی واقعییانە لە سەر مەسەلە جیاجیاکان گەلاڵە بکەن. بە پێچەوانەوە لە ژینگە داخراو و تاریکەکاندا بێ متمانەیی بە سەر پەیوەندییەکاندا زاڵ دەبێت و بڕیارەکانیش لە سەر بناغەیەکی نادروست دەدرێن.

ئەم تویژینەوەیە دەیەوێت لە دوو بەشدا ئەوە روون بکاتەوە مافی بەدەستهێنانی زانیاری چییە و چ رۆڵێکی هەیە لە پێشخستنی کۆمەڵگاکان و سەقامگیر کردنی ژیانی دیموکراسی و ئەو یاسایەی لە هەرێمی کوردستاندا هەیە بە بەراورد لەگەڵ یاسای مافی دەست راگەیشتن بە زانیارییەکانی تورکیا تا چ رادەیەک رەچاوی پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی رێکخراوی ماددەی 19 کردووە.

### رێبازی توێژینەوەکە:

بۆ گەیشتن بەو مەبەستانەی کە توێژینەوەکەی لە پێناودا ئەنجامدراوە، پشت بە رێبازی وەسف و شیکاری بەراوردکاری دەبەسترێت،

### ئامانجی توێژینەوەکە:

بریتییە لە خستنەڕووی چەمکی مافی بەدەستهێنانی زانیارییەکان و ئەو پرەنسیپە یاسایانەی کە ئەم مافەی لە سەر دامەزراوە، لە رێگەی بەراوردکردن لە نێوان یاسای (مافی دەسکەوتنی زانیاری لە هەرێمی کوردستان- عێراق، ژمارە (١١)

ساڵی ٢٠١٣) و یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاریی تورکیا رادەی ئازادی و بەربەستەکانی هەردوو یاساکە دیاری دەکات.

## گرنگیی توێژینەوەکە:

گرنگیی ئەم توێژینەوە لەوەدایە باس لە یەکێک لە گرنگترین مافەکانی مرۆڤ دەکات کە لە ئێستادا بووەتە خواستێکی سەرەکیی رێکخراوەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ و شەفافیەت و دەسەڵاتی باش.

## گریمانەکانی توێژینەوەکە:

ئەم توێژینەوەیە لە سەر بناغەی دوو گریمانەی سەرەکی دانراوە:

یەکەم: یاسای (مافی دەسکەوتنی زانیاری لە هەرێمی کوردستان- عێراق، ژمارە (١١) ساڵی ٢٠١٣) نەیتوانیوە رەچاوی پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری بکات کە لە لایەن رێکخراوی ماددەی 19 دانراوە.

دووەم: بەپێی ئەزموون و دووروردرێژیی تەمەنی حوکمڕانی لە تورکیا، یاساکەی تورکیا پێشکەوتووترە لە یاساکەی هەرێم.

# بەشی یەکەم

# بنەما تیۆرییەکانی مافی بەدەستهێنانی زانیاری

## ١-١: چەمکی مافی بەدەستهێنانی زانیاری:

"ماف" چەمکێکی بەرفراوانە و لە زۆر بەشی جیاجیادا بەکاردێت، بەڵام "مافی زانین" یەکێکە لە گرنگترین خواستەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن و پێدانی ئەو زانیارییانەی لە دامودەزگاکانی حکومەت پارێزراوە رۆڵێکی گەورە دەگێرێت لە پرۆسەی شەفافیەت و کرانەوە بەرووی هاوڵاتیاندا.

"جیمز مادیسون" چوارەم سەرۆکی ئەمەریکا لە ساڵی 1822 یەکەم کەس بوو باسی لە مافی زانین کرد، ئەو یەکێک بوو لە رابەرە سیاسییەکانی ئەمەریکا، لەو بارەوە وتوویەتی:

"حکومەتێک کە خەڵک هەڵیبژاردبێت، گەر ئەو زانیارییانە کە پەیوەندییان بە بەرژەوەندی و کاروبارەکانی ژیانی خەڵکەوە هەیە ئاشکرا نەکات، ئەوە سەرەتایەکە بۆ شانۆگەرییەکی گاڵتەجاڕی یان شانۆگەرییەکی تراژیدی یان هەردووکیانە پێکەوە. هەردەم زانین بەسەر نەزانیندا سەردەکەوێت، ئەو گەلەی کە دەیەوێت خۆی خۆی بەڕێوە ببات، دەبێ خۆی بە هێزی زانین پڕ چەک بکات"[٢].

ئەگەرچی ئەم وتەیەی مادیسون زیاتر لە دوو سەد ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، بەڵام تا دێت زیاتر راستییەکانی ئاشکرا دەبن. چونکە زانین هێزێکی کاریگەرە بە دەست گەلانەوە و ئەو گەلەی نەزان بێت، رێگە بۆ دەسەڵاتدارانی ناوخۆیی و تەنانەت داگیرکەرانیش خۆش دەکات چۆنیان بوێت بەڕێوەی ببەن و بڕیار و چارەنووسی بەدەستی خۆی نابێ.

سەرەتاییترین بنەما لە هەر وڵاتێکی دیموکراتدا ئەوەیە کە هاوڵاتیانی بتوانن لە پاڵ پەرلەماندا چاودێرین بەسەر رەفتارەکانی حکومەت و کاربەدەستانی وڵاتەوە، بەڵام ئەو چاودێرییە لە خۆڕا ناکرێت. مەرجی ئەو کارە دەستڕاگەیشتنی ئازادانەی هاوڵاتیانە بە زانیارییەکان.

مافی بەدەستهێنانی زانیاری بریتییە لە:

"دەستڕاگەیشتنی هاوڵاتیان بەو زانیارییانەی کە لە دامودەزگا گشتییەکان و هەندێ لە دامودەزگا تایبەتییەکان پارێزراوە و تایبەتن بەو چالاکییانەی ستراکتۆری حکومەت لەناوخۆ و دەرەوە ئەنجامی دەدا "[٣].

لە چارەکی یەکەمی کۆتایی سەدەی رابردووەوە لەو ولاَتانەی کە دیموکراتییان کردووەتە بنەمای دەسەلاَتدارێتی، ئەم مافە وەک مافێکی رەوای سەرەکی هاولاَتیان دانیپێدانراوە و لە زۆربەی دەستوور و بەڵگەنامەکانیاندا گرەنتی پێدانی زانیاری بە هاولاَتیان دراوە.

بونیادی مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە سەر ئەو گریمانەیە بونیادنراوە کە: "دەوڵەت نەک خاوەن، بەڵکو ئەمانەتداری زانیارییەکانە"[٤]. بەو مانایە کە لە کۆمەڵگا دیموکراتەکاندا هاولاَتیان متمانەیان بە حکومەتی خۆیان هەیە بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندیی گشتی و بەرژەوەندیی ئەواندا زانیارییەکان کۆکاتەوە و پۆلێنیان بکات.

### ١-٢ : کورتە مێژوویەکی یاساکانی مافی بەدەستهێنانی زانیاری:

تاوەکو ساڵی 1990، تەنها (13) ولاَت یاسای مافی دەستڕاگەیشتن بە زانیارییان هەبوو، بەلاَم ئێستا زیاتر لە (95) ولاَت کە ژمارەی دانیشتوانیان زیاتر لە پێنج ملیار کەسە یاسای تایبەتییان هەیە بۆ دەستڕاگەیشتنی هاولاَتیان بەو زانیارییانەی کە لای حکومەت و دامەزراوە گشتییەکاندا پارێزراوە.[٥]

لە دەستووری ژمارەیەک لە ولاَتاندا ئازادیی زانیاری و مافی دەستڕاگەیشتن بە زانیارییەکان بە فەرمی دانی پێدانراوە، ئەم مافە یان بەشێوەیەکی راشکاو و ئاشکرا لە دەستوورەکاندا رەچاوکراوە، یاخود هەندێجار لە راڤەی دادگای باڵای دەستووری ولاَتەکاندا بۆ ناوەڕۆکی بەندەکانی دەستوور ئەو مافە بەرەسمی دانی پێدا نراوە.

بۆ یەکەمجار پەرلەمانی شانشینی سوید لە ساڵی 1766دا "یاسای مافی دەستڕاگەیشتن بە زانیاری" دەرکرد [٦]، ئەم یاسایە دامودەزگاکانی دەوڵەت ناچار دەکات داواکاری ئەو هاولاَتیانەی کە داوای زانیاری دەکەن جێبەجێ بکات. لە ئێستادا یاسای ئازادیی زانیارییەکان بەشێکی گرنگی دەستووری سوید پێکدەهێنێت، بەپێی ماددەی (1) ئەو یاسایە "هەموو هاولاَتییەکی سویدی دەتوانێت دەستی بە زانیارییەکانی دامودەزگاکانی حکومەت بگات".[٧] لە یاساکەدا رێکارەکانی وەرگرتنی زانیاری شێوازی وەلاَمدانەوە و پەنابردن بۆ دادگاکان و ئەو زانیارییانەی کە رێگە بە بلاَوکردنەوەیان نادرێت، دیاری کراوە.

دوای سوید، کۆلۆمبیا دووەم ولاَتە کە لە ساڵی 1888 یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە لایەن پەرلەمانەوە دەرکراوە و دەستڕاگەیشتن بە بەڵگەنامە و زانیارییە دەوڵەتییەکانی بە مافێکی رەوای هاولاَتیانی خۆی زانیوە. ئەم یاسایە

دوای دوو ساڵ لە پەسندکردنی دەستووری لیبرالیی کۆلۆمبیا دێت. بەپێی یاساکە هەموو هاوڵاتییەک دەتوانێ لە رێگەی داخوازییەکەوە بەڵگەنامە دەوڵەتییەکانی دەست کەوێت، تەنها لەو کاتانەدا نەبێت کە بە یاسا ئەو مەسەلەیە سنووردار کرابێت. ئەو یاسایە تا ئێستاش کاری پێدەکرێت.

دوابەدوای کۆلۆمبیا فنلەندا سێیەم وڵاتە کە لە ساڵی 1951 ئەو یاسایەی دەرکرد، [٨] یاساکەی فنلەندا لە ژێر کاریگەریی یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاریی سویدایە؛ چونکە لە رووی مێژوو و کلتوورییەوە هاوبەشی هەیە لە نێوان هەردوو وڵاتدا.

ئەگەرچی مێژووی ئازادیی رادەربڕین لە ئەمەریکا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دامەزراندنی ئەو وڵاتە، بەڵام حەقیقەت ئەوەیە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چوارەم وڵاتە کە ئەو مافەی لە ساڵی 1966 بە هاوڵاتیانی خۆی بەخشی.

لە ساڵانی رابردوودا چەند وڵاتێکی ئاسیایی یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیارییان دەرکردووە. فیلیپین لە ساڵی 1987 بەپێی یاسای "پێوەرەکانی ئاکارو رەفتاری فەرمانبەران و بەرپرسانی دەوڵەت" مافی بەدەستهێنانی زانیاری بە فەرمی دەرکرد. لە ساڵی 1995 هۆنگ کۆنگ یاسایەکی هاوچەشنی دەرکرد و کۆریای باشوور و تایلەندیش لە ساڵی 1997 ئەو یاسایەیان خستە بواری پراکتیکییەوە. لە ساڵی 1999 ژاپۆن یاساکەی دەرکرد و دەرگا لە بەردەم وڵاتانی دیکەدا کرایەوە بۆ ئەوەی بچنە ریزی یانەی ئەو وڵاتانەی کە خاوەنی یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیارین. ئوزبەکستان 1997 پاکستان 2002، بەنگلادیش 2008، ئازربایجان 2005، تاجیکستان 2002، تورکیا 2003، ئەفغانستان لە ساڵی2014 یاسایەکی تایبەت بە پێدانی زانیاری دەرکرد. [٩]

لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تا ساڵی 2007 ئیسرائیل تاکە وڵات بوو کە خاوەنی یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری بوو، بەڵام لە ساڵی 2009 پەرلەمانی شانشینی ئوردون وەک دووەم وڵاتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست یاسایەکی هاوشێوەی دەرکرد، دوابەدوای ئەویش لە ساڵی 2012 یەمەن بوو بە سێیەم وڵاتی خاوەن یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە ناوچەکەدا. پەرلەمانی هەرێمی کوردستانیش لە ساڵی 2013 چوارەمین یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری دەرکرد لە ناوچەکە. [١٠]

لە وڵاتانی ئۆروپای رۆژهەڵاتدا وەک بەشێک لە پرۆسەی گوزەر بەرەو دیموکراسی، یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیارییان قەبوڵ کردووە. زۆرێک لەو وڵاتانە

وەک جێبەجێکردنـی مەرجەکـانی چـوونە نـاو پەیمـانی نـاتۆ و یەکێتـی ئۆروپـا ئەو یاسایانەیان دەرکردووە.

ولاّتـانی وەک لیتوانیـا 1996. ئەلبانیـا 1999، بوسـنە و هرزەگـوڤین 2000، بولگاریـا 2000. ئەسـتونیا 2000 رۆمانیـا 2001، گورجسـتان، سـربیا 2003، سلۆڤاکیا 2002، کرواتیا 2003، کۆسـۆفۆ 2003 روسـیا 2009، مەجەرسـتان 2011، ئۆکراین 2011، لە ناوەڕاستی نەوەدەکانەوە ئەو یاسایەیان دەرکردووە و هەندێ ولاّتی دیکەش پرۆژە یاسایان ئامادە کردووە بۆ دەنگدان لە سەری.[١١]

بەم جـۆرە دەکرێـت بلّێـین جیهـان ئەمـڕۆ بەرەو بەرقەرارکردنـی یاسـای مـافی بەدەسـتهێنانی زانیـاری هەنگـاو دەنێـت کە بەشـێوەیەکی تەقلیـدی لە بـن دەسـتی حکومەتدایە، بەلاّم دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین مەرج نیـیە بـوونی ئەو یاسـایە ببێـتە هۆی بەرخورداری هاولاّتیـان بە زانیـاری، چـونکە لە هەنـدێ ولاّتـدا هێشـتا کلتـووری شـاردنەوەی زانیـاری لە نـاو دەسـەلاّتداراندا زاڵە و بەرپرسـان سـەرپێچی دەکەن لە پێدانی زانیاری و گەر ئەوەشیان پێنەکرا لە رێگەی دەسـتی دەسـتی کـردن و دانـانی خەرجیـی زۆر و نامـاقووڵەوە خۆیـان لە پێـدانی زانیـاری دەدزنەوە. لەوەش زیـاتر چـۆنیەتی راڤەکردنـی دادوەرەکـان بـۆ مادەکـانی یاسـاکان، پراکتیزەکردنیـان پەک دەخەن، لە هەندێ ولاّتیشدا ئەو ناوەنـدەی کە سەرپەرشـتی جێبەجێکردنـی یاسـاکان دەکات دەکەونە ژێر گوشار و هەڕەشەی بەرپرسە بالاّکانەوە و کارێک دەکەن بـوون و نەبوونی یاساکان وەکو یەک وابێت.

## بەشی دووەم:
# مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە هەرێمی کوردستان

بەپێی سیستمی سیاسی و ئیداریی وڵاتان، یاسای مافی پێدانی زانیاری لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە دەگۆڕێت، لە وڵاتە کراوەکاندا ئەو مافە بە تەواوەتی دابین کراوە. وەک سوید و کەنەدا، بەڵام لەو وڵاتانەی کە لە گوزەری دیموکراسیدان، بە ترسەوە مامەڵەی لە گەڵدا کراوە. وەک یەمەن و ئوردون.

هەرچەندە لە سەرەتاکانی دامەزراندنی پەرلەمانی کوردستاندا ئەولەویەت بۆ ئەو یاسایانە بوو کە زیاتر مۆرکی سیاسی پێوە دیار بوو، بەڵام لە پاڵ ئەوانەشدا خەڵکانێک هەبوون داوای ڕێکخستنی یاسایانەی ژیانی جڤاکیان دەکرد، بە تایبەت ڕێکخراو و سەندیکا پیشەییەکان هەر زۆر زوو دوای دامەزراندنیان کەوتنە ئامادەکردنی پرۆژە یاسای تایبەت بۆ ڕێکخستنی کاروباری سەندیکاکانیان.

بەڵام بە هۆی ئەوەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان زۆر درەنگ دامەزرا. هەروەها ئەو یاسایانەی کە تایبەت بوون بە ئازادیی رادەربڕین و بڵاوکردنەوە و وەرگرتنی زانیاری لە لایەن هیچ ڕێکخراو و کۆمەڵە و سەندیکایەکەوە تەبەنی نەکرا، بۆیە سەرەڕای گرنگیی ئەو جۆرە تەشریعاتانە کەچی لە ماوەی 1991 -1998 باس لەو مەسەلانە نەکراوە، هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ و سەرقاڵی پەرلەمانی کوردستان و دواتر لە کارکەوتنی بۆ ماوەیەک هۆکارێکی دیکەی نەهاتنە ئارای ئەو مەسەلەیە بوو.

### ١-١: ئەو یاسایانەی هەرێمی کوردستان کە تێدا ئاماژە کراوە بۆ مافی بەدەستهێنانی زانیاری:

#### یەکەم: یاسای ژمارە (4)ی ساڵی 1998 یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانی عێراق هەموارکراو:

لە یاساکانی هەرێمی کوردستاندا زۆر بە کەمی و بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ ئاماژە کراوە بۆ مافی بەدەستهێنانی زانیاری. بە تایبەتی ناچارکردن بە بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان لە لایەن دامودەزگا گشتییەکانەوە. بۆ یەکەمجار بە شێوەیەکی

راستەوخۆ باسی لە مافی بەدەستهێنانی زانیاری کردبێت یاسای ژمارە (4)ی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە کە پەرلەمانی کوردستان لە ساڵی 1998 دەریکرد. لە مادەی چوارەمدا کە تایبەتە بەو ئامانجانەی کە سەندیکای لە پێناودا دامەزراوە، دوای حەوت برگە کە هەر هەمووی ئامانجی سیاسین و بۆ رێکخراوێکی سیاسی دەشێن، لە برگەی (8) بە خێرایی ئامانجێکی پیشەیی بۆ سەندیکای رۆژنامەنووسان دانراوە: ((ئاسانکاری ئەرکی رۆژنامەنووسان بۆ بەدەستهێنانی هەواڵ و زانیارییەکان.))

دەرکردنی ئەو یاسایە پەلە پەلەیەکی زۆری پێوەدیارە، هۆکارەکەی ئەوەیە رۆژنامەنووسانی هەولێر و دهۆک لە ساڵی 1998سەندیکایەکیان دامەزراند بە ناوی (سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان)[١٢] رۆژنامەنووسانی دەڤەری سلێمانی و گەرمیان بێ ئاگا بوون لێی، هەر بۆیە لە دانیشتنی ژمارە (49)ی 5\10\2004 پەرلەمانی کوردستاندا دوای (یەکگرتنەوەی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان) و (یەکێتی رۆژنامەنووسانی کوردستان) لە سەر داوای رۆژنامەنووسان و پەرلەمانتارانی خولی دووەمی پەرلەمان، یاساکە هەموارکرایەوە و گۆڕانکارییەکی زۆر لە مادە و برگەکانیدا کرا، یەکێک لەو مادانەی کە هەموار کرایەوە مادەی (4) بوو کە تایبەتە بە ئامانجەکان. لە هەموارەکەدا ئامانجە پیشەییەکانی سەندیکا کران بە دوو برگە و خرانە پێش ئامانجە سیاسییەکان کە دیسانەوە ژمارەیان (9) ئامانجە، لەو دوو برگەیەدا روونتر باس لە ئازادیی رادەربڕین و مافی وەرگرتنی زانیاری کراوە، دەقەکانی ئەو دوو برگەیە بریتین لە:

((١. رێزگرتن و داکۆکی لە ئازادیی رۆژنامەوانی و ئازادیی رادەربڕین، هەروەها داکۆکی لە مافی رۆژنامەوانان و زامنکردنی پاراستنیان لە بەجێهێنانی ئەرک و فەرمانیاندا.

٢. ئەرکی دەستکەوتنی دەنگوباس و زانیارییەکانیان بۆ ئاسان بکا.))

بەم جۆرە بۆ یەکەم جار لە مێژووی تەشریعاتی کوردستاندا بەشێوەیەکی راستەوخۆ باس لە ئازادیی رادەربڕین و وەرگرتنی زانیاری کراوە، بەڵام وەک ئامانج بۆ سەندیکایەکی رۆژنامەوانی، نەک وەک مافێکی سروشتی و یاسایی هاوڵاتیان و ناچارکردنی حکومەت بە پێدانی ئەو زانیارییانەی لایەتی بە رۆژنامەنووسان و هاوڵاتیان.

**دووەم: یاسای ژمارە (35)ی ساڵی 2007 یاسای رۆژنامەگەری لە هەرێمی کوردستان :**

لە یاسای ژمارە (35)ی ساڵی 2007 (یاسای رێکخستنی کاری رۆژنامەنووسی لە هەرێمی کوردستاندا) بۆ جاری دووەم، بەڵام بە شێوەیەکی روونتر ئاماژە بە مافی رۆژنامەنووسان بۆ دەستڕاگەیشتنیان بە هەواڵ و زانیاری کراوە؛

لە ماددەی دووەم بڕگەی دووەمدا هاتووە:

"رۆژنامەگەر بۆی هەیە ئەو زانیارییانە وەربگرێت کە گرنگ بن بۆ هاووڵاتیان و پەیوەندیدارن بە بەرژەوەندیی گشتی لە سەرچاوەی جیاواز، ئەگەر پەیوەندی بە ئاسایشی هەرێمەوە نەبێت".

ئەوەی لەو دوو یاسایەی پێشوودا تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکدا باسیان لە مافی بەدەستهێنانی زانیاری کردووە و تەنها رۆژنامەنووسانیان بۆ ئەو مافە دەستنیشان کردووە، لە کاتێکدا بەپێی پرەنسیپ و بنەما نێو دەوڵەتی و هەرێمییەکان، نەک هەر رۆژنامەنووس ئەو مافەی هەیە، بەڵکو هەموو کەسێکی یاسایی و مەعنەوی دەبێ لەو مافە بەرخوردار بێت.

**سێیەم: یاسای ژمارە (11)ی ساڵی 2013 یاسای مافی دەسکەوتنی زانیاری لە هەرێمی کوردستان ـ عێراق:**

لە هەرێمی کوردستاندا سەرەڕای گرنگیی مافی وەرگرتنی زانیاری، بەڵام تاوەکو ساڵی 2013 هیچ یاسایەک بەشێوەیەکی سەربەخۆ و روون و ئاشکرا ئەم گرفتەی چارەسەر نەکردبوو.[١٣]

لە دانیشتنی ژمارە (28)ی رۆژی 2013/6/5 لەسەر داوای ژمارەیەک پەرلەمانتاری کوردستان بە حوکمی بڕگەی (1) لە ماددەی (56)ی یاسای ژمارە (1)ی ساڵی 1992ی هەموارکراو پەرلەمانی کوردستان (یاسای مافی دەسکەوتنی زانیاری لە هەرێمی کوردستان- عێراق) پەسند کرد. یاساکە لە (22) مادە کە بە سەر پێنج بەشدا دابەشکراوە پێکهاتووە.

(سەنتەری یاسا و دیموکراتی) و (یەکێتی نێودەوڵەتی رۆژنامەنووسان) لە بەیاننامەیەکی تایبەتدا کە لە سەر یاساکەی کوردستان دەریان کردووە گەیشتوونەتە ئەو دەرئەنجامەی کە یاساکەی کوردستان توانیویەتی 98 خاڵ لە کۆی گشتی 150 خاڵ بەدەست بهێنێت و لە 95 وڵاتدا کە ئەم یاسایەیان هەیە پلەی 82 هەمین بەدەستبهێنێت.[١٤]

## ١-٢: سوودەکانی بوونی یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە هەرێمی کوردستان:

بوونی یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە لایەن هاوڵاتیان کۆمەڵێک سوود و دەسکەوتی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە گرنگترینیان بریتین لە:

١. بەپێی ئەو پرەنسیپەی کە "ماف" یەکەیەکی گشتگیرە و بەش بەش ناکرێت، بۆیە دەکرێت بڵێین "مافی بەدەستهێنانی زانیاری جگە لەوەی بۆ خۆی مافێکە؛ لە هەمان کاتدا میکانیزمێکە بۆ دەسکەوتنی مافەکانی دیکە. ئەرکی دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەوەیە مافی بەدەستهێنانی زانیاری بەپێی برگە و مادەکانی ئەم یاسایە بۆ هاوڵاتیانی خۆی دەستەبەر بکات، ئەو مافەش کاریگەری لە سەر ژیانیان دادەنێت، چونکە رێگەیان بۆ خۆش دەکات زانیاریی بابەتیانەیان لە سەر هەموو مافەکانی دیکەیان هەبێت"(١٥).

٢. بۆ ئەوەی هاوڵاتیان بە قەناعەت و لە رووی هۆشیارییەوە بەشداریی پرۆسەی سیاسیی وڵات بکەن، دەبێ خاوەنی زانیاری بن، هەر بۆیە دەبێ حکومەت ژینگەیەکی وا دروست بکات کە هاوڵاتیان ئاگاداری سیاسەت و کارو چالاکییەکانی ئەوان بن و سنووری ماف و بەرژەوەندییەکانی خۆیان بزانن. بۆیە بوونی ئەم یاسایە دەبێتە هۆی فراوانبوونی بەشداریی هاوڵاتیان لە دروستکردنی بڕیار لە هەموو ئاستەکاندا.

٣. کاتێک هاوڵاتیی ئاسایی لە هۆکارەکانی بڕیارەکانی حکومەت ئاگادار بێت و بزانێت ئەو بڕیارە لە بەرژەوەندیی گشتیدایە، نەک کەس یان لایەنێکی دیاریکراو، بێگومان دەبێتە چاودێرێکی باش بەسەر کاروکردەوەی بەرپرسە هەڵبژێراوەکانی خۆیان، ئەمەش وادەکات مەترسییەکانی برەوێتەوە و متمانەی بە حکومەت زیاتر بێ. هەر لەبەر ئەوەیە دەبینین لە کۆمەڵگا دیموکراتەکاندا بە هۆی مافی دەستکەوتنی زانیارییەوە ئاستی چاودێریی هاوڵاتیان بەرزە، بە پێچەوانەی ئەوانیش لە کۆمەڵگا نادیموکراتەکاندا چاودێریی هاوڵاتیان بەسەر ئەدائی حکومەتەوە هەر نییە، بۆیە دەسەڵات هەردەم جێگەی گومانی هاوڵاتیانە و کاربەدەستانیش متمانەیان لە دەستداوە.

٤. ئازادیی ئاڵوگۆڕی زانیارییەکان دەبێتە هۆی فراوانبوونی شەفافیەت لە چالاکییە ئابووری و سیاسییەکانی دەوڵەت، لە راستیدا "ئازادیی زانیاری بەتەنها بۆ خەڵک گرنگ نییە، بەڵکو بۆ دەوڵەتیش گرنگ و حاشا هەڵنەگرە، دەوڵەتی گەندەڵ

بۆ مانەوە پێویستی بە شاردنەوەیە، شاردنەوەش دەبێتە هۆی ناکارایی و سەرەڕۆیی و بێ متمانەیی"[١٦].

٥. هەروەها ئازادیی ئاڵوگۆڕی زانیارییەکان دەبێتە هۆی "پتەوبوونی ئازادیی کاری ڕۆژنامەوانی و بەهێزبوونی دەسەڵاتی چوارەم و زیاترکردنی توانای گوشارەکانی و کارئاسانی دەکات بۆ ڕۆژنامەنووسان تاوەکو ڕاستییەکان دەرخەن[١٧]"، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لە لایەن حزبە سیاسییەکان و بەرپرسانی باڵا.

٦. دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پڕوپاگەندە و واتەوات، کە بەداخەوە ئەم دیاردەیە بووەتە مۆرانە و بەردەوام کار لە سەر بێ متمانەکردنی دامودەزگاکانی حکومەت دەکات لای خەڵک.

٧. هەڵە و کەموکوڕییەکان ئاشکرا دەکات بەر لە ڕوودانی دەگرێت و ڕێگە بۆ ڕەخنە و دیبەیتی پۆزەتیڤ خۆش دەکات و کارئاسانی بۆ لێپرسینەوە دەکات.

## بەشی سێیەم:

# یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە هەرێمی کوردستان لە روانگەی پرەنسیپەکانی رێکخراوی ماددەی19[١٨]

مافی بەدەستهێنانی زانیاری لەسەر کۆمەڵێک پرەنسیپی یاسایی وەستاوە کە لەلایەن رێکخراوی ماددەی 19 دانراوە. لە ئێستادا ئەو پرەنسیپانە بوونەتە بنەما بۆ دەرکردنی هەر یاسایەکی تایبەت بەو مافە لە سەر ئاستی دونیادا. ئەم بنەمایانە لە کۆبوونەوەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە ساڵی 2000 پەسند کراوە. لەم بەشەدا بەراورد دەکەین لە نێوان یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە هەرێمی کوردستان و تورکیا و رادەی رەچاوکردنیان بۆ ئەو پرەنسیپانەی کە "رێکخراوی ماددەی 19". دایناون

**پرەنسیپی یەکەم: ئاشکراکردنی ئەوپەڕی رێژەی زانیاری:**

"دەبێ یاساکانی ئازادیی زانیاری پشت بە پرەنسیپی ئاشکراکردنی تەواوی زانیارییەکان ببەستێت"

بەپێی ئەم بنەمایە (دەبێ هەموو ئەو زانیارییانەی کە لەلای دامودەزگاکانی دەوڵەت پارێزراوە بخرێتەڕوو)، لۆژیکی راستەقینەی چەمکی ئازادیی زانیارییەکان لەو کاتەدا جێبەجێ دەبێ کە هیچ کۆت و بەندێک لە بەردەم وەرگرتنی قەبارەی ئەو زانیارییانەدا نەمێنێ، بە مانایەکی دیکە دەبێ لە کاتی دانانی یاسا و دەستووری وڵاتدا مافی دەستڕاگەیشتن بە زانیاری بکرێتە مافێکی سەرەکیی هاوڵاتیان و گرەنتی جێبەجێکردنیشی بدات.

لە یاساکەی هەرێمی کوردستاندا لە ماددەی چوارەم و بڕگەی دووەم لە ماددەی دەیەمدا ئەم پرەنسیپەی جێبەجێکردووە. لە ماددەی چوارەمی یاساکەدا کە تایبەتە بە (مافی تێڕوانین و دەسکەوتنی زانیاری) ئەم پرەنسیپە بەم شێوەیە جێبەجێکراوە:

((هەموو کەسێک چی سروشتی بێت یان مەعنەوی مافی ئاگاداربوون و بەدەستهێنانی زانیاری و چەند دانەیەک لەو دۆکیۆمێنتانەی هەیە کە لە دامودەزگاکان داوای دەکات بەدەر لەو زانیارییانەی کە بەگوێرەی ماددەی (14) ئەم یاسایە ریسپەڕ کراوە.))

هەروەها لە بڕگەی دووەمی ماددەی نۆیەمدا بەشێوەیەکی وردتر دامودەزگاکانی راسپاردووە ئەم جۆرە داواکارییانە جێبەجێبکەن کە تێدا هاتووە:

( (دووەم: پێویستە لەسەر دامودەزگای گشتی یان تایبەتی ئەم داواکارییانەی لە خوارەوەدا دێن لەکاتی داواکردنیان جێبەجێ بکات:

١. وێنەیەکی رەسەنی دۆکیومێنتەکە بەو شێوەیەی لە لای دامەزراوەکە پەیڕەوکراوە.

٢. مافی لێوردبوونەوە لە دۆکیومێنتەکە لە کاتی پێویستدا بە بەکارهێنانی ئەو ئامرازانەی کەوا دامەزراوی پەیوەندار هەیەتی.

٣. مافی لەبەرگرتنەوەی دۆکیومێنتەکە بە بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەی کەوا کەسەکە هەیەتی.

٤. دانەیەکی دەقاودەقی دۆکیومێنتەکە، چاپکراو بێت یان تۆمارکراو، بینراو بێت یان بیستراو، ئەگەر توانرا ئەم دانەیە بە بەکارهێنانی ئامێرە بەردەستەکانی دامەزراوی پەیوەندار ئەنجام بدرێت.

٥. ئامادەکردنی دانەیەکی راست و دروست لە دۆکیومێنتە رەسەنەکە، بەشێوەیەکی کورت یان هەر پۆلێنێکی تری شێوازەکانی دۆکیومێنتەکە.))

لە ماددەی پێنجەمی یاساکەی تورکیاشدا کە تایبەتە بە (پابەندبوون بە خستنە بەردەستی زانیارییەکان) جێبەجێکردنی ئەم پرەنسیپە بەم شێوەیە هاتووە:

( (دامودەزگاکان بەرپرسن لە گرتنەبەری رێوشوێنی تەکنیکی و ئیداری بۆ پێدانی هەرجۆرە زانیاری و بەڵگەنامەیەک کە لەم یاسایەدا هاتووە بە کەسی داواکار؛ و لە داواکارییەکان بکۆڵێتەوە و بۆ ئەوەی بە شێوەی گونجاو و راست و رەوان بیانخاتە بەر دەست.))

بەدەر لەو ماددەیەش لە ماددەی دەیەمدا یاسادانەری تورکی جۆری زانیارییەکانی دیاری کردووە کە دەبێ بدرێن بە داواکار: ( (ماددەی 10 — رێکخراوەکان کۆپییەکی جێی متمانە دۆکیومێنتی پێویست بە داواکار دەدەن. لەو جێیەی زانیاری یان دۆکیومێنت بۆ کۆپیکردن گونجاو نەبێت یان لەوانەیە زیان بە نوسخەی ئەسڵی بگەیەنێت، رێکخراو ئامێرە پێویستەکان بۆ داواکار ئامادە دەکات؛

ا) تاقیکردنەوەی دۆکیومێنتی ئەسڵی و یاداشتکردن بۆ ئەو دۆکیومێنتانەی کە بڵاو دەبنەوە یان دەنووسرێن،

ب) گوێگرتن بە بابەتەکە کە لە شێوەی تۆمارکراوی دەنگییە،

ج) بینینی ئەو بابەتەی کە بە شێوەی تۆمارکراوی وێنەییە.))

لە بەراوردکردنی هەردوو یاساکەدا بۆمان دەردەکەوێت هەردوو یاساکە جەخت لەسەر هەموو جۆرەکانی ئەو دۆکیومێنتانە دەکەنەوە کە پێویستە بدرێت بە داواکارەکان، ئەوەی یاساکەی هەرێم لەوەی تورکیا جیادەکاتەوە ئەوەیە وردتر و بەدرێژی رێکارەکانی چۆنێتی پێدانی دۆکیومێنتەکەی لە یاساکەدا شیکردووەتەوە و هیچ کەلێنێکی بۆ ئەو فەرمانبەرەی کە بەرپرسە لە پێدانی زانیاری بەجێ نەهێشتووە تاوەکو بیکاتە بیانوو بۆ پێنەدانی زانیاری، بەڵام لە یاساکەی تورکیادا ئەوە بە کورتی بڕێنراوەتەوە، لە پراکتیزەکردندا گرفت بۆ فەرمانبەری پێدانی زانیاری دروست دەکات.

**پرەنسیپی دووەم: ناچارکردن بەبڵاوکردنەوە:**

"پێویستە دامودەزگا گشتییەکان ناچار بکرێن بە بڵاوکردنەوەی زانیارییە سەرەکییەکان"

بۆ ئەوەی ئازادیی زانیاری بەشێوەیەکی تەواو پراکتیزە بکرێت، پێویست دەکات دامودەزگا گشتییەکان تەنها بەوەوە نەوەستن کە لە سەر خواست زانیاری بدەن بە هاوڵاتیان، بەڵکو دەبێ کەڵک لە تەکنەلۆژیای زانیاری وەرگرن و بەشێوەی بەردەوام داتا و زانیارییەکانی خۆیان لە ماس میدیاکاندا بڵاوبکەنەوە، گەر هەر زانیارییەکیش بڵاونەکرایەوە، پێویستە بەڵگەی یاسایی حاشا هەڵنەگری بۆ بهێنرێتەوە، بۆیە بەپێی ئەم بنەمایە دەبێ یاساکانی مافی بەدەستهێنانی زانیارییەکان لە هەموو وڵاتەکاندا دامودەزگا حکومییەکان ناچار بکات بە بڵاوکردنەوەی هەموو زانیارییە بەردەستەکان و نوێکردنەوەیان بە بەردەوامی.

لە یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری لە هەرێمی کوردستان لە رێگەی ماددەی شەشەمدا ئەو پرەنسیپەی بەم شێوەیە پەیڕەو کردووە:

((یەکەم: هەموو دامودەزگایەکی گشتی ساڵانە دەبێ دەلیلێک دەربکات یان لەسەر سایتی ئەلیکترۆنی خۆی یان بە راپۆرتێک کە ئەم زانیارییانەی تێدا بێت بڵاو بکاتەوە بەردەوام ئاپدێدی بکات:

١. پەیکەرەکەی، ناونیشان و ماڵپەڕە ئەلکترۆنییەکەی، رێگاکانی پەیوەندیکردن پێوەی. رێکارەکانی بەدەستهێنانی زانیاری، ئەرکەکانی، بڕیارەکانی، رێوشوێنەکانی دامەزراندن، بەرپرسەکانی و ناونیشانە وەزیفەکانیان.

٢. بوجە و تەرخانکراوەکانی، حسابە کۆتاییەکەی.

٣. پــرۆژە جێبەجێکراوەکــانی، ئەو پــرۆژانەی لە بــاری جێبەجێکردنــدان، ئەو پرۆژانەی بڕیارە بێنە جێبەجێکردن.

٤. ئەو خزمەتگوزارییانەی پێشکەشی دەکات ڕێگای بەدەستهێنانیان.

٥. ئەو سـکاڵانەی پێشـکەش کـراون و ئەو ڕێوشـوێنانەی لە بارەیـانەوە وەری گرتوون.))

بەڵام لە یاساکەی تورکیادا ئەو مەسـەلەیە لە مـاددەی هەشـتەمدا بەم شـێوەیە چارەسەرکراوە:

(( ئەو زانیاری و بەڵگانەی کە بۆ هەمووان بڵاو و ئاشکرا دەکرێن ئەو زانیاری و بەڵگانەی کە لە ڕێگەی بڵاوکردنەوە، بروشور، بەیاننامە یان لە ڕێگەی دیـکەوە بـۆ جەماوەر بڵاو و ئاشکرا دەکرێن نابێ وەک بـابەتی داواکردنـی زانیـاری بێـنە ژمـاردن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا مێـژوو، کەرەسـتە و شـوێنی بڵاوکـردنەوەی زانیـارییەکە یـان بەڵگەکە دەدرێت بە داواکار.))

لە بەراوردکردنی هەردوو یاساکەدا دەردەکەوێت یاسـاکەی هەرێمـی کوردسـتان وردەکاریی زیاتری تێـدایە و جـۆری زانیارییەکـانی دیـاریکردووە، بە هەمـان شـێوە لە یاساکەی تورکیادا باس لە هەندێ زانیاری کراوە کە لە شێوەی، بروشور، بەیاننـامەدا بـڵاو دەکـرێنەوە، بەڵام یاسـاکەی هەرێـم ئەم مەسـەلەیەی زیـاتر ڕوونکـردووەتەوە و کێشەکانی لەبەردەم جێبەجێکاری یاسا و داواکاری یاسا ئاسانتر کردووەو هیچ جـۆرە لێکدانەوەیەکی لابەلای نەهێشتووەتەوە.

## پرەنسیپی سێیەم: بەهێزکردنی حکومەتی کراوە:

"پێویستە دامودەزگا گشتییەکان چالاکانە بانگەشە بۆ حکومەتی کراوە بکەن"

یەکێکی دیکە لە بنەما سەرەکییەکانی حکومەتی دیموکرات بـریتییە لە بـرەودان بە کرانەوەی هەموو دامودەزگاکان بەڕووی میدیا و هاوڵاتیاندا، بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرتی سـاڵانەی کـار و چالاکییەکـان و سـزادانی ئەوانەی دەبـنە هـۆی پێنەدانـی زانیـاری و شاردنەوە یان فەوتاندنی ئەو بەڵگەنامانەی پەیوەندیدارن بە ژیانی خەڵکەوە.

لە ماددەی دووەمی یاساکەی کوردستان کە تایبەتە بە ئامانجەکان هاتووە:

( (یەکەم: تواناداركردن و ئاسانكاریكردن بـۆ هاوڵاتیـانی هەرێـم کە پراکتیـزەی مـافی خۆیـان بـۆ بەدەسـتهێنانی زانیـاری بـکەن کە لەلایەن دامودەزگـای گشـتی و تایبەتەکانەدا هەیە بە گوێرەی حوکمەکانی ئەم یاسایە.

دووەم: پشــتگیریکردنی پرەنســیپەکانی شــەفافیەت و بەشــداریی کــارا بــۆ چەسپاندنی پرۆسەی دیموکراتی.

ســێیەم: دابینکردنــی کەشــێکی لەبــارتر بــۆ ئــازادیی رادەربــڕین و پەخــش و بڵاوکردنەوە.))

لەو ئامانجەی کە یاساکەی تورکیای بۆ دەرکراوە هاتووە:

((ماددەی یەکەم: ئامانج لەم یاسایە بریتییە لە رێکخستن و دانانی رێوشوێن بۆ مافی بەدەستهێنانی زانیاری بەپێی پرەنسیپەکانی یەکسانی و نەزاهەت و کرانەوە کە لە پێداویستییەکانی حکومەتێکی دیموکرات و شەفافە.

لە هەردوو یاساکەدا بەوردی ئەو پرەنسیپە رەچاو کراوە و دەرکردنی یاساکە خۆی لەخۆیدا هەنگاوێکی گرنگە لەو پێناوەدا.

**پرەنسیپی چوارەم: سنووردارکردنی پەراوێزی ئاوارتەکان**[(١٩)]:

"دەبێ هەر ئاوارتەیەک کە دادەنرێت بۆ مافی بەدەستهێنانی زانیاری روون و ئاشکراو بەرتەسک بێت و بە پێوەری "زیان" و "بەرژەوەندیی گشتی" تاقی بکرێتەوە"

ئەو ماددەیەی کە تەرخان دەکرێت بۆ ئاوارتەکان مەترسیدارترین بەشی یاساکانی مافی بەدەستهێنانی زانیارین لە هەموو وڵاتێک. لە راستیشدا هەموو یاساکانی مافی بەدەستهێنانی زانیاری لیستی ئەو زانیارییانەیان تێدایە کە بە هۆکاری جیاجیا ناکرێت بخرێنە بەردەستی هەموو کەسێکەوە، بەڵام هەموو پێوەرە نێودەوڵەتییەکان جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە کە نابێ لیستی ئاوارتەکان دوورودرێژ بێت، یان دەستەواژەکان راڤەکردن و لێکدانەوەی جیاجیاهەڵگرن.

هەروەها بۆ هەر ئاوارتەیەک دەبێ دوو مەرجی سەرەکی هەبێت:

"یەکەم بڵاوکردنەوەیان زیانێکی گەورە و کاریگەر لە بەرژەوەندیی گشتی بدات. دووەم بیسەلمێنێت زیانەکانی بڵاوکردنەوەی ئەو زانیارییە لە سەر بەرژەوەندیی گشتی زۆر زیاترە لە بڵاوکردنەوەیان"[(٢٠)].

لە یاساکەی هەرێمی کوردستان لە ماددەی چوارەمدا (بەدەرەکان- ئاوارتەکان) بەسەر شەش تەوەردا دابەش کراوە، بەڵام لە یاساکەی تورکیادا ئاوارتەکان لە بەشی چوارەمدا و بە شەش ماددەی جیا لە یەک دیاری کراون، بە ماددەی 15 دەست پێدەکات و بە ماددەی 20 کۆتایی پێدێت. بەڵام ئەوەی زیاتر هەستیان پێدەکرێت بریتین لە چوار تەوەر کە لە بنەڕەتدا لە جاڕنامەی مافی مرۆڤیش گرنگییان پێدراوە:

یەکەم: ئەو ئاوارتـانەی تـایبەتن بە پەرێـزی تـایبەتی کەسـەکان: لە زۆربەی وڵاتاندا مەسەلەی پەرێزی تایبەتی کەسەکان بە دوو شێوە پارێزراوە، "یەکەم لە یاسا گشتییەکاندا دووەم لە یاسا تایبەتییەکاندا کە تەنها بۆ ئەو مەبەستە دەردەکرێن"[(٢١)].

بەپێی مـاددەی 12 جاڕنـامەی گەردوونـی مافەکـانی مـرۆڤیش ئەم پەرێـزە پاراسـتنی ئەرکە کاتێک دەڵێ: "نابێت دەست لە ژیانی کەس یان خێزانـی یـان مـاڵی یـان نامـە تایبەتییەکانی وەربدرێت، یـان باسـی ئـابڕووی بکرێـت و بـەدناو بکرێـت، هەرکەسـەی مافی ئەوەی هەیە بە شـێوەیەکی یاسـایی خـۆی بپارێزێـت لـەم دەسـتێوەردان و نـاو زڕاندنە".

پێشـێلکارییەکان بەرامـبەر بە پەرێـزی تـایبەتی کەسـەکان لە سـێ جـێگەوە هەڕەشـەی لەسـەرە، یەکەم تەکنەلۆژیـا دووەم دەوڵەت سـێیەم کەرتـی تـایبەت، لە بەندی پێنجەم لە بڕگەی دووەمـی مـاددەی چـوارەمی یاسـاکەی کوردسـتاندا پەرێـزی کەسەکان بەم شێوەیە چارەسەرکراوە:

((دامودەزگا گشتی یان تایبەتی  مافی هەیە لەم حاڵەتانەی خوارەوە داواکاری ڕەت بکاتەوە:

5 . زانیاری و دۆسییەکانی تۆماری تـایبەتیی خوێنـدن یـاخود پزیشـکی یـاخود وەزیفـی یـاخود حیسـاباتی بـانکی یـاخود نهێنییەکـانی پیشـەی تـاکەکەس بەبـێ ڕەزامەنـدیی خـۆی، هەروەهـا هەمـوو ئەوانەی کە پەیوەنـدییان بە سـەلامەتی و تەندروستیی هاوڵاتیان و مەترسی خستنە سەر ژیانیانەوە هەیە.))

بەڵام لە یاسـاکەی تورکیـادا لە مـاددەی 19 و لە هەنـاوی ئەو بـڕگەیەی کە تەرخـان کـراوە بـۆ مەسـەلە ئیـدارییەکان بە بڕگەیەکـی کـورت بەم شـێوەیە پەرێـزی کەسەکان پارێزراوە:

الف. بە شێوەیەکی ڕوون ماف و سنووری تایبەتی تاکەکان پێشێل بکات

بـۆیە دەکرێـت بڵێـین لە مەسـەلەی پاراسـتنی پەرێـزی تـایبەتیی کەسـەکاندا یاساکەی هەرێم ڕوونتر و ڕاشکاوانەتر ئەو مەسەلەیەی چارەسەر کردووە.

دووەم: ئەو ئاوارتانەی تایبەتن بە ئاسایشی نەتەوەیی و نهێنییە سەربازییەکان: هیچ وڵاتێک نییە لە ژێر هەر بیانوویەکدا ڕازی بێت نهێنییە سـەربازی و ئەمنییەکـانی ئاشکرا بن تەنانەت لە بڕگەی  سێیەمی مـادەی (19)ی پەیماننـامەی نێـو دەوڵەتیـی تـایبەت بە مـافی مەدەنـی و سیاسـییەکانی سـاڵی 1966 دەستڕاگەیشـتن بە مـافە مەدەنی و سیاسییەکان بە دوو خاڵ مەرجدار دەکات و دەڵێ: "ا. ڕێزگرتن لە مـاف و

ناوبانگی کەسانی دیکە. ب. بۆ پاراستنی ئاسایشی نیشتمانی یان سیستمی گشتی یان تەندروستی و داب و نەریتی گشتی"[٢٢]

لە یاساکەی هەرێمدا لە بەندی یەکەمی بڕگەی دووەمی ماددەی چوارەمدا هاتووە:

((1. نهێنیی تایبەت بەرگری و ئاسایشی هەرێم (وردەکاری چەک و پێداویستییە سەربازییەکان، ئەرکی نهێنییە سەربازی و ئاسایشییەکان، جووڵە و تەکتیکی بەرگری و زانیاریی هەواڵگری.))

بۆ هەمان مەبەست، بەڵام لە مەسەلەی جیادا بڕگەی دیکە تەرخان کراوە، وەک مەسەلەی دانوساندنەکانی هەرێم، کاتێک دەڵێ:

((2. ئەو زانیارییانەی کەوا ئاشکراکردنیان دەبێتە هۆی کارتێکردن لەسەر رێڕەوی ئەو دانوستانەکانی کەوا هەرێم لەگەڵ هەر لایەنێکی تر دەیکات، یان لەسەر گۆڕینەوەی زانیارییەکان ئەگەر هەردوولا لەسەر نهێنیبوونی رێککەوتن تاوەکو بڵاوکردنەوەی.))

لە یاساکەی تورکیاشدا لە ماددەکانی 16-17-18-19 مەسەلەی ئاسایشی نەتەوەیی گرنگیی زیاتری پێدراوەو لەگەڵ مەسەلە ئیداری و ئابووری و ئەمنییەکاندا پێکەوە گرێدراون:

((ماددەی 16: ئەو زانیاری و بەڵگەنامانەی کە تایبەتن بە نهێنییەکانی دەوڵەت.

ماددەی 17 : ئەو زانیاری و بەڵگەنامانەی کە لە بەرژەوەندیی ئابووریی دەوڵەتدایە.

ماددەی 18: ئەو زانیاری و بەڵگەنامانەی کە دەچنە ریزی نهێنییەکانی دەوڵەتەوە.

مادە 19 : ئەو زانیاری و بەڵگەنامانەی کە زانیاری پەیوەندیداریان بە لێکۆڵینەوە و پشکنینی ئیدارییەوە هەیە و ئەو زانیاری و بەڵگەنامانەی تایبەتن بە لێکۆڵینەوە و پشکنینی ئیداری))

سێیەم: ئەو ئاوارتانەی کە تایبەتن بە مەسەلەی دادگاکان: لە یاساکەی هەرێمی کوردستاندا لە بەندی سێیەمی بڕگەی دووەمدا زۆر بە کورتی ئەم مەسەلەیە باسی لێوەکراوە و تێدا هاتووە:

(( 3. ئەو زانیارییـــانەی کە ئاشـــکراکردنیان کـــاریگەری دەبێـــت لەســـەر بەڕێوەچوونی لێکۆڵینەوەکان و دادگاییکردندا.))

بەڵام لە یاساکەی تورکیادا ئەم کێشەیە کە پەیوەندیدارە بە هەموو هاوڵاتیانەوە گرنگیی زیاتری پێدراوە و جگە لە دوو ماددە، چەند بڕگەیەکیشی بۆ تەرخان کراوە و بەشـی زۆریشـی لە بەرژەوەنـدیی گشـتیدایە. مـاددەی پـازدە و بیسـتەم بە روونـی وردەکاری ئەم مەسەلەیەی خستووەتە روو:

ماددەی 15: ئەو بابەتانەی کە تایبەتن بە لێکۆڵینەوەی دادگاکان.

مـاددەی 20: ئەو زانیـاری و بەڵگەنامـانەی کە پەیوەندیـدارن بە لێکـۆڵینەوە و پشکنین یان بەدواداچوونی دادوەری.

ئەو زانیاری و بەڵگەنامانەی کە ئاشکراکردنیان:

الف. ببێتە هۆی تاوان.

ب. ببێتە هۆی رووشاندنی و رێگری لە لێکۆڵینەوەی تاوانێک یان ببێتە رێگر لە بەردەم جێبەجێکردنـی رەوتـی دەسـتگیرکردن و بەدواداچـوونی تاوانبـاران بخـاتە مەترسییەوە.

ج . ببێتە رێگر لە بەردەم بڕیارەکانی دادگا،

د. ببێتە هۆی تێکدانی مافی دادگاییکردنێکی دادپەروەرانە لە تۆمەتبارێک

تەوەری چوارەم: مەسەلە پەیوەندیـدارەکان بە موڵکـایەتیی فیکـری و داهێنـان. هەرچەندە پەرلەمانی کوردسـتان لە سـاڵی 2012 یاسـای ژمـارە (17)ی تـایبەت بە مـافی دانەر و مـافە هاوسـێکانی دەرکـرد، بەڵام دیسـانەوە لە یاسـاکەی هەرێمـی کوردستاندا گرنگی بەم مەسەلەیە دراوە و لە بڕگەی چوارەمدا هاتووە:

(( 4 . ئەو زانیارییانەی کەوا ئاشکراکردنیان دەبێتە هۆی پێشێلکردنی کێبڕکێی رەوا یان مافەکانی دانەر و خاوەندارێتی هزری.))

بەڵام لە یاساکەی تورکیا ئەم مەسـەلەیە باسـی لێـوە نەکـراوە و هۆکارەکەشـی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە تورکیادا یاسای تایبەت بەم مەسـەلەیە هەیە و پێویسـت بە دووبارە کردنەوەی ناکات[٢٣].

خـاڵی هاوبەشـی هەردوو یاسـاکە لەوەدایە گرنگیـی پێویسـت بە مەسـەلەکانی ئاسایشی نەتەوەیـی و سـەربازییەکان دراوە، بەڵام لەوەی تورکیـادا وەک دەوڵەتێکـی مەرکەزیی تۆکمە مامەڵە لەگەڵ نهێنییە سەربازی و ئیداری و دەوڵەتییەکانـدا کـراوە، هەرچەنـدە هەم بـۆ تورکیـا و هەمـیش بـۆ هەرێـم ئاسـاییە، چـونکە لە سـەرەتای

هەنگاونانـدان بەرەو دیموکراسـی، بەڵام لە هەمانکاتـدا جەختکـردنەوە لە سـەر ئەو پرسانە بەم رادەیە رێگرییە لە بەردەم حکومەتی کراوەدا.

"تونی میندل" لە بەرێوەبەری سەنتەری یاسا و دیموکراسی و "مونیر زعرور" لە رێکخراوی یەکێتی رۆژنامەنووسانی نیودەوڵەتی لە هەڵسـەنگاندنێکی هاوبەشـیاندا بـۆ یاساکەی کوردستان پێیان وایە ئاوارتەکانی یاسـاکە "پشـکنین و تاقیکردنەوەیـان بـۆ نەکراوە کە ئاخۆ پێدانیان زیانی لێدەکەوێتەوە"(٢٤).

## پرەنسیپی پێنجەم: ئاسانکردنی بەدەستهێنانی زانیارییەکان:

"دەبێ مامەڵەی داواکردنی زانیاری بە خێرایـی و دادپەروەرانە ئەنجـام بـدرێت و دەبی پێداچوونەوەیەکی بێلایەنانە بکرێت بۆ حاڵەتی رەتکردنەوە"

پرۆسەی داواکردنی زانیاری پرۆسەیەکی ئـاڵۆزە هەر لەبەر ئەوەیە لە یاسـاکانی مـافی بەدەسـتهێنانی زانیاریـدا گرنگییەکـی تـایبەتی پـێ دەدرێـت و بەشـێکی زۆری یاساکەشی بۆ تەرخان دەکرێت، "بۆیە واباشە دامودەزگاکانی حکومەت فەرمـانبەرێکی تایبەتمەند بۆ پێدانی زانیارییەکان تەرخان بکات، هەروەها دەبێ لە یاساکەدا شێوازی داواکـارییەکە دیـاری بکرێـت، بە تـایبەتی دەبـێ ئەوە بخـرێتەڕوو کە داواکـارییەکە بە نووسین بێت، بەڵام بەمەبەستی دەستڕاگەیشتنی زیاتری هاوڵاتیان بە زانیاریی باشـتر وایە شێوازی دیکە بۆ داواکردن دیاری بکرێت. هەروەها دەبێ هاوکاریی داواکار بکرێت بۆ ئەوەی لە وەسفی زانیارییەکەدا وردتـر بێـت و دوابەدوای پرۆسـەکەش باشـتر وایە وەسڵی پێشکەشکردنی داواکارییەکەی پێبدرێت"(٢٥).

لە بــڕگەی یەکەم تــا چــوارەمی مــاددەی حەوتەمــی یاســاکەی کوردســتاندا رێکارەکانی داواکردنی زانیاری بەم شێوەیە دەستنیشان کراوە:

ماددەی حەوتەم (رێکارەکانی داواکاری زانیاری)

یەکەم: پێویستە لە سەر هەر دامودەزگایەکی گشتی یان تایبەتی فەرمانبەرێکی تایبەتمەند یان زیاتر بۆ وەرگرتنی داواکارییەکانی زانیاریی دەستنیشان بکات.

دووەم: "دامودەزگای گشتی یان تایبەتی بۆی هەیە فۆرمێکی داواکاریی زانیـاری ئامادە بکات وردەکاری روون دەربارەی ناوەڕۆکی زانیارییە داواکـارییە داواکراوەکـان و ناوی پێشکەشکاری داواکارییەکە و ئامرازی پەیوەنـدی پێـوەکردنی لە خـۆ بگرێـت بە مەرجێک بارگرانی نەبێت بەسەر پێشکەشکارەکانی، و دانانی فۆرمەکە لەسەر پـێگەی ئەلیکترۆنیی خۆی.

سێیەم: داواکردنی زانیارییەکان بە نووسراوی دەبێت تەنها لە حاڵەتی بوونی پاساو نەبێت لەو کاتەدا دەکرێت بە زارەکی بێت.

چوارەم: پێویستە لە سەر دامودەزگای گشتی یان تایبەتی دەستبەجێ لەگەڵ وەرگرتنی داواکارییەکە تۆماری بکات چ رەزامەند بێت لە سەری یان رەت بکرێتەوە، تۆمارنەکردن بە رەتکردنەوەیەکی نایاسایی داواکارییەکە ئەژمار دەکرێت.

ماددەی شەشەمی یاساکەی تورکیا شێوازی داواکردنی زانیاری بەم شێوەیە خستووەتەڕوو:

( (داوای دەستڕاگەیشتن بە زانیارییەکان لە رێگەی فۆرمێکەوە دەبێت کە ناوی سیانی و ئادرەسی شوێنی کار یان ماڵی داواکار و ئیمزاکەی لەسەر بێت؛ کاتێک داواکار کۆمپانیایەک بێت، ئادرەسی کۆمپانیاکەی وئادرەس و ئیمزای رێگەپێدراوی کۆمپانیاکە و تەوکیل نامەی کۆمپانیاکەی بدات بەو دامەزراوەی داوای زانیاری لێدەکات. ئەگەر ناسنامە و ئیمزای داواکار بە شێوەیەکی یاسایی بخرێتەڕوو، دەکرێت داواکارییەکە بە شێوەی ئەلکترۆنی یان رێگاکانی دیکەی پەیوەندیکردنەوە ئەنجام بدرێت.

ئەو زانیاری و دیکۆمێنتانەی داوا دەکرێن دەبێت لە فۆرمەکەدا دەستنیشان بکرێن.))

لەو بڕگانەی تەرخانکراون بۆ ئەو پرەنسیپە، دەردەکەوێت لە یاساکەی کوردستاندا هەرچەندە لە ماددەی چوارەمدا باسی لەوە کردووە کە "هەموو کەسێک چ "سروشتی" بێت یان "مەعنەوی" مافی دەسکەوتنی زانیاری هەیە، بەڵام لە رێکارەکانی داواکردنی زانیاریدا ئەوە روون نییە کە ئاخۆ (بریکاری یاسایی) بۆی هەیە لە بری کەسە (مەعنەوی)یەکاندا داوای زانیاری بکات، کە ئەمە لە یاساکەی تورکیادا لە ماددەی شەشەمدا بە روونی دیاریکراوە، ئەوەش بە خاڵێکی پۆزەتیڤ بۆ یاساکەی تورکیا دەژمێررێت.

بەڵام خاڵی پۆزەتیڤ لە یاساکەی کوردستاندا سەبارەت بە دەستڕاگەیشتن بە زانیارییەکان لە بڕگەی دووەمی ماددەی هەشتەمدا کە داواکار دەتوانێت لە حاڵەتی ئامادەبوونی زانیارییەکە راستەوخۆ لە رێگەی "تەلەفۆن و پۆستی ئەلیکترۆنی یان بە زارەکی" دەستی کەوێت. ئەمە لە یاساکەی تورکیادا بەو کراوەیە نییە.

بڕگەی سێیەمی مادەی حەوتەمی یاساکەی هەرێمدا بەوەی کە دەکرێت لە پاڵ داواکاریی نووسراو داواکارییەکان بە زارەکیش بێت، خاڵێکی پۆزەتیڤە بۆ یاساکەی

کوردستان، کە ئەمە لە یاساکەی تورکیادا نییە، بەڵام یاساکەی تورکیا رێگەی خۆش کردووە بۆ ئەوەی لە رێگەی ئەلیکترۆنی و رێگەی دیکەوە پێشکەش بە دامودەزگاکان بکرێت، ئەمەش لەگەڵ رۆحی سەردەمدا دەگونجێ، بەڵام لە یاساکەی کوردستاندا رێگای ئەلیکترۆنی و دیکە لەبەرچاو نەگیراوە.

لە یاساکەی کوردستاندا دانانی فۆرمی داواکارییەکە خراوەتە ئەستۆی دامودەزگا گشتی و تایبەتییەکان، ئەمەش وادەکات کە ئەو دامودەزگایانە بە ئارەزووی خۆیان جۆری فۆرمەکە دیاری بکەن، بۆیە دەبوایە فۆرمێکی موەحەد هەبێت کە هەموو دەزگاکان پەیرەوی لێبکەن.

**پرەنسیپی شەشەم: *خەرجییەکان:***

نابێ لە رێگەی دانانی خەرجیی زۆرەوە، رێگری بکرێت لەوەی هاوڵاتیان داوای وەرگرتنی زانیاری بکەن.

هەر وڵاتەو بە شێوەیەک خەرجییەکانی دەستراگەیشتن بە زانیارییەکانی لە یاساکانی مافی وەرگرتنی زانیارییەکاندا دیاری کردووە، باشترین پێوەریش ئەوەیە کە ئەو خەرجییانە نەبنە بەربەست لە بەردەم وەرگرتنی زانیاری. لە هەندێ حاڵەتدا خەرجییەکانی هەندێ زانیاری جێگیر و نەگۆڕە، بەڵام زانیاریی وا هەیە پێویست دەکات لە پێناوی ئامادەکردنیدا کۆمەڵێک ئامێرو دەزگای تەکنەلۆژی بەکار بهێنرێت کە پێویستی بە خەرجی هەیە. لەم حاڵەتەدا دەبێ داواکار لەو خەرجییانە ئاگادار بکرێتەوە یان بەشی زۆری ئەو خەرجییانە بکەوێتە سەر حکومەت بە تایبەتی گەر بڵاوکردنەوەی ئەو زانیارییانە لە بەرژەوەندیی گشتیدا بێت.

لە ماددەی پازدەیەمی یاساکەی کوردستان تێچوونی دەسکەوتنی زانیاری لە لایەن داواکارەوە بەم جۆرە دیاری کردووە: ((پێشکەشکاری داواکاری تێچووەکانی دەسکەوتنی زانیاری داواکراو لە ئەستۆ دەگرێت))، بەڵام یاساکەی تورکیا تێچوونی دەسکەوتنی زانیارییەکانی خستووەتە ئەستۆی ئەو دەزگایەی کە زانیارییەکەی لایە و لە برگەی (ج) ماددەی دەیەمدا هاتووە: ((لە بودجەی ئەو دەزگایە خەرجییەکانی پێدانی زانیارییەکان دابین دەکرێت)).

تێبینی دەکرێ لەم بڕگەیەی یاساکەی کوردستاندا تێچوونی یاساکەی خستووەتە ئەستۆی داواکار، هەروەها باس لەوەش نەکراوە کە دەبێ بڕی تێچوونەکە بۆ داواکار باس بکرێت، ئەوەش خەوشێکی بەرچاوە لە یاساکەی کوردستاندا، چونکە

